# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿٢﴾

بەرگی دووەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی دووەم .
بەرگی دووەم .
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

هەزاران سوپاس و چاکەی زۆر بۆ پەروەدگاری خاوەنی بوونەواران ، درودی بێ پایان بۆسەر گیانی پێشەوامان پێغەمبەر و هاوەڵانی .

لەشەوی چوونی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ میعراج نوێژ پێویست کرا لەسەر موسوڵمانان لەمەککە بەر لەکۆچی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەساڵ و نیوێ ، هەتا لەمەککە بوون ڕوویان دەکردە کەعبە کاتێ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە فەرمانی پێدرا ڕووبکات بۆ (بيت المقدس) بۆ دڵنەوایی کردنی جولەکەکان کەزۆربەی زۆریان لەمەدینەو ئەم لاولای مەدینە دانیشتبوون ، وەزۆربەی کاروباری دانیشتووان بەوان هەڵئەسوڕا ، هەروا بەو جۆرە مانەوە . بەڵام پێغەمبەر و هاوڕێکانی دڵیان ئەکولا بۆ ڕووکردنیان بۆلای کەعبە لە نوێژدا ، چونکە پلەیەکی گەورەی پیرۆزی پێدرابوو لەلایەن خۆیان باوباپیریانەوە ، وەخانەی خواو دروست کراوی ئیبراهیمی باپیریان و ئیسماعیلی کوڕی بوو ، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەدڵ ئەپاڕایەوەو چاوی بۆ ئاسمان بەرز ئەکردەوە ، چاوەڕوانی پەیام و فەرمانی خوای ئەکرد ڕووانگەی بگوڕێ بۆلای کەعبە ، وەزۆریش دڵ گران بوو لەوەی جولەکەکان ئەیان ووت : زۆر سەیرە موحەممەد ڕووئەکاتە ڕووانگەکەمان و دژی ئاینەکەمانە ، کتوپڕ پەیامی بۆ هات و فەرمانی پێدرا ڕووی خۆیان وەرگێڕن بۆکەعبە ، بەو بۆنەوە بێباوەڕان بەگشتی و جولەکەکان بەتایبەی ئەم کارەیان بەهەڵ زانی و دەستیان کرد بەبڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندەی ژەهراوی ، لەدژی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەیان ووت :

موحەمەد نازانێ چی بکات و بۆ چ جێگەیە ڕووبکات لەنوێژدا، بگرە زۆرترین ساویلکەو ئەوانەی کەباوەڕ لەدڵیاندا نەچەسپابوو لەئایینی ئیسلام وەرگەڕان بۆیە خوای گەروە ئەم ئایەتانەی نادرە خوارەوە و فەرموی :

سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ  ١٤٢

﴿سيقُول الّسفهاءُ من النّاس ﴾ نەزان و گێل و گەوجەکانی جولەکە و دووڕووەکانی ئادەمیزاد و بێباوەڕەکان کەبڕوایان بەگۆڕینی ڕوانگەنی‌یە ئەڵێن :

﴿ ماولاّهم عنْ قبلتهمُ الّتي كانُوا عليها﴾ چ شتێکە موسڵمانانی وەرگێڕاوە لەو ڕوانگەیە لەسەری بوون و ڕوویان تێ‌ئەکرد لەنوێژدا ؟ واتە ئەوسا بەبەیتولموقەدەسبو ئێستا کەعبەیە .

﴿ قُل لله الْمشرقُ والمغربُ ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بۆ خوان ئەو خاوەنیانە ، ئەوەی ڕاستی بێت شوێنی بەتایبەتی پەیوەندی بەخواوە نی‌یە بوونەوەران هەموویان هی خوان ، وەفەرمان ئەدات بەبەندەکانی ڕووبکەنە هەر لایەك کەبیەوێ ، هەر شتێ ئەویکا کەس توانای پرسیاری نی‌یە .

﴿ يهدي من يشاء الى صراط مستقيم﴾ خوا ڕانومای کەسێك ئەکات بۆلای ڕێگەی ڕاست ئارەزووی هەبێت ، ئەو شتەی خوا بیکات بۆ ئەوان چاکەو بەسوودە کەبریتیە لەنوێژکردن جارێ بۆ ڕووکردن بۆ بەیتو الموقەدەس جارێ تربۆ لای‌کەعبە ، وەئەو شتەی شیاو بێت بەگوێرەی پێویست فەرمانی پێ ئەدا .

وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾

﴿وكذلك﴾ وەهەروەك خوای گەورە ڕێنومایی ئێوەی کرد بۆلای ڕێگەی ڕاست ، ڕووی پێکردن بۆلای خانەی خوا کەئیبراهیم دروستی کردووە و کراوە بەڕوانگەبۆتان ﴿جعلْناكُمْ امةً وسطاً﴾ ئێمە ئێوەمان کردووە بەگەلێکی هەڵبژاردەو داپەروەرو مام ناوەندی ، پلەتان کەمتر بێت لەپلەی پێغەمبەران و بەرزتربێت لەگەلانی تر . ئەم ئایەتە هەموو موسوڵمانانی سەردەمی پێغەمبەر و هەموو سەردەمێکی تردەگرێتەوە ، هەتا ڕۆژی دوایی ، هەروەك ئەفەرمووێ : ﴿كُتب عليكم الصيامُ﴾وە﴿كُتب عليكم القصاص﴾ کەواتە ئەوانەی ئەیانەوێ بیبڕن بەسەر تاقمێکی تایبەتدا لەنرخی ئیسلام کەم ئەکەنەوە ، وەئەیانەوێ لەپشتەوە تیغی ژەهراوی خۆیان بدەن لەئیسلام ﴿والله مُتمُّ نُوره ولو كره الْكافرُونْ﴾ وەخوا ڕووناکی ئاینی خۆی تەواو ئەکا باوەکو بێباوەڕان پێیان ناخۆشبێت .

موسولّمانان مام ناوەندین بەمانای ووشە : مام ناوەندین لە بیروباوەڕدا ، نەبەتەواوی واز لەجیهان دێنن ، وەنەبەتەواوی کالاّی جیهان ئەکەن بەبت و بیپەرستن و لەنرخی ئادەمیزاد کەم کەنەوە بۆ پەرەپێدانی سەروەت و سامان . مام ناوەندین لەهەست و ووردبوونەوەدا ، نەدەرگای فێربوون دائەخەن ، نەبەکوێرانەش شوێن کەس ئەکەون ، مام ناوەندین لەرێکخستنی خۆیان نەپاڵ ئەنێن بەئادەمیزادەوە و ژێر دەستەی ستەمکاران نین ، نەدەستە جلّەویان بۆ شل ئەکرێت کەهەریەکێ گیایی بانێ بخۆن و بۆ خۆیان بژین . بەلّکو بەجۆرێکی شیاو ئادەمیزاد بەیەکەوە ئەبەستێ بۆ یەکتری بژین نەك بۆ گەلێکی تەنها . مام ناوەندین لەکۆمەلاّیەتیدا نەبۆ گەلێکی تەنها تەواوی مرۆڤ ئەتوێننەوە وەنەکۆمەلّگایەکی گەورە بۆ تاکەکەسێ وەیا بۆ چەند کەسێ مرۆڤ ئەکەن بەژێر دەستە . بەلّکو هەموویان بەگوێرەی کۆششی خۆیان بژین بەمەرجێ جگەی خۆیان نەخەنەپشت گوێ . بەلّکو بەو جۆرەی پێویستە ئەوانیش بژێنن . مام ناەندین لەجێگەو شوێنداو لەساماندا نەکۆمەلّێ بەتەنها خاوەنی پیت و فەڕو سامان و کۆشك و پلەی سەرزەوی بن ، نەهەندێکیشیان هەناسە ساردو بێبەش و بێجێگەو دەربەدەر و بێپلەبن بە جۆرێکی ستەم کارانە . مام ناوەندین لەئایین و پەرستندا ، نەیەکجاری وازلەهەموو ئایین و پەرستن دێنن ، و نەدوای هەموو پڕوپووچ و ئەفسانەو جادویەك ئەکەون . بەلّکو دوای ڕاستی و ڕاستی پەرستیو بەلّگەداری ئەکەون ، خوایەکی تەنها و بەتوانا ئەپەرستن ، نەك بتی تاشراو بێگیان وگاوگورگ و ئەستێرە و فریشتەو مرۆڤ و گوڕ و دارو گومەز بپەرستن و کالاّو کەرەسەی جیهان بپەرستن .

مام ناوەندین لەڕێزی پێغەمبەرندا ، نەئەیانکوژن و لەنرخیان کەم ئەکەنەوە ، نەئەیان پەرستن و بیانکەن بەخواو کوڕی خوا ، بەلّکو بەبێ جیاوازی ڕێزی هەموویان ئەگرن و نایانکەن بەخوا .

﴿ لتكونوا شهدآء على النّاس ﴾ بۆ ئەوە ئێوەی موسوڵمان گەواهی بدەن لەسەرهەموو ئادەمیزادێ لەپێش خۆتانەوەن بەو ڕاستیانەی لەنامەکانیاندان ، لەو شتانەی پێیان گەیشتووە کەپێغەمبەرەکانیان فەرمانی خوایان بەوان گەیاندووە ، وەئامۆژگاریان کردوون، وەهەروەها لەڕۆژی دوایشدا شایەتیان لەسەر ئەدەن ، کەفەرمانی خوایان وەرنەگرتووە باوەڕیان نەهێناوە .

﴿ويكون الرّسولُ عليكُمْ شهيداً﴾ وەپێغەمبەریش شایەتی لەسەر ئێوە ئەدات ، کەئەونامەیەی بۆی هاتووە بەئێوەی گەیاندووە ، وەشایەتیش ئەدات لەسەر ئەو کەسەی کاری بەئیسلام و فەرمانی ئیسلام نەکردووە .

زانایان لەمانای ئەو شایەتی دانە خۆیان ماندوو کردووە ، بۆ ئەو مەبەستە ئەم پرسیارە ئەکەین : ئایا وەکو پێغەمبەر شایەتە بەسەر ئەوانەوە فەرمانی خوایان بەجێ نەهێناوە لەموسوڵمانان ، ئێمەی موسوڵمان شایەیەتی ئەدەین لەسەر ئەوانەی موسوڵمان نین و باوەڕیان نەهێناوە بەخوا ، وەبەفەرمانی خواو پێغەمبەر هەڵنەساوون ؟

لەوەڵامدا ئەوەی بتوانین باسی بکەین ئەمەیە : زانایانی موسوڵمان پێویستە لەسەریان ناوەڕۆکی قورئان بەنەزان و نەخوێنەوارانی خۆیان و هەموو بێباوەڕان بگەیەنن ، بەگوێرەی توانای خۆیان ، هەرکامیان بەو کارە پیرۆزە هەڵسان لەزانایانی موسڵمان ئەبنە شایەت بەسەر ئەو کەسانەوە ئەمان پێیان ڕاگەیاندوون و بەو کارە هەڵساوون هەرکامیشیان بەو کارە پیرۆزە هەڵنەسابن پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ لەڕۆژی دواییدا لەبەردەم خوای گەورەدا شایەتی ئەدات لەسەریان کەبەپێویستی خۆیان هەڵنەساوون ، ئەوکاتە ئەوپەڕی نەگبەتی و شەرمەزاری بۆ ئەو کەسانەیە کەمتەرخەمی و سستی ئەکەن لەگەیاندنی فەرمانی خوا ، کەپێغەمبەر شایەت بێت بەسەریەوە ، وەلەوکەسەش خراپتر ئەو کەسەیە خراپەکارو خراپە ویژبێت ، ببێتە هۆی بڵاوکرانەوەی دوودڵی لەنێوان ئادەمیزاد دا دەربارەی ئەو کەسانە باوەڕدارن ، وەببێتە هۆی نزم کردنەوەی ئایین .

وەك لەمەوبەر باسمان کرد یەکەم جارکەنوێژ پێویست کرا لەسەر موسوڵمانان لەمەکە ڕوویان ئەکرد بۆلای کەعبە ،کەپێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە فەرمانیان پـێ‌درا ڕووبکەنە بەیولمەقودەس ، هەروا بوون هەتا ماوەی (١٨) مـانگ هـەتا یەکـەمین فـەرمانیان پێ‌درا ڕووبکەنەوە بۆلای کەعبە بەیەك جاری ، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو کارە خوای گەورە لەفەرمان پێ‌دانیان بۆلای بەیتولمەقدیس لەو ماوەیەدا خوای‌گەورە دەفەرموێ:

﴿وماجعلْنا الْقبلة الّتي كُنت عليْها ﴾ وەئێمە نەمان گێڕابوو ئەو ڕوانگەیە تـۆ لـەسـەری بووی لەو ماوەیەدا لەنوێژدا ڕووت ئەکرد بۆ بەیتولمەقەدەس .

﴿إلاّ لنعْلم منْ يتبع الرّسول ممن ينقلب على عقبيْـه﴾ مەگـەر بـۆ ئـەوە ئێمـە بزانـین چ کەسێ دوای ئـەو فروسـتادیە ئەکـەوێ بـۆ ڕووکردنـی بـۆلای ڕوانگـەی کەعبـە ، لـەو کەسانەی وەرئەگەڕێن لەئایینی ڕەواو ڕاست ، بێ‌فـەرمانی خوائەکـەن و ئەچنـەوە بـۆلای بێ‌باوەڕی ، یانێ هەر لەبـەر تـاقی کردنەوەیـە چ کەسـێ لەموسـوڵمانان دوای پێغەمبـەر ئەکەوێ لەوەی خوا فەرمانی پێ‌داوە ، وەچ کەسێکیان دوودڵی پەیدا ئەکەن ، گفتوگـۆی بێ‌بـاوەڕان کاریـان تێ‌ئـەکا کـەگوایا موحەمـەد سـەرگەردانە لـەڕووکردنی موسـوڵمانان بۆنوێژیان و باوەڕیان کەم ئەبێتەوە ، وەئەوکەسانەی خۆیان گرتووە لەسـەر ئـاینی ئیسـلام جوێ ئەبێتەوە لەو کەسانەی پـاش گـەز ئەبێتـەوە خـوای گـەورە هـەموو شـتێك ئـەزانێ لەهەموو ڕوویەکەوە ئیتر بۆ ئەبێت بفەرمووێ : هەتا ئێمە بزانین چ کەسـێ دوای پێغەمبـەر ئەکەوێ خوای گەورە هەموو شتێ ئـەزانێ لـەوەڵامی ئـەو پرسـیارەدا هەرچـەندە زانایـان کۆششی زۆریان کردووە بۆوەڵامی ئەو پرسیارە بەڵام وەکو بێژراوە بۆ ئەمەیە چاکـەکاران و خراپەکاران دەرکەون بۆ هەموو ئادمیزاد جۆێ ببنـەوە لەیـەکتری ، هـەتا هیـچ کەسـێ گوێ لەگفتوگۆی خراپەکاران نەگرێ.

﴿وإنْ كـانتْ لكبـيرةً﴾ وەئـەو گۆڕانکـاری و ڕووکردنـە قیبلەیـە هەرچـەندە قـورس وگەورەیە لای ئەو کەسانەی شەیتان یاری بەعەقڵیان ئـەکات ، وەبـاوەڕ بەباشـی نەچۆتـە دڵیانەوە ، وەلەئاین پاشگەز ئەبنەوە .

﴿ إلاّ على الّذين هدى الله ﴾ مەگەر لەسەر کەسانێکی ئەوتۆ گران نی‌یە خوا ڕێنومـایی کردوون ، واتە ئەو کەسانە ڕێنومایی کراون بۆ تێگەیشتن لەو کارانە ، کەجێگەی خۆش و شیاویان بۆ دانراوە ، هەموو فەرمانیێ بەجیێدێنن بۆ خوای گەورە هەتا ڕاوەستاو خۆگربـن لەسەر باوەڕی خۆیان ، ئەو کەسانە باوەڕیان چەسپاوەو ڕووکەش نین و پاش گەز نابنەوە .

﴿وَماكانَ اللهُ لِيُضيع إيمانَكُمْ﴾ وەخوا بەو شێوەنی‌یە لـەناو ببـا بیروبـاوەڕی ئێـوە بـەو شتانە هاتوون بۆلای پێغەمبـەر﴿ ﷺ ﴾ بیـان خاتـە دوو دڵی‌یـەوە لـەهیچ شـتێکا . واتـە بەباوەڕی ڕاستی خۆتانەوە ئەتانهێڵێتەوە .

﴿إنَّ اللهَ بالناس لَرؤُوفٌ الرّحيـمٌ﴾ بەڕاسـتی خـوا ئـەو پـەڕی نـەرم و بەبەزەیی‌یـە بـۆ ئادەمیزاد ، زۆر میهرەبانە لەگەڵیاندا و لێیان خۆش ئەبێ .

قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾

پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ ماوەی شانزە مانگ ودوای کـۆچ کردنـی بـۆ مەدینـە لـەنوێژدا ڕووی ئەکرد بۆ بەیتولمقەدەس . بـەڵام لـەدڵیا لەخوائەپاڕایـەوە وەڕووی وبەرزئـەکردەوە بۆئاسامان و ڕووانگەکەی بۆ بگـۆڕێ بـۆ لای کەعبـە ، هـەتا ڕێکـەوتوبێ لەگـەڵ ئـاینی ئیبراهیم و دژی جولـەکەکان بێت ، خوای گەورە نزاکەی لێوەرگرت و فەرمووی :

﴿ قَد نرى تَقَلُّـبَ وَجْـهِكَ فِي السَّـماءِ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە ئـەزانین و ئـەبینین بـە بـەرزی ڕوومەتت و چاوت بۆلای ئاسمان ، چاوەڕوای و پێـت خۆشـە گۆڕینـی ڕووانگـە بـۆلای کەعبە ، ئارەزووت وایە فەرمان دەرچێت و ئاواتت بێتە دی .

﴿ فلنولينك قِبْلَةً تَرْضاها﴾ کەواتە دوایی ئێمە ڕویتۆ وەرەگێڕین بۆ ئەو ڕووانگەیە تـۆ پەسەندی ئەکەیت و پێت خۆشە ، چاوەڕوانی ئەگەیت کەفەرمانت بۆ دەرچێت .

﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرام﴾ کەوابوو تۆ ڕووی خۆت وەرگێڕە لـەنوێژدا بۆ لای مەسجدولحەرام . خوای گەروە ناوی ئەو مزگەوتەی بـردووە بـە (الحرام) بۆئـەوەی پێویست بێت ڕێزی لێ بگیرێو قەدەغەبێت بەچاوی سووك سەیر بکرێت .

کەعبە یانی خانەی خوا :بەشێکە لەمزگەوتی حەرام ، ئەو مزگەوتەش بەشێکە لەهـەموو حەرەم کە مەکە و هەموو لایەکی ئەگرێتـەوە کـە قەدەغەیـە ڕاوو کـردن و نێچیر گرتـن لەودا. لەنێوبردنی مزگەوتی حرام ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتـەوە ڕووکردنمـان بـۆلای کەعبـە بەسە بۆمان ، چونکە ڕووکردن ڕاستەو خۆ بۆ کەعبە زۆر قورس و گرانە بۆ ئەو کەسانەی دوورن لەکەعبە ، بەڵام ئەو کەسانەی نزیکن پێویستە ڕاستەو خۆ ڕووبکەنە کەعبە .

﴿وَحَيْثُ ماكُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ وەئێوەی موسوڵمان لەهــەر جێگەیـەك هـەن دوایی ڕوو وەرگێڕن بـۆلای بەشـێك لەکەعبـە لەدەشـتان یـا لـەکێوو دەریـاو هـەوادا . لەڕۆژهەڵاتن یان لەڕۆژئاوا ، پێویستە لەسەرتان ڕووبکــەن بـۆلای مزگـەوتی حـەرام ، و سنگتانی تێکەن ، قەدەغەیە پشتی تێکەن و بیخەنە ئەم لاو لاتانەوە . بـەو پێیـە ڕووانگـەی موسڵمانان ئەگۆڕێت بەگوێرەی گۆڕانی هەرێم ، وائـەبێت ڕووئەکرێتـە ڕۆژهـەڵات یـان

ڕۆژئاوا ، وایش ئەبێت ڕووئەکرێتە باشوور وەیا باکور ، بۆیە موسوڵمانان نرخێکی تایبەتیان بەکاروباری ڕوووانگەداوە ، زانیاری‌یەکی تایبەتی‌یان داناوە ناوی نراوە (سمت القبلە) بەپێچەوانە جولەکەکان ڕووئەکەن بۆلای ڕۆژئاوا ، گاورەکان ڕووئەکەن بۆ ڕۆژهەلاّت ، ئیتر با بەیتو لموقەدەس لەپشتیانەوەبێت گرنگ نی‌یە بەلایانەوە .

خوای گەورە جارێك ئەفەرموێت بە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ : ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ ﴾ یانیٚ تۆ موحەممەد ڕوووەرگێڕە ، جاری‌تر بەموسوڵمانان دەفەرویٚ : ﴿فَوَلُّوا وُجوهَكُمْ ﴾ یانیٚ ئەی موسوڵمانان ڕووتان وەرگێڕن ، بەگوێرەی دەستووری قورئان فەرمندان بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرماندانە بە موسوڵمانان ، هەروەها فەرماندان بەموسوڵمانان فەرمنادانە بەپێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کەواتە بۆچی خوای گەورە هەریەکێکیانی نەفەرمووە و هەردوولاشیان بگرێتەوە بەیەکەوە . لەوەلاّمدا زانایان دەڵێن گۆڕینی ڕووانگە ڕووداوێکی یەکجار گەورەیە لەئیسلامدا ، لەبەر ئەوەی گۆڕانەکە بۆ ئاواتی پێغەمبەر بووە خوای گەورە دەیەوێت بۆئەو مەبەستە هۆشیارمان بکاتەوە بۆ باسی پێغەمبەر و دووپات کردنەوەی جاریٚ بەتەنها و جاریٚ تر لەنێو موسلّماناندا ، ئەوەیش بزانین هەموو فەرمانەکانی خوا ڕاستەوخۆ ڕووی بۆ پێغەمبەرە ، بۆ موسوڵمانانە لەپلەی دووەمدا ، بەهۆی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ .

بائەمەش بزانین چ کاتیٚ پێویستە ڕاستەوخۆ ڕووبکرێتە خانەی خوا و ڕووانگەکەی ؟ ، کەعبە یانیٚ خانەی خوا ڕووانگەی ئەوانەیە لەمزگەوتی حەرامدا نوێژدەکەن ، مزگەوتی حەرام ڕووانگەی دانیشتوانی مەکە یەدەورووبەری حەرەمی مەککە یانیٚ سنووری شارەوانی‌یەکەی مەکە ، ڕووانگەی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاواو باکورو باشوورو جێگە دوورەکانە .

ڕوووکردن بۆڕوووانگە پێویستە لەنوێژە فەرزەکانداو لە سوجدەی سەهوو ، نوێژی مردوو هەموو نوێژەکانی ترو کاتی نیبەت هێنان بۆ نوێژە سوننەتەکان . بەلاّم لەدوای نیبەت هێنان ئەتوانریٚ ڕوونەکرێتە ڕوووانگە .

ئەو کەسانەی لەسەر ئاینی ئیسلامن وەکو پێیان دەوترێت موسڵمان پێشیان دەوترێت ئەهلی قیبلە ، خێران قورئان و خێرانی شەهادەت یان پێ‌دەوترێت ، ئەو ناوانە هەموویان یەك مانا ئەبەخشن بەڵام ناوی موحەمەدیەکان ناوێکە دوژمنانی ئیسلام بۆیانیان داناوەو دروستیان کردووە ، بەگوێرەی بیری خراپیان سەربەکەسێکی تەنهان نەك سەر بەئاینێ ، وێنەی بوززییەکان و زەردەشتی ومارکسی هەتا دێت . مەبەستمان لەو باسە ئەمەیە : ئەو ناوانە هۆشیارمان ئەکاتەوە : کۆمەڵگای گەورەی ئیسلام دانیشتوانی هەر جێگەیەك بن و هەر ڕەنگ هەر زمانێکیان هەبێت خاوەنی یەك ئایینن ، ئەو ئایینە لایان بەنرختر و گەورەترە لەگیان و سامانیان ، موسوڵمانان بەو گیان و سامانەی خۆیان ئەو ئاینە دەپارێزن و خۆیانی بۆ دائەنێن . لەبنچینەی هەرە گەورەی ئاینەکەیانە : باوەڕ بەخوا و بەفریشتەکان و نامەکان و پێغەمبەرەکان و ڕۆژی دوایی‌و ڕووکردن بۆ لای کەعبە لەنوێژدا . کەواتە ئەو کەسانەی لەو خێرانە باوەڕیان بەو جۆرە بێت و بەرەو ڕوانگە نوێژبکەن بەباوەڕدار دائەنرێن ، بەپێچەوانە ئەیەوێ کۆمەڵگای ئیسلامی بێ بێ‌هێز بکەن و موسوڵمانان پارچە پارچە بکەن و، یاریدەی دوژمنانی ئیسلام ئەدەن بۆ نەمانی ڕووناکی ئایین و بیەوێ و نەیەوێ بێ‌باوەڕە.

﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ﴾ وەبەڕاستی کەسانێکی ئەو تۆ بەوان بەخشراوە نامەی خوا بەڕاستی ئەزانن گۆڕانی ڕووانگەلە بەیتولمەقدیسەوە بۆلای کەعبە ڕاست و ڕەوایە لەسەر موسوڵمانان لەلایەن پەروەردەکاری خۆیانەوە ئەو فەرمانە هاتووە ، وەلەنامەکانیاندا نوسراوە پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ لەنوێژدا ڕوودەکاتە دوو ڕووانگە ، لەدوایدا بەیەکجاری فەرمانی پێ‌ئەدرێ ڕووبکات بۆ لای کەعبە ، ئەو فەرمانانە خۆی دروستی نەکردووە وەك ئەوان گومان ئەبەن .

﴿وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْلَمُونَ﴾ وەخوا بێ ئاگانی‌یە لەو شتانەی کەئەو خاوەن نامانە ئەیکەن کەبڕوایان بەگۆڕینی ڕوانگە نی‌یە ، وەگێرە شێوێنی ئەکەن .

﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِيْنَ أُوتُوا الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ﴾ وەسوێند بەخوا ئەگەر تۆبهاتایەی‌و بتهێنایە بۆ کەسانێکی ئەوتۆو دراوە بەوان نامەی خوا بەهەموو بەڵگەو نیشانیەك لەسەر ڕاستی خۆت کەگۆڕینی ڕوانگە بەپەیام بۆت هاتووە لەلایەن خواوە .

﴿ ماتَبِعُوا قِبْلَتَكَ﴾ ئەوان دوای ڕوانگەی تـۆ نەئەکـەوتن لەبـەر لـەخۆبایی بونیـان و لاسارییان ، چ جای دوای ئاینەکەت بکەون ، بەڵگەو نیشـانە بۆئـەوان سـوودیان نی‌یـە ، ڕەگەز پەرستی‌و نەزانین و کردەوەو ڕوشتی ئەوان دەردی بیٚدەرمانە ، ئیتر وازیان لیٚبهێنە.

﴿وَماأَنْتَ بِتابِعٍ قِبْلَتَهُمْ﴾ وەتۆش دوای ڕووانگەی ئەوان ناکەویت ، هەرچەندە هەندیٚ لەخاوەن نامەکان ئاواتەخوازبوون ، و لایان وابوو تۆ بگەڕێیتەوە بۆلای ڕووانگەی ئەوان ، ئیتر بابەداخەوە بمرن و بەتەمانەبن ئاواتیان بێتەدی .

﴿وَمابَعْضُـهُمْ بِتـابِعٍ قِبْلَـةَ بَعْـضٍ﴾ وەهـەندیٚ لـەخاوەن نامـەکانیش دوای ڕوانگـــەی هەندی‌تریان ناکەون . واتە جولـەکەکان بۆ ڕۆژئـاوا ڕووئەکـەن لـەنوێژیاندا ، گاورەکـان ڕووبۆلای ڕۆژهەڵات ئەکەن ، هیـــچ تاقمێکیـان واز لەوڕوانگەیـە نایـەهێنن لەسـەرینی و دوای ڕووانگەیەکی تربکەون ، ئەوان کەئەمە کردەوەیان بێت چۆن شـــوێن ڕوانگـەی تـۆ ئەکەون . بگـــرە ئـەو ناکۆکی‌یـەی جولـەکـەکان هەیانـە لـەناو خۆیـاندا زۆر ئـاڵۆزترە ، وەهەروەها گاورەکانیش زۆر زۆرناکۆکی‌یان لـەگەڵ یەکتری هەیە ، ئـەو کوشـتن بڕینـەی کەکاسـۆلیکەکان کردوویانـە لـەگـەڵ پرۆتسـتانەکان بیٚوێنەیـەو لەهـەموو سـەردەمیکدا کەهەردوکیشیان گاورن .

﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوائَهُمْ﴾ وەئەگەر تۆ موحوممەد دوای ئارەزوی خاوەن نامەکان بکەویت و بتەوێت لێت ڕازی بن ، ئەڵێن بەخۆت و هاوڕێکانت بـبن بەجولـەکـە یـان گـاور هـەتا ڕێنمووبی وەرگرن . ئەگەر تۆ دوای ڕووانگەی ئەوان بکەویت .

﴿مِنْ بَعْدِ ماجاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ لەدوای ئەوشتەی هاتووە بۆتۆ لەو زانینە بیٚگومانەکەمن ئاگادارم کردوویت ، کەئەو خاوەن نامانە لەسەر کاری پڕوپووچـن ، وەبڕوایـان بـەکاری ڕەواو ڕاست نی‌یە ، وەلـەلایەکی تـرەوە ئـەوان ئـەزانن ئـەو ڕووانگـەی تۆیـە هـەر ئـەوە پێویست کراوە لەسەر ئیبراهیم و هەموو نەوەکانی .

﴿إِنَّكَ إِذاً لَمِنَ الظّالِمِينَ﴾ بەڕاستی تۆ ئەوکاتە لەستەم کـارانیت وەبـیٚ فـەرمانی منـت کردووە ، وەزیانت بەخۆت گـەیاندووە ، و وازت لەپەرسـتنی مـن هێنـاوە ، وەئـەوجۆرە

کارانەیش لەپێغەمبەرەوە دوورن ، وەهەرگیز گوناه لەوپەیدا نەبووەو نایشبێت ، بەڵام خوا بۆ ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوەی پێ فەرمووە هەتا لەگەڵ خاوەن نامەکان توندو تیژتربێت ; چونکە چاکەیان لێ ناوەشێتەوەو ئاشتی لەگەڵیان بێ سوودە ، هەوڵدان بۆگەڕانەوەیان بێ ئەنجامە . لەسەر ئاژاوەو بێباوەڕیو خراپەکردنن لەگەڵ ئەوکەسانەی چاکەیان لەگەڵ ئەکەن و لەسەر ئەو شتانە دروست بوون .

**ئەمەیش بزانین :** زانایان هەر جۆرە بیروباوەڕێکیان هەبێ ، دوای وتووێژ لەگەڵ یەکتری زۆر نزیکە پێك بێن لەسەر ئەو شتەی بیروباوەڕیان لەگەڵی جیاوەزە ، بەمەرجێ ئەوشتە پەیوەندی بەئاینەوە نەبێت ، بەڵام ئەگەر جیاوازی بیروڕایان پەیوەندی بەکاروباری ئاینەوە هەبوو ، هەرگیز چاوەڕوانی یەکگرتنیان لێ ناکرێ هەزاران بەڵگە بۆیەکتری بهێننەوە ، ئەو دوو هەڵوێستە باس کران بەچاو بینراوە ، بۆیە زانایانی وتویانە: وەرگەڕانی ئادەمیزاد لەهەموو شتێ زۆر ئاسانەو نزیکترە لەوەرگەڕانیان لەئایین .

ئەومش ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی بەکوێرانە دوای ئاینی باووباپیرانیان کەوتوون ، ئەقڵی خۆیان نەخستۆتە کار ئەوکارەنالەبارانە لەئیسلامەوە دوورن ، چونکە ئیسلام پشتی بەئەقڵ و بیرکردنەوە بەستووە نەك بەکردەوەی نەفامانەی باوباپیریان . ئەو کەسەی لەئایەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ووردبێتەوە بۆی دەردەکەوێ موسوڵمانان بۆناسینی خواو ئاینەکەیان جگە لە ئەقڵ دوای هیچ شتێکی تر ناکەون . فەرماندان لەقورئاندا بەئادەمیزاد بۆبیرکردنەوە زۆرن .

ئەوکەسانەی ئەڵێن باوباپیرەکانمان چۆن بوون ئێمەیش ئاوائەبین ، لەپوختەی مانای قورئان ووردنابنەوە و لەیاسای ئیسلام لایانداوە ، وەپێویستە لەسەرمان بەدوژمنانی ئیسلام ڕاگەیەنین تەماشای ئیسلام لەو کەسانەوە نەکەن ، ئەوانە لەئیسلامەوە دوورن و تەنها ناویان موسوڵمانە ، ئیسلام لەشوێنکە بەناوموسوڵمانەکان لەشوێنێکی تردان .

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾

﴿الَّذين آتيناهُمُ الْكِتابَ يَعْرِفُونَهُ كَما يَعْرِفُونَ أبْناءَهُمْ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئێمە بەخشیومانە بەوان نامەی ئێمە لەمالومەکانی جولەکەو زانایانی گاور ، پێغەمبەر ئەناسن هەروەك چۆن کورەکانی خۆیان ئەناسن ، عومەری کوڕی خەتتاب لە عەبدولای کوڕی سەلامی پرسی لەبارەی پێغەمبەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: لەکوڕی خۆم چاکتر ئەیناسم و گومانم لەناسینیدا نییە . بەڵام مەگەر دایکی خۆی بزانێ لەچ کەسێکە لەوانەیە ناپاکی کردبێ. هەروەها ئەزانن کەعبە ڕووانگەی خۆیان و ئیبراهیم و پێغەمبەرانی تریشە ، وەقورئان ئەناسن کەنامەی ڕاستی خوایە هەروەکو ناسینی کوڕەکانیان ، چونکە تەوارات و ئینجیل موژدەیان داوە بەهاتنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەهەموو شێوەزەکانییەوە ، هەروەها باسی ڕووانگەیشی بۆ کردوون .

﴿ وَإنَّ فَريقاً مِنْهُمْ ﴾ وەبەڕاستی تاقمێ لەوانەی نامەیان دراوەتێ پێغەمبەرو ڕووانگەو قورئان ئەناسن بێجگە لە عبدالله کوڕی سەلام وهاوڕێکانی.

﴿ لَيَكْتُمونَ الْحَقَّ﴾ بەڕاستی ڕاستیو ڕەواکان دائەپۆشن . بەڵێ ، ڕاستی دائەپۆشن باناوی موحەممەدیش بخوێننەوە ، نەوەك سەرۆکایەتی و سوودی تایبەتی خۆیان لەکیس بچێ، لەو جۆرە کارانەدا وەنەبێ هەر خاوەن نامەکان وابن ، بگرە ئەبینن هەندێ لەزاناکانو مامۆستاکانی ئێستایش بەبێبەڵگە لەڕێزی هەندێ لەهاوڕێکانیان کەم دەکەنەوە

زانیانری‌یەکانی دائەپۆشن و ئەیشارنەوە ، موسوڵمان پێویستە ڕێزی هەموو کەسێ بگرێ هەرکەسێ بەگوێرەی پلەی خۆی ، خوای گەورە ئەفەرمووێ : بەڕاستی ئێمە ڕێزی نەوەکانی ئادەم ئەگرین ، ئیتر چۆن ئەبێت زانیاری زانایان داپۆشرێ .

﴿وَهُم يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانە ئەزانن کەموحەممەد فروستادەی خوایە و کەعبە ڕووانگەیەو ، نامەکانی خۆیان ئەمانەی ڕوونکردۆتەوە و ڕەوایش نی‌یە بیشارنەوە ، کەچی ئەیشارنەوە .

﴿ الْحَقُ مِنْ رَبِّكَ﴾ ئەوڕاستیە لەلایەن پەروەدگارتەوە هاتووە ، بەدەمی ئەوان نابێت کەئەیشارنەوە لەئادەمیزاد .

﴿ فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴾ کەواتە تۆ لەو کەسانە مەبە گومانیان هەیە لەفەرمانی ئێمە کەگۆڕینی ڕوانگەیە بۆلای کەعبە ، وەبزانە ڕووانگەی ئیبراهیم و پێغەمبەرانی تریش بووە . لێرەدا پێویستە بزانرێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ گومانی نەبووە ، بەڵام دەستووری قورئانی پیرۆز وایە ڕووئەکاتە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ، لە فەرماندان و قەدەغە کردنا مەبەست ئادەمیزادانی ترە لەو سروشەدا.

خوای گەروە بەو ڕووپێ‌کردنەی بۆلای پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ موسوڵمانانی لەمەوپاش هۆشیاردەکاتەوە کەوێنەی موسوڵمانانی پێشوانیان بن . پڕوپووچی بێ‌باوەڕان کاریان تێ‌ئەکات . کەواتە کاتێ گوێمان لەو هەڕەشانەبوو شایەنی ئێمەی موسوڵمان نی‌یە بەهەموو نەفامی‌یەکەوە داوای کاروباری هەڵسوڕاومان لەگاوروجولەکەو شیوعی‌یەکان بکەین و، ئاینمان لەمێژوونوسانی ئەوانەوە وەربگرین ، کەچی گوێمان لێ‌یە هەزاران درۆودەلەسە هەڵئەبەستن بۆگومان پەیدا کردن لەقورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾، کەچی ئێوە قوتابی‌یەکانتان ئەنێرن بۆلایان بۆ خوێندنی زانیاری ئیسلام لەزانکۆکانیان دەرچن و بێنەوە بۆلاتان بەمێشکی دەستکاری کراویانەوەو دڵی پڕ کینەیانەوە . ئەو قورئانە قورئانمانە قورئانی هەموو موسوڵمانانە ڕووئەکاتە هەموو موسڵمانان هەتاهەتایە لەهەموو سەردەمێکدا ، خاوەن نامەکانیش هەرئەوخاوەن نامانەن ، بێ‌باوەڕانیش هەرئەوبێ‌باوەڕانەن گۆڕان بەسەریانا نەهاتووە ، وەئایین هەر ئەو ئاینەیانە نابێت خۆمان گێل

و گەوج کەین ، ئەی بۆخۆمان بەلاوە هیچ بێت و وابزانین داری بێ‌گیانی ئـەوان چۆنمـان هەلّسورێنن شانازی پێوەبکەین .

وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا
فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا
إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ
وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَمَا
اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ
شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ
شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا
مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ
تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ
يَتْلُوا عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ
وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَاذْكُرُونِي
أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان لەنوێژدا ڕووبکەن بۆلای کەعبە ئیتر لەباکوور بن یان لەباشوور لەرۆژهەڵات بن یا ڕۆژئاوا ، یا لەنێوانیاندا بن ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيها﴾ بۆ هەر تاقم و لایەنێك ڕووانگەیەك هەیە ڕووی تێبکەن لەنوێژدا ، یانێ کەعبە ڕوانگەی موسوڵمانانە بۆیان هەیە ڕووبکەنە هەرلایێکی کەعبە ، جولەکەکان ڕۆژئاواو گاورەکان ڕۆژهەڵات ڕوونگەیانە و وازی لێناهێنن ، وەك ڕۆژی ڕوناك پووچەڵییەکەی ئەبنیرێ ، هەموو تاقمێ بەوشتەی لای خۆیان خۆشحاڵن .

﴿ فاسْتَبِقُوا الْخَيراتِ ﴾ دوایی ئێوە بڕۆن بۆلای کاری خۆتانەوە پێش برکێ بکەن بۆلای چاکەکان ، بەختیاری ئەمڕۆ پاشەڕۆژ لەنێوان ئێوەو چاکەکردنتانایە ، وەکاری چاکە بکەن بیکەن بەتوێشووی دوارۆژی خۆتان بۆئەوەی خوا لێتان خۆش بێت ، وەواز لەخاوەن نامەکان بهێنن ، بۆچ لایەك ڕووئەکەن بابیکەن و بەگومڕایی خۆیانەوە بمێننەوەو بەردەوامبن .

﴿ أَيْنَ ما تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللهُ جَميعاً﴾ لەهەر جێگەیەك بن ئێوەو دوژمنانتان خوا ئێوە ئەهێنێ بەهەمووتانەوەو کۆتان ئەکاتەوە لەزەویدا بن یالەسەر لوتکە کێوەکان ، یالەنێو قوڵایی زەریاکاندابن،پاداشتی چاکەکاران ئەداتەوەو تۆڵە لەخراپەکاران ئەسێنێ .

﴿ إِنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ﴾ بەڕاستی خوا توانای بەسەر هەموو شتێکاهەیە ئەتان مرێنێ و زیندووتان ئەکاتەوە و کۆتان ئەکاتەوە .

﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ ﴾ بۆهەر جێگەو شارێ تۆ چوویتە دەرەوە دووربێ یان نزیك .

﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ ﴾ دوایی تۆ ڕووت وەرگێرە بۆلای مزگەوتی بەڕێز لەنوێژدا (واتە بۆلای مەسجیدولحەرام) .

﴿ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ ﴾ وەبەڕاستی ڕووکردن بۆلای کەعبە ڕاست و ڕەوایە لەلایەن پەروەردەکەری تۆوە بۆت دیاریکراوە ، لەبیری خۆتانی مەبەنەوە خوا بپەرستن لەرووکردنا بۆلای کەعبە .

﴿ وَمااللّهُ بِغافِلٍ عَمّا تَعْلَمُونَ ﴾ وەخوا بیّ ئاگانی یە لەو شتەی ئێوەئەیکەن لەئێوەو لەبیّباوەڕان ، پاداشت و تۆڵەی خۆتان وەردەگرن .

﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَالْمَسْجِدِ الْحَرامِ ﴾ وەتۆ لەهەر جێیەك چوویتە دەرەوە ، دوای تۆ ڕووی خۆت وەرگێڕە بۆلای مەسجیدولحەرام لەدوورەوەبیّ یا نزیك .

﴿ وَحَيْثُ ماكُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ﴾ وەئێوە لەهەر جێیەك بن دوای ئێوە لەناوشاردا بن یا لەدەرەوە ، سواربن یان پیادە ، ڕووتان وەرگێڕن بۆلای کەعبە لەنوێژدا.

﴿ لِئَلاّ يَكُونَ لِلنّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ ﴾ بۆئەوەی ئادەمیزاد بەسەر ئێوەوە هیچ بەڵگەیەکی نەبێت ، واتە بۆئەوەی دوژمنانی ئێوە هیچ بیانویەکیان نەمێنێت و دەم کووت بن ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕووی ئەکرد بۆلای بەیتولموقەدەس بت پەرستانی عەرەب ئەیان ووت : موحەممەد چۆن ئەبێت ڕونەکات بۆلای کەعبە کەچی ئەڵێیت من لەسەر ئاینی ئیبراهیمم ؟ وەخاوەن نامەکان ئەیانووت : لەنامەکانی ئێمەدا هاتووە ئەو پێغەمبەرەی لەنەوەی ئیسماعیل ئەنێردرێت پێویستە لەنوێژدا ڕووبکات بۆلای‌کەعبە نەك بۆلای بەیتولموقەدەس ، ئیتر ئێمە چۆن بڕوای پیّبکەین ، کەواتە هەموویان بیانویان هەیە بیگرن بەدەستیانەوە بەگومانی خۆیان ، بۆیە خوای گەورە فەرمانی دا بەپێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕووەوەرگێڕیّ بۆلای کەعبە و بیکات بەڕوانگە بۆخۆی و هەموو موسوڵمانان هەتا هەتایە ، هەتا هیچ لایەکیان بیانویان نەمێنێت لەبت پەرستان و خاوەن نامەکان .

﴿ إلاّ الَّذينَ ظَلَمُوا مِنهُمْ ﴾ مەگەر بیانو بۆکەسانێکی ئەوتۆ هەبیّ ستەمیان کردبێت لەوان بەبیّ ئەوەی بەڵگەیان هەبێت . واتە جولەکەکان ئەیانوت : موحەممەد وازی لەڕووانگەی ئێمە هێناوە لەبەر خۆشەویستی خۆیی‌و خزمانی ، ئەگەر ڕاستی بکردایە وازی لە لەڕووانگەی پێغەمبەران نەئەهێنا ، عەرەبەکان ی‌مەککەش ئەیان ووت : بۆی دەرکەوتووە لەمەوبەر ڕاست نەبووە بۆیە گەڕاوەتەوە بۆلای ڕووانگەی باوك وباپیرانی ، نزیکە لەمەودواش بگەڕێتەوە بۆلای ئاینەکەمان .

﴿ فَلاَتَخْشَوْهُمْ وَأَخْشَونِي﴾ دوای ئێوەلەوان مەترسن و لەمن بترسن (واتە لە خوای گەورە) بترسن و ، لەنوێژەکانتانا ڕووبکەن بۆلای کەعبە و بێفەرمانی من مەکەن ، بەڕاستی لەکەس مەرتسن هەرمن خاوەنی پاداشت و تۆڵەم وەیارمەتیتان ئەدەم .

﴿ وَلأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ ﴾ وەفەرمانم پێداون ڕووبکەن بۆلای کەعبە بۆئەوەی تەواوی بکەم چاکەی خۆم بەسەر ئێوەدا ، هەتا باوەڕم پێبهێنن لەسەر ڕووانگەی خۆتان بن ، بیروباوەڕتان یەکبێ کۆببنەوە لەسەری بۆنوێژکردنتان ، هەموو گەلانی موسوڵمان لەهەموو هەرێمەکانەوە ڕوویکەنە یەك ڕووانگە .

﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ وەبۆئەوەی ئێوە ڕێنمایی وەرگرن بۆلای دروشمی نەتەوەیی خاوێنی ئیسلام و یاسای ڕاست و دروستی ئیسلام ، یەکێکە لەو ڕاستیانە ڕووکردنتان بۆلای ڕووانگەی سەربەخۆتان .

خوای گەورە لەم (٣) ئایەتەدا پێنج جار فەرمانی داوە بەڕووکردن بۆلای کەعبە لەنوێژدا ، لەئایەتی (١٤٤) دا (٢) جار ، لەئایەتی (١٤٩) یەك جار ، لەئایەتی (١٥٠) (٢) جار هەمووی ئەکاتە (٥) جار .

زانایان بۆدووپات کردنەوەی ڕووکردن بۆلای ڕوانگەی تازە چەندین هۆی زۆریان باس کردووە ، ئەوەیانە کەزیاتر بچێتە دڵەوە ئەمەیە : ئایەتی (١٤٤) پێمان نیشان ئەدات فەرمان دان بۆڕووکردن بۆلای مزگەوتی حەرام لەبەر ئارەزووی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بووە ، دوای ڕووکردن بۆلای ئاسمان پاڕانەوە لەخوای گەورە بۆ گۆڕینی ڕووانگە و وەڵامدانەوەو وەرگرتنی نزاکەی. وەئایەتی (١٤٩) بۆمان ڕوون ئەکاتەوە گۆڕینی ڕووانگە ڕەواو ڕاستە بەگوێرەی فەرمانی خوایەو ڕێك وپێکە لەگەڵ ئاواتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خوای گەورە نزاکەیوەرگرتووەو پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ کار ی سەربەخۆی نەکردووە خوا بۆی دیاری کردووە ...، ئایەتی(١٥٠) پێمان ڕائەگەیەنێ فەرمان دان بۆ گۆڕینی ڕووانگە ئەوەیە هەتا بەڵگەو بیانووی ئادەمیزاد بنەبڕبکات پەرتەوازەی بفەرموێ، هەتا ئەو کەسانەی ئەو گۆڕینە بەڕەوا نازانن بەڵگەو بیانوویان بەدەستەوە نەهێڵێ و دەم کوتیان کات .

بەڵام ئێمەی موسوڵمان لەدووپات کردنەوەی فەرماندان بۆ ڕوانگەی تازە ئەمەمان بۆ دەردەکەوێت لەنێو گۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕووداوی وامان ڕووبەڕووئەبێتەوە کەگۆڕینی ئەو ڕوانگە تازەیە پێویستی بەدووپات کردنەوە هەیە ، هۆشیارمان ئەکاتەوە پڕوپاگەندەی دوژمنان لەبارەی گۆڕینی ڕووانگەوە ئەوپەڕی کاریگەرە بۆ کولانەوەی برینی هەندێ لەدڵ نەخۆشان و بیروباوەڕی پوچیان ، قورئانی پیرۆز چارەسەری برینەکەیان ئەکات بەدووپات کردنەوەی فەرمانەکەی ، هەتا ئەنجامەکەی پایەداربێ لەگەڵ درێژەی کاتا و نەبڕاوەبێ لەهەموو ڕوویەکەوە کاری خۆی بکات و تەمەڵی‌و لاوازی ڕوونەکاتە باوەڕداران ، هەزاران تۆزو خۆڵ بەڕەشەبای نەفامی‌یەوە هەڵبکات بەئەندازەی مویەك لەباوەڕیان کەم نەکات .

کۆمەڵگای ئیسلامی گەوەر خوایکی تەنها و نامەیەکی تەنها و ڕووانگەیەکی تازەبەیەکیانەوە ئەبەستێتەوە ، موسوڵمانان لەهەموو لایەکەو لەهەموو هەرێمێکدا بەرەو ڕووانگەی تازەیان ئەکەونە ڕێگە بۆ پەرستنی خوایەکی تەنها بەیاسایەکی تەنهاوە لەسەر زەویەکی تەنها کەنیشتمانی گیانی موسوڵمانانە ، ئەو پەرستنە پەیکەری بیروباوەڕێکی تەنهاو دەستوورو نیشتمانێکی تەنهایان بۆ دروست ئەکات ، موسوڵمانان ووشیارئەبنەوە بەڕەگەز و هەرێم و زمان وڕەنگی جیاوازیانەوە ، کەپەرستنی خوایەکی تەنها ، ئایین ونیشمانێکی تەنها کۆیان ئەکاتەوە ، بەئەندازەی چڵە پووشێ کەم و کوڕی‌و دەست درێژی بکرێتە سەر ئەو یەکێتی‌یە ، پێویستە لەسەر هەموویان بۆ پاراستنی ئەو کۆمەڵگا گەورەیە خۆیان ببکەن بەقۆچی قوربانی و واز لەسوودی تایبەتی خۆیان بهێنن بۆ ئەو سوودە هاوبەشە ، موسوڵمانی ڕاست پێویستە بەو جۆرە بێ .

﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِنْكُمْ ﴾ وەچاکەی خۆمم بەڕەسایی و تەواوی ڕژان بەسەرتانا هەروەکو ئێمە ڕەوانەمان کردووە لەنێو ئێوەدا فروسادەیە لەئێوە .

﴿ يَتْلُوا عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا﴾ بخوێننەوە بەسەر ئێوەدا ئایەتەکانی نامەی ئێمە . یانی ئەوکارە کارێکی بەکەس نەکراوە ، وەبەکەس ناکرێ جگە لە پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ بەو نەخوێنەواری‌یە ئایەتەکانی قورئانتان بەسەرتانا دەخوێنێتەوە ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەرە .

﴿وَيُزَكِّيكُمْ ﴾ وەئەو فروسادەیە بەهۆی ئەوئایەتانەوە ئێوە پاك ئەكاتەوە لەبت پەرستیو هاوبەش دانان بۆ خوا و لەڕەوشتی خراپ و داوێن پیسی ، بەوبۆنەوە ئەبن بە خاوەنی ئاینی ئاسمانی .

﴿ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتابَ ﴾ وەئێوەە فێری نامەی ئێمە ئەكات كەیاسایەكی خوایەو بنچینەی یەكسانیو دادپەروەریە لەنێو ئادەمیزادا.

﴿ وَالْحِكْمَةَ ﴾ وەفێری هەموو شتێكی دانراو لەشوێنی خۆیدا لەگفتوگۆ كردنتانا ئەكا كەبەچاكی تووشی بن ، وەوازیش لەنەزانی و خراپەكاری ئەهێنن . وەزانایان لەماناووشەی (الحكمه) فەرمودەیان زۆرە ، ڕەواترینیان ئەوە بوو باس كرا .

﴿ وَيُعَلِّمُكُمْ مالَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴾ وەئێوە فێری شتێ ئەكا كەنەتان زانیوە ، هەرچەندە بیری لێ بكەنەوە نایزانن جگەی لەوەی ئەگەر پەیامتان بۆنەیەت .

ئەوەی ڕاستی بێت ئەو شتانەی خوا فەرمووی هاتنە دی ، پێغەمبەر مزگەوتی مەدینەی كرد بەزانكۆیەكی بێوێنە ، بەهەزاران زاناو گەورە پیاوانی لێدەرچووە هەریەكەیان شایستەی پێشەوایەتی نەوەیەكیان هەبووە ، لەبەر ئەوەی فێری ئەو یاسایانەبوون كەلەقورئانی پیرۆزدا هاتووە ، وەماوەیەكی زۆر كەم ئەو ئاینە پیرۆزە دەسەڵاتی دادپەروەری خۆی كێشا بەسەر نیوەی ئاوەدانیدا ، زمانی قورئان پەرەیسەندو نرخیبەرز بوویەوە .

بێگومان ئەگەر پێغەمبەر نەبووایە عەرەبەكان نەمێژوو نەكەلەپووریان نەئەبوو ، جگە لەباسی بت پەرستیو داوێن پیسیو نەزانین و تاوان و كوشتن و برین و زیندەبەچاڵ كردنی كچان هیچی تریان بەجێ نەئەهێشت ، بەڵام پێغەمبەر خەڵات و چاكەیەكی زۆر گەورەیە نەك بۆعەرەبەكان بەتەنها ، بەڵكو بۆ هەموو ئادەمیزاد بەبۆنەی ئەوەوە فێری زانین و پێش كەوتن و شارستانیو مرۆڤایەتیو ڕێزی مرۆڤ بوون ، وازیان هێنالەستەم و دڕندەییو نرخ دانەنان بۆ ئادەمیزاد ، هەموو مرۆڤێكی خاوەن دانا ناتوانن دژی ئەو

ڕاستی‌یە بوەستن بەتایبەتی زۆرتر لەزانایانی ڕۆژئاوا لەکۆنەوە هەستیان بەو ڕوداوانەکردووە بەفەزڵی ئیسلامی ئەزانن ، ئەگەر بەتاقی کردنەوەی موسوڵمانان نەبوایە هەرگیز فێری ئەو ڕاستی‌یە نەئەبوون ، چمکێ لەوباسانە کەنامەی (الاسلام والعقل) باسی کردووە ، لەبەر ئەو چاکە گەورانە خوا ڕژاندویەتی بەسەر موسوڵمانانندا فەرمووی :

﴿ فَاذْكُرُونِي ﴾ دوایی ئێوە بیربکەنەوە بەپەرستنی من ، داوای لێبووردنم لێ‌بکەن ، فەرمانەکانم بەجێبهێنن لەقەدەغە کراوەکانم دووربکەونەوە .

﴿ أَذْكُرْكُمْ ﴾ من یادی ئێوە ئەکەم بەمیهرەبانی خۆم لێتان خۆش ئەبم و پاداشتان ئەدەمەوە ، دەرگای بەختیاری هەردووجیهانداتان بۆدەکەمەوە .

﴿ وَاشْكُرُوا لِي ﴾ وەئێوە سوپاسی من بکەن لەسەر ئەوەی ئایینی ئیسلامم بۆناردوون وەموحەممەدم کردووە و بەپێغەمبەرو بەرابەرتان .

﴿ وَلاَتَكْفُرُونِ ﴾ وەئێوە بێ‌سوپاسی من مەکەن و دژم مەوەستن ، دوژمنایەتی من و فروستادەکەم مەکەن ، ئەگەر سوپاسی من بکەن بەزەیی‌و میهرەبانی من پترئەبێ ، هەروەکو بێ سوپاسیم بکەن سزام بۆتان زۆرتردەبێت لەهەردوو جیهاندا .

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾
وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن
لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ
وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ

﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٌۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ١٥٧﴾

﴿يا أَيُّها الّذينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ﴾ ئەی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە داوای یارمەتی بکەن لەو کارانەی ئەیکـەن لەوانـە نەیکـەن بـەهۆی ڕاگرتـن و ئـارام گرتنتـان بەیادکردنی من و سـوپاس کـردنم بـەجیٚهێنانی پەرستنەکانی مـن وەکـو ڕۆژووگرتنتـان کۆشش کردنتان بۆبەرزکردنەوەی ئاینی ئیسلام ، گوێتان لەتانەی دوژمنان نەبێت واز لەو شتانە بهێنن خوا قەدەغەی کردووە .

﴿وَالصَّلاةِ﴾ وەداوای یارمەتی بکەن بەهۆی کردنی نوێژەوە کە گـەورەترین بنچینـەی ئیسـلامە لەپەرسـتنی خـوادا ، پـەیژەی هـەموو باوەڕدارێکـە بۆبەدەسـت هێنـانی هـەموو چاکەیـەك و بـەرەنگاری هـەموو خراپەیـەك ; لەشـەو ڕۆژێکـدا پێـنج جـار ئەپارێنـەوە بەکزۆڵیەوە ، بۆیە خوا ئەفەرمووێ :

﴿ إِنَّ اللهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ بەڕاستی خـوا لەگـەڵ ئـەو کەسـانەیە خۆڕاگـرن ، بـەهێزی باوەڕی پاکیانەوە زاڵ ئەبن بەسەرخۆیان و خراپەناکەن ، هەموو فەرمانەکانی بـەجیٚدەهێنن بۆبەختیاری خۆیان و موسوڵمانان هەوڵ ئـەدەن و ناوەسـتن ، هـەندێجار بـەو کەسـانەیان ئەوت لەرێگەی خوادا خۆیـان ئـەدا بەکوشـت : مـردن توشـیان ئـەبوو ، لـەنازو خـوان ڕابواردنی جیهانی ئەبوون ، بەبێ سـوود خۆیـان ئـەدەن بەکوشـت ، خـوای گـەورە ئـەو گفتوگۆیەی قەدەغە کرد و فەمووی:

﴿ وَلاتَقُولُوا لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللهِ أمواتُ ﴾ وەئێوە مەڵێن بەو کەسەی ئەکوژرێن لەڕێگەی خوادا : ئەو کەسانە مردوون خۆشی و ڕابواردنی دونییان لەکیس چووە .

﴿ بَلْ اَحياءٌ ﴾ بەڵکو ئەو کەسانە زیندوون ، پاداشتیان وەکو زیندووان بنەبڕ نەبووە ، لەوەرگتنی پاداشت وەك زیندووان ، بەوێنەی مردووانی تر نین بەشیان لەکارکرندا نەمابێت ، چونکە ئەوکەسانە بۆ پشتیوانی کردن لەئاین کوژراون ، هەتا ئەو ئایینە بەردەوام بێت ، هەتا ڕۆژی دوایی هەرکەسێ تر خۆی بدات بەکوشت لەو ڕێگەیە ئەوان بەشداری چاکەی ئەوانن ، چونکە ئەوان ئەو ڕێگەیەنەیان بۆ ئەوان داناوە ، ئەمانیش چاویان لەوان کردووە. زیندوون بۆیە نایان شۆن ولەوبەرگانەی تیایدا کوژراون ئەنێژرێن، شۆردن بۆ پاك کردنەوەی مردووانە، ئەوان پاکن، بۆ کوشتنیان دڵگیرمەبن، زیندوون و هاوبەشی خێزان ودۆست وخۆشەویستانی خۆیانن. جویێ بوونەوەیان لاتان گران نەبێت .

﴿وَلكِنْ لاتَشْعُرونَ ﴾ بەلام ئێوە هەستی پیێ‌ناکەن زیندوویان چۆنە ، بزانن ئەوان لەژیانێکی خۆشدان و ئەقلی ئێوە ڕێگەی پیێ نابات . ئەم ئایەتە دەربارەی (١٤) نەفەر کەکوژرابوون لەجەنگی بەدردا لەکۆچ کران و (٨) نەفەر لەیاریدەدەران بەتایبەتی ، بەگشتی ئەوانیش ئەگرێتەوە لەڕێگەی خوادا ئەکوژرێن بۆپاراستنی ئیسلام لەهەموو سەردەمێکدا لەهەر ڕێگەیەکی تردا بێت کەڕاستی و دادپەروەری و مرۆڤایەتی بگرێتەوە بیەویێ بچەسپێنرێت بالەخانەی خۆیاندا بکوژرێن ، یابەرگری لەداگیرکەرانی نیشتمان بکەن ، ئەو جۆرە ژیانەی ئەوان لەسەرینی و بەچ شتیێ ئەژین ، و چۆنی ئەخۆن ئێمە نایزانین وەباسی ناکەین و داوای ناسینمان لیێ‌ناکرێت .

﴿ وَلنبلَوَنَّكُمْ بِشَيءٍ مِنَ الْخَوفِ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ئێوە تاقی ئەکەینەوە بەشتێکی کەم لەترسانتان لەجەنگی دوژمناندا ، ئەو ڕستەیە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە ترسیان لەدوژمنانیان زۆر کەمە بەرانبەر ئاسایشیان و پاداشتیان .

﴿ وَالْجُوعِ ﴾ وەبەکەمێکیش لە برسێتی ، ئەم وشەیەش پێشەکی موسڵمانان ئاگادارئەکاتەوە هەتا خۆیانی بۆ وریابکەنەوە ، وەکاتی توشبوونیان خۆیانی بۆ ڕاگرن .

نەوەك کتوپڕ بکەون بەسەریا و سەرگەردان بن لەناکاودا .

﴿ وَنَقْصٍ مِنَ الأَمْوالِ ﴾ وەبەکەمێکیش لەکەم بوونەوەی دارایــی و ســامانتان بــەهۆی دزین و پەلاماردانو تالآنی ستەمکاران و لەناوچوونی دارایتان بەکۆچ و دەربەدەریتان .

﴿ وَالأَنْفُسِ ﴾ وەبەکەمێکیش لەکەمبوونەوەی خۆتان بەکوشتن و مردنتان و نەخۆشــی و پیریو جەنگتان لەرێگەی خوادا .

﴿ والثَّمَرات ﴾ وەبەکەمێکیش لەتیاچوونی بەرهــەمی خورمـاو تـریّ و درەختـانی تـر لەناوچوونی دانەوێلّە بەهۆی سەرماو گەرماوبا وکولەو نەخۆشی تریانەوە .

﴿ وَبَشِّرِ الصَّابِرينَ ﴾ وەتۆ موژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرو ئارام گـرن لــەو تـەنگ وچەلّەمەیە توشی ئەبن ، یانیّ وەك لەمەودوا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە ئەو کەسانە جێگەی ڕێـز و میهرەبانی پەروەردەکەری خۆیانن .

لەبر بەرزی پلەی خۆڕاگری خـوای گـەورە لــە قورئـانی پـیرۆزدا (٧٠) جـار باسـی فەرمووە ، بۆیەش لەسورەتی (العصر)دا ئارامگرتنی دەستە مل کردووە لەگـەلّ ڕاسـتیدا ، ئەو ئایەتە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە هیچ کەسیّ ناتوانیّ بلّـیّ : دوای ڕاسـتی کـەوتووم هـەتا خۆی و خێزانیو سەروەت و سامانی لەرێگەی ڕاســتیو ڕەوادا دانـەنیّ ، ئەگـەر وانـەبیّ پشتیوانی ڕەواو ڕاستی نەکردووە ، هەموو کاتیّ هەتا کارو فرمان ڕەواتربێــت ، خۆدانـان بۆی گەورەتر ڕەواترو ئەبیّ ئەگەر وانەکا بۆ یاریدەدەری ڕاستی چ ڕێزێکی بینـراو ئـەبیّ ؟ وەپیّی جویّ ببێتەوە لەخەلّکی تر ، هەروەها ئـەو ئایەتـە ئاگادارمـان ئەکاتـەوە بەهەشـت قەدەغەیە بۆ هەموو کەس هەتا وەکو خۆی نەرەنجێنیّ لەرێگەی خوادا ، خۆدانــانیش بـەوە نـابیّ تەنـها خـۆی بـدات بەکوشـت لەجـەنگدا ، یابەکۆشـش لـەدژی بـت پەرسـتان و بیّباوەڕان، بەلّکو هـەموو ناخۆشـیـیە توشـی بـیّ بـۆ هـەموو ڕێگەیـەکی ڕاسـت و ڕەوا خۆدانانە لەرێگەی خوادا ، ئەکریّ بەنرخی بەهەشت بۆی بگرە هەر گفتوگۆیـەك لــەدەمی دەرچیّ و بتەقێتەوە بـەدەم خراپـە وێژانـەوە و یـاریدەدەری چاکـەکاران بـدا بـەخۆدانان ئەژمێریّ لەرێگەی خودا ، ئەو کەسەی سزای ئەدریّ بۆ بەرزکردنەوەی دروشمی ئیسلام و

خۆڕاگرنەبێ ، بابەچەوسانەوە بێت لەڕێگەی دادپەروەریدا بەهەشتی لێقەدەغەیە . بەلانی کەمەوە ئەبێ خۆڕاگربێ لەگەڕانـەوە لـەبێ فـەرمانی خـوا ، یـا خـۆی ماندووبکـات بـۆ بەختیاری کەسانێکی تر جگە لەخۆی ئیتر بابـاوك و نەوەکانیشـی بێـت ، کەواتـە نـرخ و پاداشتی توشبوونی و ئارامگرتن لەسەری لای خوا بەهەشتە .

﴿ الَّذينَ إذا أصابَتْهُمْ مُّصيبَةٌ ﴾ ئەو ئارامگرانە کەسانێکیئەوتۆن هەرکاتێ توشی ئـازارو ناخۆشی و ژان بوون بەهۆی کوشـتن و دەربـەدەری و کـەم بوونـەوەی دارایـی خۆیـان و بەرهەمیانەوە ، یاتوشی برسێتیو ترس بوون .

﴿ قالُوا إنَّا لِلّهِ ﴾ ئەڵێن بەڕاستی ئێمە بـەندەی خوایـن هەمـوو سـامان و دارایمـان هـی خوایە ، بیەوێ ئەمان داتێ ئەمانهێڵێتەوە و ئەوەی لەکیسمان ئەچێ پێمـان ئەبەخشـێتەوە . بۆیە خۆمان تێك نادەین و ئارام ئەگرین ، ئەگەر بژین خوا ئەمان ژێنێ ، وەئەگەر بشـمرین خوا ئەمان مرێنێ و بۆی لای ئەو ئەچین و پاداشـمـان ئەداتـەوە ، بەهـەموو فـەرمانێکی ئـەو ڕازین ، هەر شتێکمان بداتێ بەگەورەیی خۆیەتی وەك ئەفەرمووێ :

﴿ وإنَّا إلَيهِ راجِعُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە بۆلای خوا ئەگەڕێینەوە لەڕۆژی دواییدا ، بڕوای تەواومان هەیە زیندوو ئەبینەوە بەدڵمان ، وەك بەزمان ئەیلێین .

باوەڕدارانی ژێـر کـاتی تـوش بونـی ناخۆشـی و نەخۆشـی خۆیـان لـەئاین دەرناکـەن بەگفتوگۆی خراپ و بێ بـاوەڕیی و نـەزانین . بـەڵام مرۆڤـە ئـەقڵ سـوکەکان و کـەم باوەڕان شەیتان سواریان ئەبێ و بەرێگەی بێ باوەڕی وجنێو دان و گفتوگۆی ناڕەوا ئەیانبا و ئەیخاتە زبڵخانەی پەستی و نادانیەوە و وایان لێدەکا بەهەڵەشـەیی خۆیـان واز لـە خـوا پەرستی بهێنن ، وەك زۆرجاران لەزۆرترین ئادەمیزادی نەفامەوە ئـەبینرێ وە نـا سوپاسـی بەدەمیاندا دێ .

﴿ أولئك عليهم صلوات من ربهم ﴾ ئەو کەسانە لەکاتی ناخۆشیدا ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا چەندین پلەی بـەرز و ڕێزگرتـن ئـەڕژێ بەسـەریانا لەلایـەن پەروەردکـەری خۆیـان وەدڵیان خۆش ئەکا .

﴿ ورحمة ﴾ وە ئەڕژێ بەسەریانا بەزەیی و میهرەبانی وخۆشی هەردوو جیهان، تۆڵەی ناخۆشی ڕابوردویان بۆ ئەکاتەوە .

﴿ وأولئك هم المهتدون ﴾ وەئەوکەسانەی توشی ناخۆشی بوون و ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا هەر ئەو کەسانەن ڕانمویان وەرگرتوە بۆ لای چاکە وەڕێگەی هەموو چاکەیە ئەدۆزنەوە، ڕێگەی خۆیانیان گرتوە بۆ لای بەهەشت.

خوای گەورە (٨) هەشت جۆر لەپاداشت و ڕێزی بەخشیوە بەو کەسانە ئارام گرن: خۆشەویستی ، یاریدانیان ، چەندین کۆشك لەبەهەشت ، پاداشتی زۆر گەورە ، مۆژدە پێدانیان ، پلەی بەرز ومیهرەبانی ، ڕانمویی کردنیان .

إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ
فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ
بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾

﴿ إِنَّ الصَفا و المَروة مِنْ شَعائِرِ الله ﴾ بەڕاستی ئەو دوو کێوەی سەفاو مەڕوە و گەڕان لە نێوانیاندا نیشانە و دروشمی پەرستنی خوان.

﴿فمن حج البيت﴾ دوایی هەر کەسێ حەجی خانەی ماڵی خوای کردبێ بەو مەرج و کردارەی بۆی دانراوە بەجێی هێنابێ.

﴿ أوعْتَمَرَ﴾ یا عەمرەی کردبێ بەو جۆرەی فەرماندراوە جێبەجێ بکرێ .

زانایان لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چەند هۆیەکیان بۆ گێڕاوەتەوە و ئەوەی نزیك بێ لە بیروباوەڕەوە ئیسلام ئەیەوێت بچەسپێنرێ لە مێشکی موسوڵمانانی پێشودا لە

کۆچ کەران و یاریدەدەران بەتایبەتی لاسایی کردنەوەی بێ باوەڕان لــە پەرستندا ئەمەیــە: هەندێ لە موسوڵمانان بەلایانەوە گران بوو ڕاکردنیان لەناو سەفاو مــەروەدا کــە بــەر لــە موسوڵمان بوونیان ئەیان کرد ،چونکە بەسەریانەوە دانرابوو کە دوو بت وەکو ئەســاف و نایلە ،وە بێزیان ئەکردەوە دووای موسوڵمان بوونیان هەمان کردەوە دووبارە بکەنەوە .

مێژووی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ڕوون نەکراوەتەوە ، وادیــارە دوای فــەرمانداندان بە گۆڕینی ڕوانگە بۆلای کەعبــە هاتووەتــە خــوارەوە ،لەگــەڵ ئەوەیشــدا شــاری مەککــە لەوکاتەدا هەرچەندە جێگای جەنگ و ئاژاوە بوو بــەلام تــاك و تــەرا موســوڵمانان ئــەیان توانی حەج و عەمرە بەجێ بێنن وەهەر ئەوانەی پێشو بوون ئەو ڕاکرنەیان پێ ناخۆش بوو، خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکە ،بۆیە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە و فەرمووی ﴿فمن حج البيت. . . . .تا کۆتایی﴾.

پەرستنی خوا بەگوێرەی شێوە و کاتی کردنی ئەکرێن بەچــەند بەشــێکەوە :بــەگوێرەی کاتیان هی وایان هەیە لەهەموو شەوو ڕۆژێکدا دەبێ بکرێن وەك نوێژە فەرزەکان ، هەیانە هەفتەی جارێك وەك نوێژی جومعە ، هەیانــە لــە ســاڵێکدا جــارێك پێویســتە وەك ڕۆژو ، هەیانە لە هەموو تەمەندا جارێك پێویستە وەك حەج و عەمرە ، وەحەج یەکێکە لــەو پێــنج بنچینانەی ئیسلام کە بریتین لە :شایەتی دان ،زەکات دان ،گرتنی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان، نوێژە فەرزەکان ، بەجێ هێنانی حەج وعەمرە.

حەج لەچوار شتی سەرەکی پێك دێت: ئیحرام واتە نیازی کردنی حــەج ،وەســتان لــە عەرەفەدا ،گەڕان بەهەر چوارلای خانەی خوادا حەوت جــار ،ڕاکــردن لــە نێــوان ســەفاو مەڕوەدا حەوت جار ، عەمرەیش وەك حەج وایە بەلام وەستانی عەرەفە بۆی پێویست نییە بە درێژی لە کاتی مانا کردنی ئایــەتی (١٩٦)وئایەتــەکانی دوایــی لــەم ســورەتەدا باســی دەکەین ، پەرستنی خوا بەهەموو جۆرەکانییەوە و حەجیش بگریتەوە جۆری بەجێ هێنانیان

جگە لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ گوێ بۆ هیچ شتێ تر ناگرین ،جێگەی کۆشش و خۆماندووکردن و ئیجتیهاد نییە.

﴿فَلا جُناحَ عَلَيه انْ يَطَّوَّفَ بِهِما﴾ دوایی هیچ گوناهێ لەسەر ئەو کەسە نییە وەك جارانی پێش و تەواف بکات ڕابکات لەنێوان سەفاو مەڕوەدا ،یانی لای گران نەبێ و بێزی لێ نەکاتەوە .

لێرەدا لەوانەیە پرسیارێ بکرێ ئەم ئایاتە ئەوە ئەگەیەنێ ڕاکردنی نێوان سەفاو مەڕوە گوناهی تێدانیە و دروستە ،ئەوە ناگەیەنێ پێویستە بکرێ کەچی گومان لە پێویستی ئەودا نییە .

لە وەلامدا دەلێین : ئەم ئایەتە دەربارەی فەرماندان بە ڕاکردن لە نێوان سەفاو مەڕوەدا نەهاتووەتە خوارەوە پێویستە یان نا ؟بەلکو بۆ ئەوە هاتوەتە خوار کە پێمان ڕابگەیەنێ ڕاکردن لە ئیسلامدا کارێکی ڕەوایە و جۆرێکە لە پەرستنی خوا ،وە فەرماندان بەپێویست بوونی لە جێیەکی تردا خوا فەرمانی پێ ئەدا .

﴿وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْراً﴾ وەهەر کەسێ بە خوایشت و ویستی خۆی چاکەیەك بکات حەج و عەمرە بەجێ بهێنێ بێ ئەوەی لەسەری پێویست بێ و لەوەو بەر پێویستییەکەی بەجێهێنابێ .

﴿فَانَّ اللّهَ شاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا پاداشتی سوپاس کەران ئەداتەوە و لەوان ڕازییە لەسەر پەرستنیان و سوپاس کردنەکەیان لێ وەرئەگرێ ،و زۆر زانایە و ئاگاداری ئەندازەی کردەوەی ئەوانە و لە پاداشتەکانیان کەم ناکاتەوە و هەموویان ئەداتێ.

هەندێ لەو هاوڕێیانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ پرسیاریان کرد لە چەند کەسێ لە زاناکانی جولەکە دەربارەی هەندێ لە فەرمانەکانی خوا لەتەوراتدا ئەوانیش شاردیانەوە و پێیان نەوتن ،بگرە وتی وا لە تەوراتا نییە ،خوای گەورە بە درۆی خستنەوە و فەرمووی:

إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ
لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ
(١٥٩) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ
عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (١٦٠) إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ
كُفَّارٌ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ
(١٦١) خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ
(١٦٢)

﴿إن الذين يكتمون ما أنزلنا﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لە زاناکانی جولەکە و گاور ئەی شارنەوە شتێ ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەران لەنامەکانیاناو بەکەسی نالێن و حەشاری دەدەن .

﴿من البينات﴾ لە نیشانەو بەلگە ڕونەکانی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ و لە گۆڕینی ڕوانگە و هاتنی پەیام بۆی و لە بەردەباران کردنی ژن و پیاوێ کاری نالەبار و داوێن پیسیان کردووە .

﴿والهدی﴾ وەلەو بەلگانەیش ڕانومایی کەرن بۆ پێویستی پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و باوەڕهێنان بەموحەمەد ﴿ﷺ﴾ و قورئانی پیرۆز.

﴿ من بعد ما بیناه للناس ﴾ لەدوایی شتێ ئێمە ڕوونمان کردۆتەوە بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتی نەك بۆ ئەو کەسانەی ئەی شاردنەوە .

﴿ في الکتاب ﴾ لەنامەکانی تەورات و ئینجیل و هەموو نامەی پێغەمەرانی تر لەباسی پێغەمەران و فەرمانەکانی ئیسلام .

﴿ أولئك یلعنهم الله ﴾ ئەو کەسانەی ئەو ڕاستیانە ئەشارنەوە و زیندوون لەم ڕۆژەدا و وەلامی پرسیارکەران نادەنەوە ،خوا دوریان ئەخاتەوە لە میهرەبانی و لێبوردنی خۆی بەهۆی شاردنەوەی ئەو کارە ڕەوایانەوە ،وە سزای سەختیان ئەداو بێبەشیان ئەکات لە پاداشتی چاکەی خۆیان .

﴿ویلعنهم اللاعنون﴾ وە نەفرەت کەران نەفرەتیان لێ ئەکەن و بێزیان لێ ئەکەنەوە ،یانی ئەو کەسانەی خاوەنی هەستی ئاینین داوا ئەکەن لە خوا کە دوریان بخاتەوە لە لە بەزەیی و میهرەبانی خۆی لە هەموو فریشتەکان و ئادەمیزاد و دێو و درنج .

هەڕەشەی ئەو ئایەتە هەرچەند بۆ خاوەن نامەکانە بەلام هەموو کەسێ ئەگرێتەوە کە وەك ئەو کەسانە ڕاستی و کاری ڕەوا بشارنەوە کە ئەمانەن :-

١- ئەو کەسانە بۆ فەرمانەکانی ئاینی کە پرسیارێکیان لێ بکەن و وەلام نەدەنەوە و موسولمانان بەو وەلامە پێویست دار بن ،ئەو کەسانەی بەو جۆرە بن لە میهرەبانی خوا بێبەشن،فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە کەواتە با زانایانی موسولمان نەزانەکان فێری کاری ئاینی بکەن و ئەوانیش کەسانی تر فێر بکەن ،نابێ چاوەڕوانی کرێو پارە و پول بکەن،ئەگەر پێچەوانەی یاسای ئیسلام وەلام بدەنەوە سزادانیان سەختترە.

٢- پێویستە لەسەر موسولمانان بەتایبەتی مامۆستایان فەرمانەکانی خوا بۆ هەموو کەس ڕوون بکەنەوە لە هەموو کارێك و فرمانێکدا کە ڕویدا ،قەدەغەیە بیشارنەوە و نەیلێن ،بە

گوێرەی توانا دەریان بخەن بۆ دانیشتووان ، ئەو کەسانەی بتوانن و دەری نەبڕن بێ بەشــن لە بەزەیی خوا .

﴿ إلاّ الذين تــابوا﴾ ئــەو کەســانەی کــارە ڕەواکــان ئەشــارنەوە دوور ئەخرێنــەوە لــە میهرەبانی خوا جگە لـە کەسانێکی ئەوتۆ پەشێمان بونەتەوە لـەو شاردنەوەیە و هەموو ئــەو گوناهانەی پێویستیان بە پەشێمان بوونەوە هەیە و باوەڕ بە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ئەهێنن.

﴿ وأصلحوا ﴾ وە جگە لـەو کەسانەیش کار و خوڕەوشتی خۆیان چاك کــردووە ،ئــەو شتانەی تێکیان دابوو چاکیان کردوەتەوە بەردەوامیش بن لـەسەر ئەوەی جارێ تر نەچنەوە بۆ لای گوناه کردن .

﴿ وبينوا﴾ وە بە ئاشکرا ئەو شتانەی دایانپۆشیوون ڕوونیان کردبێتــەوە بـۆ ئـادەمیزاد ،نەك تەنها بەدەم پەشێمان ببنــەوە و کــردەوەی لـەگــەڵ نــەبێ ،ســودیان پــێ ناگــات هــەتا بانگەواز و جاڕی بۆ نەدەن ، دەنگی خۆیان بە باوەڕهێنان بە ئاینی ئیسلام بەرز نەکەنەوە.

﴿ فأولئك أتوب عليهم ﴾ دوایی ئەو کەسانە پەشێمان بوونەتەوە و ڕەوشتی خۆیانیــان چاك کردووە ،شاراوەکانیان ئاشکرا کردووە من پەشپێمان بوونەوەکــەیان لێ وەردەگــرم، وە بەزەیی خۆمیان بەسەردا ئەڕێژم.

﴿ وأنا التواب الرحيم﴾ وە هەر من بە زۆری پەشێمان بوونەوە وەرئەگرم لـە بەندەکانی خۆم ،زۆر میهرەبانم لـە گەڵیاندا ،یانێ پەشێمان بوونەوە لـەسەر ئەوانە ، وەمیهرەبانی لـەسەر منە.

﴿إن الذين كفروا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بێباوەڕبوون بەردەوام بوون لـەسەر بــێ باوەڕی ، لـە دوای شاردنەوەی کارە ڕەواکان ،وە پەشێمان نەبنەوە ، وە کارە خراپەکانیان نەسڕنەوە ، و بۆ دانیشتووانی ڕوون نەکەنەوە .

﴿ وماتوا وهم كفار﴾ وە ئەو کەسانە مردبن ،ئەوان هەر بێ باوەڕ بووبــن ،نەگەڕانــەوە بۆلای خواو ،خۆیانیان چاك نەکردەوە ، و بۆ دانیشتووانیان ڕوون نەکردەوە فەرمانــەکانی خوا .

﴿ أولئك عليهم لعنة الله والملائكة والناس أجمعين ﴾ ئەو کەسانە لەسەریانە پاش مردن بێ بەش بوون و دوور خستنەوە لە میهرەبانی و بەزەیی خوا ،لەسەریانە نەفرەتی فریشتەکان و هەموو ئادەمیزاد بە گشتی ،یانێ لە خوا ئەپاڕێنەوە دوریان بخاتەوە لە بەزەیی خۆی ،واتە جێگەی ئەوەن نەفرەتیان لێ بکرێ لەلای دانیشتوانی ئاسمان و زەوی .

﴿ خالدين فيها ﴾ بەردەوامن ئەو کەسانە لە نێو دورخستنەوەلە بەزەیی خوا ، وە شایستەی ئەوەن بخرێنە دۆزەخەوە بە بەردەوامی .

﴿ لا يخفف عنهم العذاب﴾ سوك ناكرێ بۆ ئەوان سزای خوا ، لە سەریان هەڵناگیرێ چاو تروکانێ .

﴿ ولاهم ينظرون ﴾ ئەو کەسانە مۆڵەتیان نادرێ ئەگەر داوای مۆڵەت بکەن وە بە چاوی میهرەبانی سەیر ناکرێن ،ناگەڕێنەوە بۆلای جیهان و پەشێمان بوونەوەیان لە کیس چووە ، بیبانویان نەماوە ، بۆیە سزا ئەدرێن هەتا هەتایە لەو سزایە ڕزگاریان بێ توشی سزایەکی تری گرانتر ئەبن و پشوی خۆشی نادەن ، ئەو کەسانەی گوناه بکەن و بەردەوام بن لەسەری و پەشێمان نەبنەوە ئەوە ئەگەیەنێ بڕوایان بە سزای ئاگر نیە ، مرۆڤ دەست بە کونێکا ناکا بزانێ مارێکی تیایە ئیتر چۆن ئەبێ واز لە گوناه نەیەنێ و پەشێمان نەبێتەوە .

زانایانی جولەکەو گاور سودیان لە زانینەکەی خۆیان وەرنەگرت ، گومڕا بوون و کەسانی تریشیان گومڕا کرد ،بۆیە خوای گەورە ڕیسوای کردن و لە میهرەبانی خۆی دوری خستنەوە ،با ئەمەیش بزانین کە هیچ گەلێ لەناو ناچێ بە سزای خوا بە بێ هۆی شایان ، بەڵام لەناو ئەچێ بە ستەمکاری کاربەدەستان بە بێگومان ، زانایان و مامۆستایان هەتا ڕێگەی ڕاست نەگرن قوتابیەکانیان ڕێگەی ڕاست ناگرن ، کەواتە سزا و نەگبەتی بەسەر گەلی بێ چارەدا لە ئەمڕۆدا بەهۆی ستەمکردن و گێرەشێوێنی کاربەدەستانیانەوەیە ، ژێر دەستەکانیان بە دوکەڵ و ئاگری جەنگ ئەسوتێنن لە جیهاندا ، بەڵام بێگومان لە

پاشەڕۆژدا فەرمانڕەواکانیان زۆر بەبێ نرخی لە ئاگری دۆزەخدا ئەبرژێن وزوخاوی خۆیان ئەخۆنەوە ئەو ڕستەیە کەس ناتوانێ سەری بۆ شۆڕ نەکات ،چونکە بەچاو ئەبینرێ چۆن ژێر دەستەکانیان توشی کوشتن و سوتان ئەکەن لەپێناوی ئارەزووی پیسی خۆیاندا، هەروایشە گومانتان نەبێ بۆ سزادانی کاربەدەستەکانیان .

نەفرین لەکەسێکی بێ باوەڕی نەناسراو دروست نی‌یە ، چونکە لەوانەیە بە باوەڕەوە مردبێ بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نەفرەت لە هەموو بێ باوەڕان دروستە ، بە تایبەتی ئەو کەسانەی گوناه کردن بە پێشکەوتن ئەزانن .

خوای گەورە پاش باس کردنی ڕووانگە و باسی پاش و پێشەکەی : باسی دوو شتی تری زۆر گرنگمان بۆ ئەفەرموێ ، بۆ دامەزراندنی باوەڕمان و لە دەست نەدانی یەکەم: باوەڕهێنان بە تاك و تەنهایی خوا ،دووەم : بیر کردنەوە لە بونەوەر سەرسوڕهێنەرەکانی خوا بەتایبەتی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و گۆڕانی شەو و ڕۆژ ورۆیشتنی کەشتی بەناو ئاودا بۆ سودی ئێمە و بارینی باران و هەڵکردنی باو وەستانی هەور ، هەتا بیانکەین بەبەڵگە و بۆخۆمان خوایان پێ بناسین ، جولەکەکان وازیان نەهێنا و چەنەبازییان ئەکرد لە خزمەت پێغەمبەردا﴿ ﷺ﴾ لە پەیڕەوی نەکردنی ئەودا و خۆیان بەزل ئەزانی هەتا وایان لێهات ڕۆژی بە پێغەمبەریان ﴿ ﷺ﴾ ووت : ئەم خوایەی تۆ چۆنە؟ بۆمانی باس بکە ، ئەگەر ڕاست ئەکەیت ئادەی بەڵگەیەکمان بۆ بهێنەرەوە هەتا بیناسین ،خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾
إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ
وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ

مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾

﴿ وإلهكم إلهٌ واحد ﴾ وە ئەو خوایەی شایستنەی پەرستن بێ بۆ ئێوە خوایەکی تەنهایە ، هاوبەشی نیەیە و نابێ ، بێ وێنەیە لە هەموو ڕوویەکەوە .

﴿ لا إله إلاّ هو ﴾ هیچ کەسێ نیەیە بپەرسترێ جگە لەو خوایە ، کەواتە بیپەرستن و بە ئومێدی کەسی تر مەبن و لەکەسی تر مەترسن و کەسی تر مەپەرستن .

﴿ الرحمن الرحيم ﴾ خوایەکە ئەوپەڕی بەخشندەو میهرەبانە بۆ هەموو گیانەوەران وە ئەوپەڕی خاوەن بەزەیی‌یە ، بەچاکی بیناسن ، ئەو شتانەکە لەمەوپاش باس دەکرێن بەڵگەن لەسەر تاك و تەنهایی خوا و لەسەر توانای بەرزی ، زۆر بەباشی بیر بکەنەوە، ئەوەتە خوا ئەفەرموێ :-

﴿ إن في خلق السماوات ﴾ لەنێو دروستکردنی ئاسمانەکان و ئەستێرەکانی سەرەوە ، بەئەوپەڕی وەستان و ڕاکێشانی یەکتری بەجۆرێکی شیاو بۆهەر یەکێکیان .

﴿ والأرض ﴾ وەلە دروست کردنی زەوی و ئەو شتانەی بەسەر زەوی و لەناوەوەی زەوین ،وە ئەو شتانەی لە زەوی دەرئەهێنرێن بۆ سودی ئادەمیزاد .

﴿ واختلاف الیل والنهار ﴾ وە لەگۆڕینی شەوو ڕۆژو هاتنەوەیان بەدوای یەکدا بەوچەشنە ڕێك و پێکە کاتی هیچیان دەست درێژی ناکاتە سەر کاتی ئەوی تریان هەم لەجیاوازیانا وائەبێ یەکێکیان کاتەکەی درێژ ترە لەوی تریان، وایش ئەبێ شەوی جێگەیەك بەڕۆژی جێگەیەکی تر پڕ بکرێتەوە .

﴿ والفلك التي تجري في البحر ﴾ وەلەو کەشتی‌یە بارگرانەدا کە ئەڕۆن بەنێو دەریادا لەملاوە بادەیبات بۆ ئەو لایەی تر .

﴿ بما ينفع الناس﴾ بەو شتەوە سوود ئەگەیەنیَ بەئادەمیزاد و لەکەل و پەل و پێویستی تر کەهەڵیان ئەگرن و سود ئەبەخشن بە ئادەمیزاد لە خواردەمەنی و پۆشاك و شتی تر .

﴿ وما أنزل الله من السماء من ماءٍ ﴾ وەلەشتێ خوا ناردویێتیە خوارەوە لەئاسمان لەئاویَ باران بەو هەموو سودانەیەوە .

﴿ فأحيا به الأرض ﴾ دوایی خوا بەهۆی ئەو ئاوەوە زیندوو ئەکاتەوە زەوی یانیَ ئەو ئاوە زەوی ئاو ئەداو گیا و درختانی بۆ ئەروێنیَ ، لەبەرو بومووو بەرهەمو میوە ودانەوێڵەکانی ئەخۆن خۆتان و ئاژەڵەکانتان و گلاَ و لقەکانی بەکارئەهێنن بۆ پێویستیەکانتان .

﴿ بعد موتها ﴾ دوای وشك بوونی گیا و کشت و کاڵی زەوی و وەرینی گەڵاکانی ئەو درەختانە .

﴿ وبث فيها من كل دابة ﴾ وەخوا لە زەویدا بلاَوی کردۆتەوە لە هەموو شتێ ئەروا بەسەر زویدا لە گیانەوەرەکان ، هەندێکیان بۆ بارلێنان و سواری ، هەندێکیان بۆ سوود وەرگرتن لە شیری و خوری و کۆرگ و موو گۆشت و ڕۆنیان هەتا دیَ .

﴿ وتصريف الرياح ﴾ وە لە بلاَوە پیَ کردن و گۆڕینی بایەکان لە جێگەی هەڵکردنیانەوە و ناردنیان بۆ باگوور و باشور و ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوا ، وە بەگەرمی و ساردی و توند و تیژی و لەسەرخۆییان .

﴿ والسحاب المسخر بين السماء والأرض ﴾ وە لەو هەورەی ڕام کراوەو ڕاگیراوە لەنێوان ئاسمان و زەویدا ، دروست کراوە بۆ بارینی باران ، دوای چڕ بوونی هەرگیز دوایی نایەت .

﴿ لآيات لقوم يعقلون ﴾ بێگومان ئەوشتانە چەندین بەڵگەن بۆ تاقمیَ بیر بکەنەوە و خاوەنی ئەقلَ بن ، یانیَ خوا ڕانموونی کەسانی تێگەیشتوو ئەکات بۆ ناسینی خواو توانای خوا و دانانی هەموو کاریَ لە جێگەی شیاوی خۆیدا .

خوێندەوارانی بەڕێزلەمەو پاش باسی شتیَ ئەکەین کە پەیوەندی بەناوەڕۆکی ئەو شتانەی پێشەوە هەیە :

١- ئەوەی ڕاستی بێ زۆرتر لە ژمارەی دانەی لم ئەستێرە لە ئاسماندا هەن ، بچوکترین ئەستێرە گەورەترە لە قەوارە و قورسی زەوی بەزۆر تر لە ملیۆنێ جار و هەموو کۆمەڵە ئەستێرەیەك کۆمەڵیەکی فرەو شارێکی گەورە پێك دێنن کە پێی دەوترێت (کاکێشان ) پتر لە سەد ملیۆن لەیەك کۆمەڵیاندا هەیە ، ژمارەی ئەو شارانە زۆرن زۆرترن لە دوو ملیۆن شار ، دووری هەر شارێ لەوەی تریانەوە بە ئەندازەی گەیشتنی بێ تەلێکە بگاتە نیشانەی خۆی دوای (٣) ملیۆن ساڵ ، واتە ڕێژەی ئەو شارانە بەرانبەر بە بۆشایی وەك مێشولەیەکە بەسەر گەردانی بسوڕێتەوە بەسەر زەویدا بەرانبەر بە خڕۆکی زەوی ، وە ئەو هەموو ئەستێرە و کاکێشانە ئەڕۆن بەڕێوە بەچەشنێکی ڕێك و پێك، پێویستە بزانین ئەو شتانە یەك نمونەن لە بلیۆن بلیۆن کە بەڵگەن لەسەر گەورەیی و بێ هاوتایی خوا کە زانایانی تازە ڕێگەیان پێ بردووە ، قورئانی پیرۆز ڕوو ئەکاتە زانایان کە ئەو کارانەیان دەرخستووە و ئەفەرموێ ﴿ وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ وە نەبەخشراوە بەئێوە جگە لە هەندێ زانیاری کەم.

٢- زەوی گۆێگە لە بۆشایی‌دا هەڵواسراوە و ئەسوڕێتەوە بەدەوری خۆیا لە بیست و چوار کاتژمێردا یەکجار شەو و ڕۆژ پەیدا ئەبێ و بە دەوری خۆریشا ئەسوڕێتەوە لە ساڵێکدا یەکجار چوار وەرزە پێك دێنێت بە گوێرەی دوور و نزیکی لە خۆرەوە ، پەردەیەکی گازی چوار دەوری زەوی داوە ، چەند گازێکی پێویستی تری بۆ ژیانی گیانەوەران تێدایە ، ئەو پەردە گازانە پلەی شیاو بۆ ژیان ئەپارێزن ، هەڵمیش هەڵ ئەگرێ لەکەناری زەریا و دەریاکان و ئەیبا بۆ شوێنە دورەکان و چڕ ئەبێ و ئەبێ بەباران و ئەڕژێ بەسەر شوێنە وشکەکان و ئەیان ژێنێتەوە ، تیرەی زەوی ئەگەر بچوکتر بێ لەوەی ئێستای یەکسانی‌یەکەی خۆی لەدەست دەرئەچێ ، بەپەلە ئەسوڕێتەوە و پلەی گەرما ئەوەندە بەرز ئەبێتەوە کە هەموو گیانەوەران بکوژێ ئەگە تیرەکەی ( یەك قطر) لە ئێستا زۆر تر بێ کێش کردن و ڕاکێشانی بۆ تەنەکان زۆر تر ئەبێ و کار ئەکاتە سەر ژیان و سەر ڕووبەری

زەوی ، دووری زەویش لە خۆرەوە لەمەی ئێستای زۆرتر ئەبی، وەرگرتنی گەرما لەخۆر کەمتر ئەبێتەوە ، ئەگەر نزیکتر بێ پلەی گەرما بەرزتر ئەبێ ، هەرچۆنیبێ لەو دوو چەشنەدا ژیان لەسەر زەوی نامێنێ کەواتە خڕی زەوی و چێوەی بۆشایی دەورەکەی و گەڕانی بەدەوری خۆردا بەم چەشنەی ئێستای داپۆشینی چواردەورەکەی بەو پەردە گازانە و دانانی لەو جێگە تایبەتی و دیاری کراوەدا و بوونی تیرەکەی بەو ئەندازەیەی ئێستای ئەوانە هەموویان هۆی ژیانن بۆ گیانەوەران پێك هاتوون یەکێ لەوانە لەناوچن ، واتە زەوی تەخت بێ یا بچوکتر یا گەورەتر ، دوورتر یا نزیکتر بێ لە خۆرەوە ، یا پەردەی گاز نەمێنێ ، ژیان بۆ گیانلەبەران نامێنێ ، کەوابوو چۆن ئەچێتە عەقڵەوە ئەو بونەوەرانە بەرێکەوت و بەبێ هەڵسوڕاندنی هەڵسوڕێنەرێکی وا هەموو شتێکی لە جێگەی شیاوی دانابێ و بیان بات بەرێوە بەوجۆرەی باسکران پەیدا بن و بەرێك وپێکی کاری خۆیان بکەن و بچن بورێوە و لەیەك ئاڵۆز نەبن ، بێگومان ئەوانە بەڵگەن لەسەر توانای خوای مەزنی بێ وێنە .

٣- بەو ئایەتە پێشووانەو ئەوانەی باسکران بۆمان ڕوون ئەبێتەوە ئەم بونەوەرە فراوانە بەوجۆرە ڕێك و پێك و سەرسوڕهێنەرە نابێ بە ڕێکەوت و هەر لە خۆیانەوە بۆخۆیان دروست بووبن ، چارە نامێنێ و پێویستییان بە بەڕێوەبەرێکی خاوەن هێز و توانایە ، بەڵام هەندێ لە بێ باوەڕان ئەڵێن : هۆی زانین و ناسینی هەموو شتێ بەبینین و تاقی کردنەوەیە، هەر شتێ بەوانە نەزانراوو نەناسراو پێی ناوترێ زانست ، یانێ ( علم) وەباوەڕ یانی (عقیدة) لەیەك جیاوازن بەلای ئەو کەسانەوە یانی بوونی خوا باوەڕە نەك زانست ، بەوچەشنە ئەو کەسانە ئەڵێن ئەبێ بەلای ئەوانیشەوە نەبونی خوایش هەر باوەڕبێ نەك زانست ، چونکە بوون و نەبوونی خوا هەردوولایان بینین و تاقی کردنەوە نایان گرێتەوە کەواتە بوون و نەبوون هەر باوەڕن ، بەکورتی بوونی خواو هەمو ئەو شتانەی لەبەر چاونین و هەواڵەی نادیاری ئەکرێ (الغیب) ئەو کەسانە باوەڕیان بە خوا

هەیە باوەریان بەو شتە هەیە پێی ئەوتری نادیاری ، بوونەکەی خوایان بە تاقی کرنەوە نەزانیوە ، ئەو دوو تاقمە یەکسانن لە باوەریاندا بە نادیاری :

دوای ئەو کێشەیەو ئەو پێشەکی‌یە باسکران با بزانین بی باوەران ئەلێن پەیدا بوونی گیانەوەران بەم رێك و پێکی‌یەوە کە هەن بەبێ ئالۆزییان لە یەکتری مرۆڤیش بەو هەموو هەست و ژیری‌یەوە هەیەتی دروستکەر و هەلسورێنەریان نی‌یە ، بەلڵك و هەر لە خۆیانەوە بۆ خۆیان پەیدابوون (الصدفة) یانی بوونەوەران و قەتارەی ریزیان و رێك و پێکیان لە جێگەی شیاوی خۆیان گرتویانە بەرێکەوت دروست بون ، ئەلێن کەرەسە (المادة) بەبی عەقلّ و بەبێ گیان و بەبێ هەست و بە کوێری و بەکەرِی گیان و ژیان و ئەقلّی بەخشیوە بەهەموو زیندەوەران ،بە کورتی بەلای ئەو کەسانەوە کەرەسەی بێ عەقلّو بێ هەست هەر ئەو خوایەو توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە ،بەلاّم ئێمەی باوەرِدار پرسیاریان لێ ئەکەین ئەو کەرەسەیە چی‌یە؟ ئایا خۆی خۆی دروست کردووە یان نا؟ یا کەرەسە ی تر ئەوی دروست کردووە و هەروەها هەتا ئەروا نابرێتەوە .

باوەرِداران ئەلێن : بوونەوەران بەو چەشنە سەر سورِهێنەرانە و بەو هەست و ویست و ئەقلەوە کە ئادەمیزاد هەیەتی ، ئەو ریز و قەتارە بوونەوەران هەیانە و لەیەك ئالۆز نابن پێویستە خوایەك هەبێ ، بەرێوەبەر و خاوەنێکی خاوەن توانا و بەدەستەلاّت لەهەمو لایەکەوە و دروستی کردبن .

ئەی خوێنەواران خۆتان پرسیار لە خۆتان بکەن ،سەرچاوەی بوونەوەران و بەرێوە بردنیان لە چ لایکەوە هاتووە ؟ بەرێکەوتە وەك بێ باوەرِان ئەلێن یا بەهەست و ویستە وەك باوەرِداران ئەلێن ، خۆتان وەلاّمی خۆتان بدەنەوە بە پەیامی ئەقلّی خۆتان ، بەراستی بیری بوونی خوا پێویستە و ئاشکرایە ، بیری دژەکەی نەزانینە ، زانایان ئەلێن : ئایا تاریکی لە پێشا دروست بووە یان رووناکی ؟ بە جۆری تر ئایا شەو لە پێشەوە دروست بووە یان رۆژ ؟ زانایانی پێشوو دەلێن : شەو لە پێشەوە دروست بووە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ لە

ئایەتی (٣٧) ی سورەتی (یس) :﴿ وَ ايَةٌ لَهُمْ اللَيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَهارَ فَإذا هُـمْ مُظْلِمـونْ ﴾ واتە بەڵگە بۆ ئـادەمیزاد شـەوە ئێمـە ڕۆژمـان لێ دەرهێنـاوە ، دوایـی کتـو پـڕ ئەکەونـە تاریکی‌یەوە لـە دوای کۆتای ڕۆژ.

خوای گەورە دوای ئەوە بڕیاری یەکێتی خۆی داوە بەو بەڵگـە بێگومانانـە وە بۆمـانی ڕوون کردۆتەوە ، بۆمانیشی ڕوون ئەکاتەوە، هەندێ لـە ئـادەمیزاد پـەیڕەوی بیروبـاوەڕی پوچ و نا دروست ئەکەن و هاوکار بۆ خوا دائەنێن ، ئەفەرموێ:

وَمِنَ
ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذْ يَرَوْنَ
ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾
إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ
وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ
لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ
أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾

﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله أنداداً ﴾ وە هەندێ لە ئادەمیزاد هەن کەسێ وەرئەگرن و دائەنێن لە جگەی خوا چەندین وێنەو هاوکار بۆ حوا ، ئەوانیش کۆمەلێکن ئەقلیان وێلەو سروشتیان تێك چووە و هاوبەش بۆ خوا دائەنێن بۆپەرستن لە وێنەی تاشراوو کە هیچ نابینن و هیچ شتێ نازانن و ناگەنە فریایان ، لاسایی باب و باپیرانیان ئەکەنەوە بە بێ تێگەیشتن سەر بۆ سەرۆکەکانیان دائەنەوێنن ،ئەوانیش ویستیان لێ سەندون و سواری سەریان بوون و زاڵ بوون بە سەریاندا .

﴿ يحبونهم كحب الله ﴾ ئەو کەسانە ئەو وێنانەیان خۆش ئەوێ و ئەیان پەرستن و رێزیان ئەگرن وەك چۆن خوایان خۆش ئەوێ ، بڕوایشسیان بەوان هەیە هەر وەك بڕوای باوەڕداران بە تەنهایی خوا.

﴿ والذين آمنوا أشد حباً لله ﴾ وەکە سانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە خوا هێناوە بەهێز تر و ڕاوەستاو ترن بۆ خۆشەویستی خوا و تەنهایی خوا لە هاوبەش دانەرەکان بۆ خوا ، چونکە هاوکار و هاوبەشی بۆ دانانێن لە پەرستندا ،پشت هەر بەخوا ئەبەستن لە پەرستنی خوا لانادەن ، بەلاّم بت پەرستان بڕوایان بەچەند شتێ تر هەیە ئەیان کەن بە هاوبەشی خوا لە پەرستندا و داوای چاکەو لابردن خراپەیان لێ ئەکەن ، بگرە باوەڕەکانیشیان دامەزراو نی‌یە وازیان لێ دێنن کاتێ نەهاتن بە فریایانەوە ، یا توشی ئازار و زیان بوون .

﴿ ولو يرى الذين ظلموا ﴾ وە ئەگەر ببینن و بزانن ئەو کەسانەی ئەوتۆ ستەمیان کرد لە خۆیان بەوەرگرتنی بتەکان بۆ پەرستن .

﴿ إذ يرون العذاب ﴾ کاتێ ئەبینن سزای دۆزەخ کە بۆیان ئامادە کراوە لە ڕۆژی دواییدا .

﴿ إن القوة لله جميعا ﴾ کە بەراستی هەموو هێزو تەواناو سەرکەوتن بۆ خوایە .

﴿ وإن الله شديد العقاب ﴾ وە بەراستی سزای خوا سەختە یانێ ئەگەر ئەوانە بیریان بوایە و ببیانزانیایە بڕوای تەواویان پەیدا ئەکرد تەنهاهەر بەو خوایە ی کە لە پاشەڕۆژیشدا کاری بونەوەران بەڕێوە ئەبات و ئەمڕۆ ئەیان پەرست زۆر بەباشی پەشیمان ئەبونەوە و ، ئەیانزانی خوا سزای بێ باوەڕان ئەدا ، ئەمڕۆش باوەڕیان ئەهێنا بە ئاین پیرۆزی ئیسلام کە بەڕاستی سزای خوا سەختە لە ڕۆژی دواییدا .

﴿ اِذْ تَبرأ الذيْنَ اتَّبَعوا مِنَ الذينَ اتَّبَعواْ ﴾ کاتی ئەبینن سزای خوا ئەو کاتە بێزارن کەسانێکی ئەوتۆ پەیڕەوی کراون لە کەسانێکی ئەوتۆ پەیرەوی‌ئەمانیان کردوە ، واتە سەرۆکەکانیان بێزارن لە ژێر دەستەکانیان .

﴿ وَرَأوا العَذابَ ﴾ وەئەو کاتە هەردوو لایان بە سەرۆك و ژێر دەستەکانەوە چاویان کەوت بە سزای دۆزەخ .

﴿ وَ تَقَطَعَتْ بِهِمُ الاسباب ﴾ وە پچڕا بۆیان و لەکیسیان چوو پەیوەندی نێوانیان و نەما دۆستایەتی و خزمایەتی و پلەو هاوسوێنی و پەیمانیان ، ئەو کاتە کارەکانیان سەرگەردانیان ئەکات و هەموو لایەکیان ئەوی تریان تاوانبار ئەکات ، ئەوکاتە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَقالَ الذينَ اتَّبَعواْ ﴾ و ئەڵێن کەسانێکی ئەوتۆ دوای سەرۆکەکان کەوتبوون و پەیڕوییان ئەکردن لەو کاتەدا سەرۆکەکانیان بێزاریان دەرئەبڕی لێیان :

﴿ لَوْ انَّ لَنا كَرَّةً﴾ ئەگەر بەڕاستی بۆ ئێمە ئەبوو گەڕانەوەی هەردوو لامان جارێ تر بۆ جیهان ، خۆزگایە جارێ تر ئەگەڕاینەوە.

﴿ فَنَتَبَرأ مِنهُمْ ﴾ دوایی ئێمەش بێزاری خۆمان دەرئەبرین لەو ستەمکارانە و دەست بەرداریان ئەبووین .

﴿ كَما تَبَرَءوا مِنّا ﴾ هەروەك ئەوەی ئەوان بێزاری دەرئەبڕن لە ئیمە ئێستاو یەخەمان لێ هەڵئەتەکاندن .

﴿ كَذلِكَ ﴾ هەر بەو جۆرەی هەردوولایان بێزاری دەرئەبڕن لە یەکتری و تووشی ناخۆشی ئەبن .

﴿ يُريهُم اللّه اعْمالَهُمْ حَسَرات عَلَيْهِمْ ﴾ خوا پیشان ئەدا بەوان کردەوەکان وخراپەکانیان بە خەفەت لەسەریان ، یانێ ئەو کارانە بەگومانی خۆیان بەچاکیان ئەزانی وەك حەج و عەمرەو میوانداریان هەتا دێ هەمویان بەبێ هوودە دەرچوە بۆیان ئەوانیش

داخیان بۆ ئەخۆن ، بەڵام تالآن و کوشتن و برین و داوێن پیسی و زیندە بەچاڵ کردنی کچانیان بۆ ئەبوژێتەوە ، ئەبێ بە دوو خەفەت بەسەریانەوە .

﴿ وَ ما هُم بِخارجينَ مِنْ النارْ﴾ وە سەرۆك و ژێر دەستەکانیان نایەنە دەرەوە لە ئاگری دۆزەخ ، یانێ دەرچوونیان لەو ئاگرە نابێ هەتا بگەڕێنەوە بۆ جیهان و گلەیی لە یەکتری بکەن ،با بکەون لەناو ئاگری دۆزەخدا .

خوای گورە بەو ئایەتانەو ئایەتەکانی پێشووتر و بەزۆرترینی ئایەتەکان دوایی فێرمان ئەکات کەرەوشتمان قورئانی بەرز بێ و بەم جۆرەی خوارەوە بێ :

١- لە کاتێکدا هەر تاقمێ کاری نارەوایان کرد ئێمەی موسوڵمان ڕاستەو خۆ ناویان نەبەین و دانەبەزینە سەریان ، بەڵکو ئەنجام و پاشەڕۆژی کارەکانیان ڕوون بکەینەوە لە هەردوو جیهاندا ، زیان وخراپەکانیان لەو کارانەدا بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد ئاشکرا بکەین، بەوانی بسەلمێنین ئەو کردەوەیەی ئێوە بی سزا نابی لە پاشەڕۆژدا.

٢- ئەو ئایەتانە هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەیان دەربارەی بێ باوەڕان هاتۆتە خوارەوە ، بەڵام هەموو ئەموو کەسانەش ئەگرێتەوە پەیڕوی ستەمکاران بکەن و یاریدەیان بدەن و پڕوپاگەندەیان بۆ بکەن ، ئەوانیش ئەگرێتەوە بڕوایان وابێ جگە لە خوا خاوەنی سوودو زیانە دوای نەزانین و گومڕایی بکەون ، دەست بدەنە گۆڕستان ودرەخت پەرستن، کڕنوش ئەبەن بۆ بەناو پیاواتنی ئاینی ، وە بگرە خۆیشیان بە باوەڕدار ئەزانن و نوێژ ئەکەن و زەکاتیش ئەدەن هەتا دێ ، وە ئەو کەسانەش زۆرن و هەر تاقمەیان ناوو دروشمێکیان هەیە بۆ هەڵفریودانی ساویلکەکان بۆ پول و سامان پێکەوە نان و کۆشك وتەلار درست کردن لە ژێر پەردەی ئیسلامدا ، دوای ئەوانە خوای گەورە بانگی ئادەمیزاد ئەکات کەلە جیهاندا بە خۆشی ڕابویرن وخواردن وخواردنەوەی پاك وخاوین بخۆن و بخۆنەوە ، لە یاسای ئیسلام لانەدەن و خۆیان لە پیس وپۆخلی وسەرگژی دووربخەنەوە، خوا ئەیان ترسێنێ کەخۆیان لە بیروباوەڕدا چاو لە بێ باوەڕان وسەرلێشێوانان نەکەن ، بێزاری

خۆیان دەرئەبرن بۆ ئەو کەسانەی کە غەیری خوا ئەپەرستن بۆنمونە ستەمکاران ئەپەرستن بەدەوری گۆڕی پیاوچاکان دا ئەگەڕێن و بەگێلی خۆیان بە چاکی ئەزانن .

لە سەردەمی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ هەندێ لە موسوڵمانان قەدەغەیان کردبوو لە سەر خۆیان خواردن و خواردنەوەی خۆش و بەتام ، بەرگ و پۆشاکی جوان و بەنرخیان نەئەکردەبەر، هەندێ کاری وایان ئەکرد خوا قەدەغەی نەکردبوو کەچی ئەوان نەیان ئەکرد بەگومانی خۆیان هەتا تووشی گوناه نەبن ، وایان دائەنا کە خواپەرستنە ، خوای گەورە فەرمانیان پێ ئەدا و دوای هەنگاوەکانی شەیتاتن نەکەون و ئەفەرموێ:-

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٧٠﴾

﴿ يا ايها الناسُ كُلُوا مما في الأرضِ ﴾ ئەی ئادەمیزاد ئێوە بخۆن و لەو شتەی لە زەویدایە لە هەمو جۆرە خواردەمەنی یەکانی.

﴿ حَلالاً طَيّباً ﴾ ئەوشتە ڕەوایە پاك و خاوێنە ، یانی ئەو شتەی ڕوایەو گومانی خراپی لێ ناکرێ ، یاسای ئیسلام بەپاکی دائەنێ و مێشکی ڕێك و پێك وەری ئەگرێ ، لە

خواردن و خواردنەوەدا دوای فەرمانی خوا بکەون ، لە خۆتانەوە هیچ شتێ قەدەغە مەکەن لە خوارەمەنیدا ، بەڵکو قەدەغە کراوەکان لە دەستوری خواو لە ئیسلامەوە وەربگرن .

﴿ وَ لاَ تَتَبِعوا خُطُواتِ الشَيطانْ ﴾ دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ، ئەو کارانە ئەو ئەیکات لاتان چاك نەبێ ، کاری قەدەغە و ڕەوا هەر لە خواوە وەربگرن نەك لە کاری شەیتانەوە وەری بگرن .

﴿ اِنَه لَكُمْ عَدُوٌ مُبينْ ﴾ بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ، بە ئاواتی خۆی ئەیەوێ بتانخاتە ناو گوناهەوە ، ئەو شتەی خوا پێی ناخۆش بێ بۆتان ئەڕازێنێتەوە ، دوژمنایەتی ئەو بۆ ئێوە کۆنە و لە باپیرە گەورەتانەوە دەستی پێ کرددوە ، ئەیەوێ بەرەو گومڕایی ودۆزەخ بتانبات ، ئەو ئایەتە هەموو ئادەمیزاد بەوانەی سەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ودوای ئەوانیش ئەگرێتەوە .

پاش ئەوەی خوای گەورە باسی خواردەمەنی پاکی بۆ کردین ئەیشمان ترسێنێ کە دەست نەدەینە خواردن و خواردنەوەی خراپ وکارە قەدەغە کراوەکان ، ئەو شتانەی شەیتان لەبەر چاوماندا ئەیڕازێنێتەوە ، وەك ئارەق و داوێن پیسی ودوو ڕویی ودرۆ کردن و خواردنی سامانی هەتیوان و سود خواردن ، هەتا دێ ، پێویستە بە خەیاڵی خاو لە هەژاری نەترسین ، واز لە بەرگی خاوێن و خواردەمەنی خۆش نەیەرین ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ:-

﴿ اِنَما يَأْمُرُكُمْ بالسُوء وَالْفَحْشاء ﴾ بەڕاستی شەیتان فەرمانتان پێ نادات مەگەر فەرمانتان پێ ئەدات بە هەموو شتێ پاشەڕۆژی خراپە ، فەرمانتان پێ نادات مەگەر بەهەموو کارێکی خراپ و بێز لێکراوە ، وەك داوێن پیسی وشتی تریش .

﴿ وَ اَنْ تَقولوا على اللّه مالا تَعْلَمونْ ﴾ وە ئەیشی ئەوێ لە ئێوە بلێن و بیدەن بەسەر خوادا بە بوختان شتێك ئێوە نایزانن کەلەلای خواوە نەهاتووە ، ئەیلێن لەخۆتانەوە کە ئەوشتە ڕەوایە و ئەوەی تر قەدەغەیە و بێ ئەوەی بزانن چۆنە .

﴿ وَ اِذا قيلَ لَهُمْ اِتَّبِعوا ما اَنْزَلَ اللّه ﴾ وەهەر کاتێ ووترا بێ بەوان : ئێوە بەدوای شتێ بکەون کە خوا بەتاك و تەنهایی ناردوویەتیە خوارەوە و و باوەڕ بەپێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ بکەن ، بەرەوای دابنێن ئەوشتانەی خوا بە ڕەوای دائەنێ ، بە قەدەغەی بزانن ئەو شتانەی کە خــوا قەدەغەی کردووە لە هەموو ڕوویەکەوە.

﴿ قالوا بَلْ نَتَبِعِ ما اَلْفَيْنا علَيه آباءنا ﴾ ئەیان ووت : بەڵکو ئێمە پەیڕەوی شتێ ئەکــەین دەستمان کەوتووە و بۆمان بە جێ ماوە لە باوك و باپیرانمانــەوە ، ئـەو شـتەی لەوانـەوە بۆمان هاتووە وازی لێ ناهێنین .

﴿ اَوَلَوْ كانَ آباؤُهُمْ لا يَعْقِلُونَ شَيْئاً ﴾ ئایا پــەیرەوی باوکــەکانیان ئەکـەن ؟ بـا وەکـو ئەوان هیچ شتێ نەزانن و هیچ شتێ نەفامن لە فەرمانەکانی خوا.

﴿وَلا يَهْتَدونْ﴾ وە ڕانموویی نەبن و ڕێگەی ڕاست نەگرن ، شتی پـوچ و ڕەوا لـەیـەك جوێ نەکەنەوە ، جێگەی سەرسوڕمانە لاسایی کردنەوە کاریان تێ ئەکات ، وە بەنرختری دائەنێن لەو شتانەی شایانی پەیڕەوی کردنن ، لاسایی کردنەوە لە هەموو شـتێکدا ڕاسـت نی‌یە ، بەوێنەی ئەو دواکەوتنەی باوکانیان و باپیرانیان .

( التقليد ) لاسایی کردنەوە وەکو بیرو باوەڕێك خۆی لە خۆیانەوە نەبـەچاك و نـە بـە خراپ دائەنرێ بە شێوەیەکی گشتی ، بەڵکو جـوێ ئەکرێتـەوە چـاك و خراپەکـەی بـەم شێوەیەی خوارەوە :—

١– لاسایی کردنەوەی وا هەیە ئادەمیزاد وگیانەوەران هاوبەشن لەوا ، وەکـو ئـەوەی وا ئەبێ کەڵە بابێ ئەقوقێنێ و کەڵەبابەکانی تریش ئەقوقێنن ، وایش ئەبێ مرۆڤێ چەپڵە بـۆ کەسێ لێ ئەدات و هەموو مرۆڤانی تریش چەپڵەی بـۆڵێ ئـەدەن بـێ ئـەوەی بزانـن چـی قەوماوە ،ئەم جۆرە لاسایی کردنەوەیە نەبە چاك و نەبە خراپ دانانرێ ، چونکە لە ویست و هەستەوە نەهاتووە .

٢– لاسایی وا هەیە پەیوەندی‌بە خووڕوشتەوە و بە باوی جێگــە وشـوێنی تایبەتی‌یـەوە هەیە ، وەك جۆری بەرگ و شێواز و کۆمەڵایەتی ئەیســەپێنێ بەســەریانا ،گـەورەو بچـوك

ومنداڵ و ژنیان لەوەدا بەشدارن هەر جێگەیەك بە جۆرێك و هەر نەتەوەیەك و نەتەوەیەك بەجۆرێ تر ، ئەم جۆرە لاساییە شایانی چاکە و خراپەنی‌یە بە گوێرەی ئاین ، بەڵکو پەیوەندی بە ڕەوشت وباوی دانیشتووانی ئەو جێگەیەوە هەیە .

٣- لاسایی کردنەوەی نەزان بۆ زانایان لە کاروباری ژیانی جیهانیان ، وەك لاسایی کردنەوە بۆ فێر بوونی پزیشکی و ئەندازیاری و جۆری پێ گەیاندنی کشت وکاڵ و پیشەسازی هەتا دوایی ، لە فێرکەران و تاقی کەران و پسپۆڕەکان ، ئەو جۆرە بەشە لاساییانە زۆر پێویست و زۆر گرنگە و سوود بەخشە ، بەڵکو ژیان و گوزەرانی کۆمەڵایەتی پێویستی ئەکات لە سەریان ، هەتا هۆی ژیانیاتن لەق ولۆق نەبێ‌ئیسش و کاریان ئەوەستێ ، لە توانای ئادەمیزادا نی‌یە هەر لە خۆیانەوە بۆ خۆیان یەکەم جار هەموو شتێ فێر بن و بیزانن ، بەبێ مامۆستا هەموو پێویستی خۆیان ببەن بە ڕێەوە ، هەر وا بوون لەمەو پێش و هەر بەم چەشنەش بەبێ یەك نایان کرێ ، هەندێکیان پێویستە مامۆستابن وهەندێمی تریان قوتابی بن.

٤- لاسایی کردنەوەی زانایە بۆ زانایکی تر لە فەرمانەکانی ئایندا ، لە مانا کردنی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەردا﴿ ﷺ﴾ لە دەرهێنانی یاسا لەواندا ، ئەو دوو زانایەش لە زانین دا هاوتای یەك بن ، ئەو شێوە لاسایی‌یە خراپە و قەدەغەیە بە گوێرەی عەقڵ ،چونکە هەردوولایان بە جۆرێکی بێ گومان بەلای خۆیانەوە ئەو شتە پێ‌ی ئەیزانن فەرمانی خوایە ئیتر چۆن ئەبێ وازی لێ بهێنێ و لاسایی ئەوی تر بکاتەوە بە گۆترە؟ کەچی لەزانینا هاوتای یەکترن،لە کۆشش و هەستی خۆیا وای دەرهێناوە ئەو شتەی ئەم دەریهێناوە و ئەم شتەی ئەم ئەیزانێ یاسای ئایین ئەم ئەگرێتەوە ئیتر چۆن ئەبێ لاسایی زانایەکی تر بکاتەوە بە گوێرەی بیری خۆی ڕێك ناکەوێ لەگەڵ یاسای ئایندا ؟

٥- لاسایی زانایێ بۆ زانایەکی تری دادپەروەر و شارەزا لە مانای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا﴿ ﷺ﴾ لە کردەوەی ئاینیدا ، وەك بەجێ هێنانی جۆری پەرستن و

کامیان ڕەوایە و کامیان قەدەغەیە و کامیان پاکە و کامیان پیسە و کامیان مامەڵەی دروستەوکامیان مامەڵەی دروست نی‌یە ، هەتا دێ ئەو جۆرە لاسایی‌یە دروستە بە گوێرەی ئەقڵ و ئاین ، چونکە ئەو زانایە لە بەڵگەیەکەوە بێ گومان زانیاری خۆی دەرهێناوە ، نەزانیش لاسایی ئەکاتەوە و نەزانیش خۆ پێویستە یاسا و دەستوری ئیسلام و چۆنێتی ئاین وجۆری پەرستن بەجێ بهێنێ ، بەبێ ئەوەی پەلاماری زانایەك بدات و لاسایی بکاتەوە و هیچ شتێ تر نازانێ و بۆی ناکرێ ، کەواتە پێویستە چاو لە زانایەکی تر بکات و پرسیاری لێ بکات، وەك ئەفەرموێ :-

﴿ فَاَسْأَلوا اَهْلَ الذِكْرِ اِنْ كُنْتُمْ لاتَعْلَمونْ ﴾ کەواتە ئێوە بپرسن لە خاوەن زانیاری‌یەکان ئەگەر ئێوە شتێکتان نەزانی ، بەڵێ لاسایی و پرسیار کردن زۆر ڕاستە ، بگرە ئەگەر نەزانێ نوێژ و ڕۆژ و پێویستی‌یەکانی تری بە جێ هێنابێ و مامەڵەی کرد و چاوی لە باوکی کرد ، لاسایی هیچ زانا و پێشەوایەکی نەکردبوو بەڵام پەرستنەکانی لەگەڵ ناوەڕۆکی فەرمانی خوادا ڕێك بوو ئەو پەرستنە بە ڕەوا ودروزست دائەنرێ ، لە لایەن یاسای ئاین لێ وەرئەگیرێ چونکە تەماشای کردەوە وائەکرێ نەك زانا و پێشەوای ئاین ، ئەگەر بە گوێرەی بیرو باوەری خۆی ڕاست و ڕەوا بوو یاسای ئیسلام بەو جۆرە ئەیگرێتەوە و کارەکەی دروستە و ڕەوایە وەك ئەبینرێ زۆر کەس هەن هەموو جۆرە کارو بارەکانی ئاینیان لە دایك و باوکی نەخوێندەواریانەوە وەرگرتووە ، بە گوێرەی تاقی کردنەوە لە گەڵ یاسای ئیسلامدا ئەگونجێ بێ ئەوەی چاویان لە هیچ زانا و پێشەوایەك کردبێ .

کەواتە لاسایی وتەقلید نە شێوە و نە مەرجێکە بۆ فەرمان پێ دراوانی خوا و پەرستنی خوا بەڵکو ئەو شتەی مەرج بێ فێری جۆر و چۆنێتی پەرستن و مامەڵەی ئاین بن بە هەر هۆیەك بێ ، لەو ئایەتەوە وامان بۆ دەرئەکەوێ هەموو کاتێ چاو لێ کردن و پەیڕەوی کردنی باب و باپیران قەدەغەنیە بەمەرجێ شارەزاوپسپۆڕبن لەئایندا ، لەوکاتەدا بۆ کوڕو خێزانەکانیان ڕەواو دروستە چاویان لێ بکەن و لاساییان بکەنەوە .

٦- لاسایی کردنەوە لەباوەڕ بەبنچینەکانی ئاین ، وەك باوەڕ بەخواو بەفریشتەو نامەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و باوەڕ بەفەرمانە پێویستەکان و قەدەغەکراوەکان و باوەڕ بەبێ گوناهی پێغەمبەران ، باوەڕ بەوانە هموو لاسایی و چاولێ کردن لەواندا دروست نی‌یە قەدەغەیە تەقلید لەوانەدا باوەڕی پێ دانامەزرێ چونکە لاسایی لەوشتانەدا وەرگرتنی شتێکە بێ‌ئەوەی بەلگەیە بۆ لاسایی کەر هەبێ جگە لەچاوکردن لەزانایە ، نابێتە هۆی باوەڕێکی بێ گومان و دامەزراوو نەگۆڕاو ، بگرە لەوانەیە زانایە تر باوەڕەکەی بەجۆرێ تر بگۆڕێ هەتا دێ‌و ئەڕوا وەك تۆزێکی لێدێ ڕەشەبا لەهەموو لایەکەوە پرش و بلاوی بکا .

بەلام ئەگەر ئەو جۆرە لاسایی یە لەباوەڕ بەبنچینەکانی ئاین باوەڕێکی نەگۆڕاوی لەمێشکدا پەیدا کرد وای لێ هات شایانی گۆڕانی نەبێ لاسایی بەو جۆرە زۆر ڕەوایە ، ئەو باوەڕەیش ئاین داوای ئەکا هەر ئەو باوەڕەیە . بەکورتی ئەو کەسەی پەیڕەوی کاری پەسەندو جێگیری کردبێ وە ڕێك کەوتبێ لەگەل یاسای قورئانی پیرۆزدا و پەیڕەوەکەشی بێ‌گومان بوو بەلگەی بۆ دائەنرێ بۆ دامەزراوی باوەڕ بەبنچینەکان ئیتر بەلگەکە بزانێ یان نەزانێ ،هەروا کەسێ کاری ڕەواو چاك بکا و پەسەند بێ لای ئاین باڕاستەو خۆ نەزانێ ئەو کارە یاسای ئیسلام لای ڕەوایە ، ئەوکەسە ئەبێتە جێگەی پاداشتی چاکە ، بەپێچەوانەی کاری قەدەغەکە هۆی تۆلە سەندنە .

خوای گەورە باسی بێ باوەڕانی کردوو فەرموی ئەوان ، تەماشای بەلگەی ڕاست و ڕەوا ناکەن و بیر لە هیچ شتێ ناکەنەوە ، ئەفەرموێ : وێنەیان وەك ئاژەل وایە لە کەڕی و کوێری و لالیدا ، نەفام و نەزانن وەك ئەفەرموێ :

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ



﴿ وَ مَثَلُ الذينَ كَفَروا ﴾ وە وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە کە بانگیان ئەکرێ بۆ لای ڕانومایی کە سوودی خۆیانی تیایە و وەڵامی نادەنەوە ، گوێی لێ ناگرن و **بیری لێ ناکەنەوە** .

**﴿ كمَثَلِ الذي ينعِقُ بِما لا يَسْمَعُ ﴾وەك وێنەی کەسێکی ئەوتۆ وان دەنگ بکات لە شتێ ونەبیسێ وەك ئاژەڵ و بزن و مەڕ.**

﴿ اِلاّ دُعاءً و نِداءاً ﴾ مەگەر ئەبیسێ بانگ و هاوارێ ، یانێ ئەو کەسەی بانگی بێ باوەران بکات بۆلای ڕێگای ڕاست و ڕانموییی و وەڵامی نەدەنەوە و خۆیانی لێ گێل بکەن وێنەی وەك وێنەی شوانێ وایە بخورێتە کەرتە ئاژەڵێ هەر یەکەیان بۆلایە بڕۆن و بخۆن، ئاژەڵەکان وەڵامی نەدەنەوە جگە لە قیڕە قیڕ لە هیچ شتێ تر تێ نەگەن و نەزانن مەبەستی شوانەکە چ شتێکە ، چۆن ئەو ئاژەڵە لە هیچ شتێ تێ ناگات جگە لەو دەنگەی پێی ڕام بوون ، ئەو بێ باوەڕانەیش هیچ شتێ لە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ نابیسن کە بانگیان ئەکات بۆلای خواناسی و ڕێگەی ڕەوا کەچی سوودی خۆیانی تێدایە بگرە زۆر جاران بەو بانگ کردنە ئاژەڵ ئەچێ بۆلای ئەو ئاو و ئالفە ، بەڵام بێ باوەران هەرگیز لەو بانگەی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ سوود وەرناگرن .

﴿ صُمٌ بُكْمٌ عُمیٌ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە کەڕن ووتەی ڕەوا نابیسن ، لاڵن ووتەی ڕاست ناڵێن ، کوێرن و کاری ڕەوا و ڕاست نابینن ، ئەوانە هەرچەنە خاوەنی بیستن و بینین و ووتن بەڵام چونکە بەکاریان نایەنن بۆ ئەو شتانەی بۆیان دروست کراون هەتا سوودی لێ وەرگرن و ڕانومایی بن وەك نەیان بێ وان ، ئەوەیش ئەوپەڕی نەفامی‌یە .

﴿ فَهُمْ لا يَعْقِلونْ ﴾ کەواتە ئەو بێ باوەڕانە بیر ناکەنەوە لەو شتانە پێغەمبەران ﴿ﷺ﴾ ئەیلێن و وەری ناگرن ، وەك خاوەنی ئەقڵ نەبن ئەگینا چۆن ئامۆژگاری سوود بەخش وەرناگرن بۆ سوودی خۆیان .

دوای ئەوەی خوای گەورە ڕووی کردە ئادەمیزاد و فەرمووی بخۆن لەو خواردەمەنیانە کەلە زەویدان ، دووبارە بەوان ئەفەرموێ لەم ئایەتەی دواییدا : بخۆن لەو شتە پاك ورەوایانە کردوومە بە خۆراك بۆتان ، بۆیان ڕوون ئەکاتەوە خوا پەرستی ڕاستەقینە بەوە

نابێ ئازار و ئێش بە خۆیان بگەیەنن ، خواردەمەنی خۆش و بەتام نەخۆن ، وێنەی کەشیش و بێ باوەڕانی تر واز لە گوزەران و ڕابواردنی خۆشی جیهان بێنن ، جا با ئادەمیزاد بە باشی بزانن خوا بەڕەوای داناوە چاك ڕابواردن وەك هەندام و بەرگ و خواردەمەنیان کە پاك و ڕەوای بێگومانبن ، بەرانبەر بەو چاکانە فەرمانی پێداون سوپاس و ناوی خوا بێنن و نەك بەکاریان نەیەرن .

خاوەن سامان و پلە بەرزەکان تەمێ خواردوو بن بەو بەخششانەی بەوان دراوە و بەکاریان بێنن لە چاکەدا و بەکاری نەیەرن لە کردەوەی قەدەغە و نالەباردا ،خۆیان بە گەورە دانەنێن و یاخی نەبن ، وەخوا بۆیان ڕوون ئەکاتەوە ئەوانەی بت پەرستان قەدەغەیان کردووە موسوڵمانان بەڕەوای دا نەنێن ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾

﴿ يا اَيُها الّذينَ آمَنوا كُلوا منْ طَيباتِ ما رَزَقْناكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە : ئێوە بخۆن لە چەندین پاك ورەوای شتێ ئێمە کردوومانە بە خواردەمەنی بۆ ئێوە ، لە هەموو خواردەمەنییە خۆش و بەتامەکان بەو جۆرەی بۆتان دانراوە ، بە خۆشی ڕابوێرن، بەڵام بچوکی وبەندایەتی خۆتان بەرامبەر بە چاکەی خوا دەربڕن کەواتە .

﴿ وَ اْشْكُروا للّه ﴾ وەئێوە سوپاس بەجێ بهێنن بۆ خوا لەسەر ئەو شتانەی خوا بەخشیویەتی پێتان و بۆی ڕەوا کردوون .

﴿ اِنْ كُنْتُمْ اِياهُ تَعْبُدونْ ﴾ ئەگەر هەر خوا ئەپەرستن و بەلێن ئەدەن بە خوا کەهەموو شتێ بە ئێوە ببەخشێ ، پاش ئەوەی باسی خواردەمەنی‌یە ڕەواکان کرا بۆمان ، خوای گەورە باسی خواردەمەنی‌یە قەدەغە کراوەکانمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە ، وە ئەفەرموێ :

﴿ اِنَّما حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ بەڕاستی قەدەغە نەکراوە لەسەر ئێوە بەفەرمانی خوا هیچ شتێ جگە لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردووە لەسەرتان کەنەی خۆن ئەمانەن :

﴿ المَيْتَةَ ﴾ مرداره‌وه بوو ، یانی گۆشتی‌ئەو گیان لەبەرانە قەدەغەیە سەرنەبڕابێ بەوجۆرەی کە یاسای ئیسلام دیاری کردووە بە بڕینی قورگ و سورێنچکە ، بەمەرجێ بچوکترین بازنەیە لە قورقوڕاگەی سەربڕاوەکە کە بەسەریەوە مابێتەوە ، مرداره‌وه بوو هەمویان بە هەموو ئەندام وپارچەکانی‌یەوە بەموو وخوری و ئێسکەکانیان و قەدەغەن و نابێ بە کاریان بهێنن بۆ هەموو شتێ جگە لە ماسی و کوللە ئەوانە سەربڕینیان پێویست نی‌یە ، خواردن وبەکارهێنانیان دروستە و پاکن ، وە سروشتی ئاسایی و لە سەرخۆ بێز لە خواردەمەنی مرداره‌وه بوو ئەکات .

ئاینی ئیسلام گۆشتی مرداره‌وه بووی قەدەغە کردووە، چونکە مردنی گیان لەبەر بەنەخۆشی کۆن یا تازە بەهۆی هەر میکرۆبێکەوە بێ ئەوپەڕی زیانی بۆ ئادەمیزادە بۆ پەیدا بوونی نەخۆشی ، ئەو میکرۆبە با بە هۆی ئاگرەوە بکوژرێ ، بەلام وەکو خواردەمەنی‌یی‌کی ترشەلۆك میکرۆبەکەی هەر ئەمێنێ و زیان بەخشە ، سەر ئەکێشێ بۆ لەناو بردنی ئادەمیزاد ، خۆ ئەگەر وا دابنری بەبێ نەخۆشی مردار بووەتەوە بە هۆی کارەساتێکی کوتو پڕی ئەو خوێنەی هەیەتی بە گۆشتەکەیەوە ڕەق ئەبێ ئەو میکرۆبە لە خۆیدا هەر هەیەو زیان بەخشە بۆ مرۆڤ ، لە میکرۆبەکانی خوێندا ڕوون ئەکرێتەوە لەمەو پاش .

﴿ وَ الدَمَ ﴾ جگە لە خوێن کە خوا قەدەغەی کردووە ، یانێ ئەو خوێنە بە بریندار کردنی ڕەگی گیانلەبەران وەربگیرێ ، ببرژێنرێ و بخورێ خوا قەدەغەی کردووە ، نابێ بەکار بهێنرێ بۆ خواردن و کڕین و فرۆشتن وسوود لێ وەرگرتنی تر.

بەڵام ئەو خوێنەی لە مرۆڤێکدا دەر ئەهێنرێ ، ئەکرێتە نێو لەشی مرۆڤێکی تر بە گوێرەی ئامۆژگاری پزیشکی تایبەتی قەدەغە نی‌یە و بەکار هێنانی دروستە چونکە بە خزمەتی مرۆڤایەتی ئەژمێردرێ ،هەر شتێ بەو جۆرە بێ بەلای پێشەوا حەنەفی‌یەوە کڕین و فرۆشتنی دروستە ، هەموو خوێنێ قەدەغەیە جگە لە جگەرو سپڵ و ئەو خوێنەی بەسەر گۆشت و ئێسکەوە ئەمێنێەوە.

خوای گەورە خواردنی خوێنی قەدەغە کردووە ، چونکە گەورەترین و خۆشترین هێلانەیە بۆ جۆرە میکرۆبێکی کوشندە ، بۆ زاووزێ کردن و بلاو بوونەوەی ، هەر خوێنە ژەهر و پیسی و پۆخڵی خواردەمەنی‌یەکان فرێ ئەدات بە هۆی میز و بەڵغەم وچڵکەوە ، هەتا دێ ، وەك زانراوە پزیشکەکان بە تاقی کردنەوەی خوێن جۆری نەخۆشی‌یەکان ئەدۆزنەوە ، سروشتی ئاسایی بێز لە خواردن خوێن ئەکاتەوە ، نابێتە هۆی مانەوەی ژیانی ئادەمیزاد ، وەقورس و گرانە خواردنی خوێن بۆ گەدە ، ئەگەر ئەو میکرۆبانەی خوێن بکوژرێن بە ئاگر ئەو پرۆتینانە لە نێو خوێندا بە بێ نرخترین پرۆتین دائەنرێ کە سوودیان نی‌یە بۆ ژیانی ئادەمیزاد ، لەبەر ئەم هەموو زیانە خوێن حەرام کراوە.

﴿ وَ لَحْمَ الخِنْزِيرِ ﴾ وە قەدەغەی کردووە گۆشتی بەراز بە هەموو پارچەکانی‌یەوە بە بەز و چەوری و ئێسك و پیست و موویەوە ، ئیسلام گۆشتی بەرازی قەدەغە کردووە ، چونکە بەلای کەمی‌یەوە دوو نەخۆشی تیایە :

**یەکەم:** کرمە تاکانە( الدورة الوحيدة ) . **دووەم:** مووی پێچ پێچ ( الشعرة الحلزونية).

ئەو دوو جۆرە نەخۆشی‌یە زۆر کوشندە و لەناو بەری گیانلەبەرن بەتایبەتی بۆ ئادەمیزاد هیچ پزیشکێکی تایبەتی ناتوانێ بڕیار بدات کە بەراز نەخۆشی تێدا نی‌یە هەتا هەموو پارچەکانی ناوە و دەرەوە تاقی نەکاتەوە ، ئەوەیشی بۆ ناکرێ چونکە ئەبێتە هۆی لەناوچونی هەموو گۆشتەکەی ، وە بێجگە لەو کرمانە هەزار و پێنج سەد کۆرپەلە دائەنێ لەنێو لیقای ڕیخۆڵەدا ، بەهۆی سوڕی خوێنەوە بە ملیۆن کۆرپەلەی تر لە پارچەکانی تری

ئادەمیزاد دا دائەنێ ، لە ئەنجامی کۆبوونەوەیاندا ئەبنە هۆی ئاوسان وئازارێکی زۆر لە جومگەکانی ئادەمیزادا ، ئەو نەخۆشیانە چارەسەر ناکرێن بەشێوەیەکی هونەری و هەموو دەرمانێك بۆیان بێ سوودە ، سەرەڕای ئەوە گۆشتی بەراز هەندێ لە میکرۆبی پیس و ڕەشە گرانەتێ ئەگوێزێتەوە بۆ مرۆڤ کە ئەبنە هۆی مردنی مرۆڤ خۆشترین خواردەمەنی بەراز پیس و پۆخڵێترە .

ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی‌یەکانی بەراز ئەبن بەزۆری دانیشتووانی ئەو جێگایانەن کە گۆشتی بەراز ئەخۆن ، ئەو کەسانە لایان وایە کەرەسەی تازە ئەتوانێ بە هۆی بەرز بونەوەی پلەی گەرما ئەو میکرۆبانە بکوژێ ئەو کەسانە خەیاڵیان خاوە و لە بیریان چۆتەوە کە زانیاری خۆیان بۆ دۆزینەوەی یەك نەخۆشی ماوەیەکی زۆری ئەوێ ، چ کەسێ ئەتوانێ و بڕیار بدات کە گۆشتی بەراز چەندەهانەخۆشی تری تیا نی‌یە و هێشتا نەدۆزرابێتەوە زۆر سەیرە و جێگەی سەرسوڕمانە ئەو یاسای ئیسلامە بە سەدان ساڵ لەو زانیاری‌یەی ئەوان پێشکەوتووترە و کەچی بڕوای پێ ناکەن لە قەدەغە کردنی گۆشتی بەرازدا ، بەراز وەك سەگ سەیر ئەکرێ وبگرە پیس تریش .

﴿ وَ ما اُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّٰهْ ﴾ وە قەدەغەیشی کردووە شتێ دەنگی بۆ بەرز بکرێتەوە لە کاتی سەر برین دا بۆ غەیری خوا و جگە لە خوا ئیتر ناوی بت بێنی یان ناوی پێغەمبەران ﴿ﷺ﴾ یان ناوی کاربەدەستان یان ناوی باب و باپیران بێ هەتا دوایی.... ، ئەو ڕستەیە ئەوەمان فێر ئەکات پێویستە موسوڵمانان جگە لە لە خوا کەسی تر نەپەرستن ، کەواتە ئەگەر موسوڵمانێك کوشتارێ بکات ، بیەوێ جگە لە غەیری خوا نزیك بێتەوە ئەبێتە هۆی گومڕا بوونی و لە ئاین دەرچونی ، وە گۆشتی کوژراوەکەیشی قەدەغەیە ، چونکە جگەلە خوا کەسی تر ناتوانێ هیچ شتێ بکات و هیچ شتێ وەرگرێ ، یا پێویستی‌یەکەی وەرگرێ و بۆی جێ بەجێ بکات ، ئەو چوار شتە قەدەغە کراون ئەگەر ناچار بووین بۆ خواردنیان وەك خوای‌گەورە ئەفەرموێ :

﴿ فَمَنْ اِضْطُرَّ ﴾ کەواتە ئەو کەسەی چاری نەما و برسێتی‌زۆری بۆ هێنا و ترسی لەناو چوونی خۆی هەبوو ، یا زۆریان لێ‌کرد بۆ خواردنی قەدەغە کراوەکان .

﴿ غير باغ ﴾ لەسنور دەرنەچێ و بەرەوای دانەنێ و خۆی هەڵنەبژێرێ بەسەر ناچـارێ تردا دەست درێژی نەکاتە بەشێ کەسی تر .

﴿ وَ لاَ عادٍ ﴾ وەدەست درێژی نەکاتە سەر ئادەمیزادێ تر ، با ئەوەندە نەخوات زۆرتر بێ لە پێویستی خۆی ، ئەوەندە بخوات پێ‌ی نەمرێ .

﴿ فلا اِثمَ عَليهِ ﴾ دوایی ئەو کەسە چاری نەما و ستەم کار و دەست درێژی کەر نەبێ گوناه بار نابێ ئەو قەدەغە کراوانە بخوات بەمەرجێ بە ئارەزووی خـۆی نـەیان خـوات ، ئەوەندە بخوات پێ‌ی نەمرێ .

﴿ اِنَّ اللّٰه غَفورٌ رَحيمْ ﴾ بەراستی خوا لێ خۆش بوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە لــە کـاتی ناچاریدا قەدەغە کراوەکان ئەخۆن ، زۆر میهرەبانە لە گـەڵیاندا ، وە ڕێگـەی ژیانیـان بـۆ ئاسان ئەکات ، لەوان ئەبورێ کە قەدەغە کراوەکان ئەخۆن .

سەرۆك ومالومەکانی جولەکە کە بـاج و دیاریـان لـە ژێردەستە نەزانـەکانی خۆیـان وەرئەگرت ، ئاواتیان ئەوە بوو کە پێغەمبەری دوا ڕۆژ لەوان بێ ، کاتـێ پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ نێردرا و لەوان نەبوو ترسیان پەیدا کرد ئەو دیاری و ئالفەیان لە دەست دەرچێ، دەستیان کرد بە گۆڕینی شێوازی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ و بە پێچەوانەوە بلاویان کردەوە و ئەیان ووت : وێنەی پێغەمبەری دوا ڕۆژ لەم ناچێ ، خوای گەورە ڕیسوای کردن و فەرمووی :

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ
فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ

اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

﴿ اِنَّ الذيْنَ يَكْتُمونَ ما اَنْزَلَ اللّٰه من الكِتابِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لە زانا جولەکەکان ئەشارنەوە شتێ خوا ناردوویەتی‌یە خوارەوە لە نامەی خۆیا کە تەوراتە ، ئەشارنەوە فەرمانەکانی بە قەدەغە کردنی ڕەواکانیان ، بە رەوا دانانی قەدەغە کراوەکان ، لە گۆرینی شێواز و دیمەنی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ، مانا کردنی بە ئارەزووی خۆیان هەتا بەرتیلی پێ وەرگرن .

﴿ وَ يَشْتَرونَ بە ثَمَناً قليلا ﴾ وەرئەگرن بەو شاردنەوەیانە نرخێکی کەم ، یانێ ئەگۆڕنەوە ئەو شتانەی خوا ناردویەتی‌یە خوارەوە بە نرخێکی کەم ، دیاری وەرگرتن لە ژێر دەستە نەزانەکانیان ، نەوەك سامان و پلە و سەرۆکایەتیان لە کیس بچێ .

﴿ اُولئكَ ما ياكلون في بطونهمْ إلاَ النارْ ﴾ ئەو تاقمە ناخۆن پڕ بە وورگیان جگە لە ئاگر لە ڕۆژی دواییدا ، وەك بەرتیل وەرگرتن و ئالفەی وەری ئەگرن لە جولەکە نەزانەکان .

﴿ وَ لا يُكَلِمُهُم اللّٰهُ يَومَ القيامَة ﴾ وە خوا فەرمودەیان لەگەڵ ناکات لە ڕۆژی دوایدا و هەڵسانەوەیان لە گۆرەکانیان ، خەشمیان لێ ئەگرێ و ڕویان لێ وەرئەگێڕێ ، ئەو جۆرە ڕێزەی بۆ موسوڵمانان داناوە ئەوانی لێ بێ بەش ئەبێ ئەیان سوتێنێ و پاکیان ناکاتەوە لەو گوناه .

﴿ وَ لاَ يُزَكيهِمْ ﴾ وە خوا پاکیان ناکاتەوە لە گوناه .

﴿ وَ لَهُمْ عَذابٌ اَليمْ ﴾ وە بۆ ئەو تاقمە هەیــە سـزای بـەتین و ئـازاردەر ، ئـەو ئایەتـە هەرچەندە دەربارەی پیسی جولەکەکان هاتۆتە خوارەوە بـەلاّم هـەموو کەسـێ ئەگرێتـەوە سوودی تایبەتی خۆی و مافی رەوا بشارێتەوە ، مانای نامەکانی خوا بگورێت ، بە گوێرەی ویستی خۆی مانایان بکات هەتا پارەو پول وەر بگرێ ، ئیتر گاور و جولەکە بن یان بـەناو موسولّمان ، چونکە ئەو شتانەی خوا فەرمانی کردنیان پێ بدات پێویستە رێزیان بگـیرێ و بلاّو بکرێنەوە بەناو خەلّکیدا ، گومانیـان لێ دوور بخرێتـەوە وە بـەرەنگاری ئـەو کەسـانە بکرێ کە لە دژیان ئەوەستن ، پێویســتە بـە چـەکی زمـانی بـەهێزیان بـەوانی بسـەلمێنن و خۆیانیان بۆ بکەن بە قوربانیی ،چونکە ئاین وپرۆگرام وپاسا بەبێ فیداکاری راناوەستێ .

﴿ اُولئِكَ الذينَ اِشتَرَوا الْضَلالَةَ بِالْهُدیَ ﴾ ئـەو تـاقم وکەسـانە لـە رووی نەزانیـیەوە گومراییان کریوە بە شارەزایی و رانومایی ، وازیان لە نامەی خوا هێناوە ، لە خواپەرستیش دورن .

﴿ وَ العَذابَ بِالْمَغْفِرةْ ﴾ وە سزای خوایان کریوە بە لێ بووردنی خوا ، کە لــە رۆژی دواییدا هەموو کەس بۆی رائەکات .

﴿ فَما اَصْبَرَهُمْ عَلی النار ﴾ چ شتێکی سەرسورهێنەرە ئارامی بـەوان گرتـووە لـەسـەر ئاگرێ کە هەرگیز کۆتایی پێ نایەت و نابرێتەوە ، ئەوە بەشی ئەوانەیە کە هـەرچی راسـت و رەوایە بیزانن و پەیرەوی نەکەن ، چونکە خۆیان لە جێگەی خـوادا دائـەنێن ، هـەر لـە خۆیانەوە یاسا و دەستوور دائەنێن ، ئەلّێن : ئەمەیان چاکـە و رەوایـە و ئـەوەیان خراپـە و قەدەغەیە .

﴿ ذلِكَ بِاَنَّ اللهُ نَزَّل الْكِتابَ بِالْحَقْ ﴾ ئەو سزا و ئـازارە بەتینــە کـە توشـیان ئـەبێ بـە بەردەوامی لە بەر ئەوەیە کە بە راستی خوا ناردویەتیـیە خــوارەوە بـەبێ گومـان و نامـەی خۆی کە تەوراتە کەچی ئەوان بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان مانایان ئەکرد دوای پـەیرەوی راست نەکەوتوون کەپێویستە پەیرەوی بکرایە .

﴿ وَ إِنَّ الذينَ اختَلَفوا في الكِتابِ ﴾ وە بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ جیاوازن و دژی یەکترن لە مانا کردنی نامەی خوادا کە هەندێکیان ئەڵێن : ئەو نامەیە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ هەیەتی جادووە و هەندێ تریان ئەڵێن : چیرۆك وئەفسانەی ڕابواردوانە ، بەو کارانە پەیرەوی ئەو شتانەئەکەن لەگەڵ ئاواتی خراپی خۆیان ئەگونجێ ، هەتا وایان لێ هات کۆمەڵ و تاقمیان لێ پەیدا بوو ، ئەوانەیش هەر یەکەیان لایەنگیری پەیرەوی خۆیان ئەکەن، دژی ئەوانی تر ئەوەستن و بە نەزان و گێلیان ئەزانن .

﴿ لَفي شِقاقٍ بَعيدٍ ﴾ بەڕاستی لە ناکۆکی و دژایەتی دان و ناکۆکن لە نێو خۆیاندا و دوورن لە ڕاستی .

لەو ئایەتانەدا هەڕەشەی ئێجگار گەورە هەیە بۆ ئەو کەسانەی ڕاستیئەشارنەوە ، واز لە یاسای قورئان ئەهێنن ، کەواتە هەموو زانایانی موسوڵمان بترسن و لە یاسای قورئان لانەدەن بۆ ئارەزووی خۆیان و پاشایان و شالیاران و کاربەدەستان نەوەك موچەکانیان ببڕن ، یا کەمی کەنەوە ڕێزیان نەمێنێ لایان بۆ پارە وەرگرتن و هاوبەشیان لە خواردن وخواردنەوە و کۆشك وتەلار دروست کردن .

لە مەوبەر خوا باسی گۆڕینی ڕوانگەی نوێژی کرد بۆلای کەعبە ، کاتێ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە موسوڵمانان بۆ ماوەی( ١٦ ) مانگ لە نوێژدا ڕوویان ئەکردە ( بیت المقدس ) ، لە دواییدا خوا فەرمانی دەرکرد بۆ گۆڕینی ڕوانگە بۆلای کەعبە ، بۆیە ڕوویان وەرگێڕا بۆلای کەعبە ، وە گاورەکان ڕوویان کردە ڕۆژهەڵاتی (بیت المقدس) ، وە جولەکەکان بۆلای ڕۆژئاوای ( بیت المقدس ) لەو کاتەدا موسوڵمانان ڕوانگەیان گۆڕدرا ، گاورەکان و جولەکەکان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندە و گێرە شێوێنی ، هەریەکەیان ئەیان ووت : هەرچی چاکە هەیە لە ڕووکردنە بۆلای بیت المقدس و بەس .

بەڵام هەریەکەیان بۆلای خۆیان دایان ئەتاشی ، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دوایی ناردە خوارەوە بۆ نەوەی‌گەوجی ئەوان دەربخا و ڕونی بکاتەوە چاکە لەوەدا نیە ڕوبکرێ بۆ هەرشوێنێ و بۆ هەر لایێ ، ئەفەرموێ :

﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ
ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ
وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟
وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾

﴿ ليس البر ﴾ چاکەی گەورە لەوەدا نییە ڕێگەی هەموو چاکەیە ببیسترێ ، وادابنرێ چاکە هەر لە مەدابێ :

﴿ ان تولوا وجوهکم قبل المشرق والمغرب ﴾ ئێوە ڕوبکەن و ڕووەوەرگێرن بۆ لای ڕۆژهەلات ، وەك گاوەرەکان لایان وایە ، بۆ لای خۆر ئاوا وەك جولەکەکان دایان ناوە .

﴿ ولکن البر من ءامن بالله ﴾ بەلام چاکەی ئەو تۆ پێویستبی کە گرنگی پێبدریت چاکەی کەسێکە باوەڕی بە خوا هێنابێ کە سەرچاوەی هەموو چاکەیەکن ، بەتەنها و تاك دا بنرێ وەهاوبەشی بۆ دانەنرێ لە پەرستندا. نەك وەك باوەڕی گاوەرو جولەکەکان ئەلێن: عیسی و عوزێر کوڕی خوان .پە نا بەخوا لە قەسەی وا.

﴿ واليوم الاخر﴾ وەبڕوای هێنابێ بە ڕۆژی دوای بە هەموو چڵەکانیەوە لە زیندوو بوونەوە و پاداشت و تۆڵە وەرگرتن . نەك وەك گومانی ئەوکەسانەی ئەڵێن :چەند ڕۆژێ نەبێ ناچێتە نێو ئاگرو پێغەمبەران بۆیان ئەپاڕێنەوە .. هەر باوەڕ بە ڕۆژی دوایی پاڵ بە ئادەمیزاداوە ئەنێ بە تەمای بەهەشت و ترسی دۆزەخ و مل کەچی فەرمانی خوابن .

﴿ والملائكة ﴾ وەباوەڕی هێنابێ بە بوون و پلەی هەموو فریشتەکان ، هەموویان بە دۆستی خوادادەنێن ، بەندەی خوان وە بێ فەرمانی خوا ناکەن ، بەڕێزو بێ گوناهن نوێنەری نێوان خوا و ئادەمیزادن ، پەیام و نامەدێنن بۆ پێغەمبەران .نەك وەك جولەکەکان ئەڵێن: جبرئیل دوژمنی ئێمەیە .بێ گومان ئەوکەسەی‌دوژمنی ئەو بێ دوژمنی خوایە.

﴿ والكتاب ﴾ وەبڕوای هێنابێ بە هەموو نامە نێراوەکانی خوا ، جیوازی دروست نەکەن بۆیان . نەك وەك جولەکەکان ئەڵێن :ئنجیل و قورئان نامەی خوا نین ، گاوەرەکانش بڕوایان بە قوران نییە .

﴿ والنبيين ﴾ وەباوەڕیشیان هێنابێ بە هەموو پێغەمبەران کە فرستادەی خوان و فەرمودەیان ڕاستە بەبێ جیاوازی . نەك وەك جولەکەکان باوەڕیان بە عیسی و محمد نییە ، ناو ناتۆرەی نالەبار ئەدەنە پاڵیان ، یان گاوەرەکان بە محمد باوەڕ ناهێنن .

﴿ وءاتي المال علی حبة﴾ وەچاکەکەر ئەو کەسەیە دارایی خۆی بەخشیبێ لە سەردۆستی خۆشەویستی خوا، یان دارایی خۆی خۆشەویستبێ لای خۆی .

﴿ ذوي القربی ﴾ بە خزمە نزیکە هەژارەکانی ، هەموو یارمەتی بێویستی جێبەجێ بکا ، لە کاتی ڕوداوی نالەباردا کۆمەکیان بکات بە گوێرەی توانای خۆی .

﴿ واليتامی ﴾ وە ببەخشێ دارایی خۆی بە هەتیوەکان کە بێ‌بەشن لە میهرەبانی و بەزەیی باوکەکانیان ، گوزەرانی ناخۆش و ڕوداوی نالەباری ڕۆژکار دڵیانی بریندار کردوون ، بۆیە خاوەن سامان پێویستە لە سەریان دڵنەواییان بکەن و یاریدەیان بدەن لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا و هەژاریدا ، جێگەی باوکەکانیان بگرنەوە و نەرم و نیان بن لە گەڵیانا ، ئەگەر هەژاریش نەبوون دیاریان بۆ بنێن و دڵیان بدەنەوە.

﴿ والمساكين ﴾ وە دارایی خۆیان ببەخشن بە هەژاران ،بەو کەسانە دارایەکەیان بەشیان ناکا ، پێویستە یارمەتیان بدرێ بە ئەندازەیە هەژاریەکەیان نەمێنێ .

﴿ وابن السبيل ﴾ وە لە دارایی خۆیان بەشی ڕێبواران و میوانەکان بدا کە دەستیان ناگاتە جێگە و سامانی خۆیان ، ئەوەندەیان بدەنێ بیان گەیەنێ بە جێگەی و نیشتمانی خۆیان .

﴿ والسائلين ﴾ وە ببخشێ لە دارایی خۆیان بەو کەسانەی هەژاری یا ڕووداوی نالەبار پالّی پێوە ناون داوای یارمەتی بکەن . پێویستە خاوەن سامان و خاوەن ودارایی وەلاّمیان بدەنەوە و بڕۆن بە دەمیانەوە پێویستیەکانیان نەهێلّن بە گوێرەی توانا ئیتر با هەژاریش نەبن . کەواتە سەرزەنیشتیان مەکەن.

﴿ وفى الرقاب ﴾ وەدارایی خۆی بخاتە کار بۆ ڕزگار کردنی بەندەکان لە کویلەیی ، بۆ ئەوەی ببن بە خاوەنی سەربەستی خۆیان ،هەروەها بۆ ڕزگار کردنی دیلە موسلّمانەکان و سەر بە موسلّمانان لە بەندینخانەی دوژمنان و بەرەلاّکردنیان ، چاکترین دارایی مرۆڤ ئەوەیە بەندەکان پێ ڕزگار بکرێ.

﴿ وأقام الصلاة﴾ وەچاکە و چاکە کەر ئەو کەسەیە نوێژەکانی بکاو وازیان لێ نەهێنێ نوێژێکی وابێ کاری خراب و داوێن پیسی نەهێلّێ ، لە بەرامبەر گەورەیی خوادا بوەستێ بە هۆش و بە گۆشوە .نەك وەك جولەکەکان و بەکرێ گیراوەکانیان یا بە زۆری کوتەك بە بلاّوکردنەوە پڕپاگەندەی گلاّویان نەیەلّن نوێژ بکرێ و دوو دلّی ئەخەنە دلّی ئادەمیزاد .

﴿ وءاتى الزكاة ﴾ وەچاکە و چاکە کەر ئەو کەسەیە ببخشێ زەکاتی سامانی و دارایی خۆی بەو هەشت تاقمە لە سورەتی تەوبەدا لە ئایەتی (٦٠) باسیان ئەکرێ بەو جۆرەی یاسای ئیسلام ڕوونی کردۆتەوە لە ئایەتی (١١٠)لەم سورەتەی ئەلبەقەرەدا بە درێژی باسمان کرد ، زەکات جوانترین شێوەو بەلّگەی پاك بوونەوەیە لە گوناە و نەخۆشی و ڕژدی ، هەتا بتوانرێ پێویستیکانی جێبە جێ بکرێ .

﴿والموفون بعهدهم ﴾ وەچاکە و چاکە کەر ئەو کەسانەن پەیمانەکانی خۆیان بەجێ دێنن بۆ ئەو شتانەی فەرمانیان پێدراوە بیکەن ئەو شتانەی قەدەغەکراوە نەیکەن یانی هەڵسن بەو پەیمانەی بەستویانە لە نێوان خۆیان و خوادا و لە نێوان ئادەمیزادیشدا بەو جۆرە بن ئەبنە جێگەی بڕوای ئادەمیزاد و پاداشتی خوا .

﴿اذا عاهدوا ﴾ هەرکاتێ پیمانیان داوە ، بە کاری دینن بە هەر چۆنێ داوایان لێ کراوە دژی پەیمانەکانیان هەڵناسن پەیمان دوو جۆرە :

**یەکەم** : ئەو پەیمانەی داویانە بە ئادەمیزاد دەربارەی کڕین و فرۆشتن قەرز و مامەڵە، باوەر داری چاکە کەر ئەو کەسەیە بە هەر جۆرێ پەیمانی داوەبەجێی بهێنێ بە خۆشی خۆی نەك بە زۆری قەمچی وداری دادگا ،چونکە پێچەوانەی پەیمان لە کەسانەدا قەدەغەیە بەلاّم وادەدان بە کەسێ بۆ پێکهێنانی کارێ بە و وادایە هەڵنەسێ گوناه بار نابێ ، هەرچەندە رەوەشتی ئاینی پەروەران داوای لێ ئەکا وادەی خۆی بیباتە سەر بە مەرجێ لە گوناهەوە دووربێ .

**دووەم** :ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا بۆ جێ بە جێکردنی فەرمانەکانی خوا لە کردنی فەرمانە رەواکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان .

﴿ والصابرین فی البأساء والضراء﴾ وە ئەو کەسانە پەیمانەکانیان بە جێ هێناوە خۆ ڕاگرن لە بەر ڕەزای خوا لە هەژاری و تەنگانە و دەست کورتی دا بە بەشی خۆی قنیات ئەکا خۆڕاگرن لە کاتی ئێش و ئازار و تەنگ و چەڵەمەدا .

﴿وحین البأس ﴾ وە ئارام گرتن لە کاتی کۆشش و جەنگ دا لە گەڵ دوژمنانی ئیسلام بۆ سەرکەوتنی ئایینی ئیسلام.

﴿ اولئك الذین صدقوا واولئك هم المتقون ﴾ ئەو کەسانەن ڕاستیان کردوە بە بێ گومان لە کاتی ئایین و پەیمان و پەیرەوکردنیان بۆ بەرزی ئاین ئەو کەسانە هەر ئەوانن خۆیان پاراستووە لە بێ باوەڕی لە هەموو کار بیر باوەڕی خراپو نالەبار بە کورتی خوای

گەورە سنوری چاكە و ڕاست و ڕەوا ی بۆ هەموو ئادەمیزاد ڕوون كردۆتەوە بەم جۆرەی خوارەوە :

بیروباوەڕی چاك و هەڵسان بە فەرمانی خوا بەجۆرێ بەچاكە دائەنرێ باوەڕ بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەكان و نامەكانی خوا و پێغەمبەران هێنانی ، ئەو كەسانەی بڕوای بەوانە نەبێ بڕوای بە ڕۆژی پرسیار نەبێ یەكەمین پنچینەی چاكەی ڕوخاندوە ،یەكمین دەرگای چاكەی پێوەداوە .

ڕاستی بێگومان بە یارمەتی دانی كۆمەڵەی ئادەمیزادا بەوە ئەبێ ببەخشێ دارایی خۆی هەر لە بەر خۆشەویستی خوا بێت بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و داواكەران ئەو كەسانەی دەیانەوێ ئازادی و سەربەستی خۆیان بكڕن ، ئەو كەسانەی خاوەنی ئەمانەن خاوەنی ئەو داراییە ئەو كەسان و بەس :

خزمان و هەتیوان ، هەژاران و ڕێبواران . داواكەران و ڕزگاركردنی بەندەكان و پاك كردنەوەی مرۆڤ دڵی خۆی لە چڵك و گوناه ، هەڵسان بە پێویستی خۆی بەم شتانە ئەبێ : بە جێهێنانی نوێژو بەخشینی زەكات و بەجێهێنانی ئەو پەیمانەی داوێتی ، خۆ ڕاگرتن لە كاتی گرانی و نەخۆشی تەنگانە دا، بۆمان دەركەوت هەرلەم یەك ئایەتەدا بنچینەكانی باوەڕو بێ سپێراوەكانی لەش و دابەشكردنی دارایی كۆكراوەتەوە ، هەموویان لە یەك ناپچڕێن و بەتاكە شتێكی نە پساو دائەنرێن ، بەوە سنورێكی تەنهاییش دائەنرێن لە چاكەدا.

پێویستە مرۆڤ هەموویان بە جێ بێنێ . بەڵام ئەگەر لەبەر خوا نەبێ ، یا باوەڕی بەیەكێكیان نەبێ بەبێ باوەڕ دائەنرێ وسوودیان لێ وەرناگیرێ ، وایش ئەبێ ئەو هەموو چاكانە لە بێ باورێكەوە پیدا ئەبێ . بەڵام بە هیچ شتێ ناچێ ، چونكە وەك بێژرا لە یەك چوێی ناكرێنەوە .

بەر لە هاتنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەگەر دووهۆز لە عەرەبەكان ببوایە بەجەنگیان ، ئەوەیان بەدە سەلات بوایە ژنەكانی ئەوانی تریان بەخۆرایی ئەخواست ، سوێندیان ئەخوارد ئەگەر بەندەیەكیان بكوژرێ مرۆڤێكی سەربەست ئەكوژین ، ژنمان بكوژرێ پیاوێ ئەكوژین لە بریتی یەكێكمان دوو پیاوو ئە كوژین ، لە تۆڵەی پیاوێكی بێ نرخ ناوداری ئەكوژین ئەو ستەمە گەورەیە بەردەوام بوو هەتا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نێردرا لەو كاتەدا دوو هۆز ڕووداوی

کوژراویان هێنایە خزمەت پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ئەم ئایەتەی خوارەوە فەرمانی پێدان تۆڵە سەندن بە یەکسانی ئەبێ ، ئیتر بە هەر جۆرێ و بەهەر پلەیە بن کوژراو بکوژ بۆیە خوا فەرمووی :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾

﴿ یأیها الذین آمنوا ﴾ ئەی کەسانێك ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە لەکاربەدەستان و فەرمان بەران کە کاروباری ئادەمیزادتان پێ سپێراوە لە لایەن سەرۆکی گەورەی موسڵمانانەوە .

﴿ کتب علیکم ﴾ نووسراوەو پێویست کراوەو لە سەر ئێوە کاتێك خاوەن کوژراو داوای لێ کردن. یانێ ئەو پێویستە ڕوودەکاتە کار بەدەستان کاتی داواکردنی خاوەن کوژراو و بەس . نەك خاوەن خوێن ، چونکە ئەوان بۆیان هەیە لە بکوژ ببورن و خوێن بسێنن ، وەك ئەتوانن داوای کوشینتیسش بکەن ووەڵامیان بدرێتەوە .

﴿ القصاص في القتلى ﴾ تۆڵە سەندنەوەی یەکسانی لە کوشتندا بەهۆی کوژراوەکانەوە کاتی کوشتنەکە بەدەستی ئەنقەست بێت . خوای گەورە جۆری کوشتنەکەی ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

﴿ الحر بالحر ﴾ سەربەست و ئازاد ئەکوژرێت بە هۆی کوشتنی سەربەست لە تۆڵەی ئەودا ، یانێ ئەگەر سەربەستێ سەریەستیێکی کوشت ، هەر بکوژەکەی ئەکوژرێت بەتەنها، هەروەها ئەمانەی دووایش .

﴿ و العبد بالعبد ﴾ وە بەندەیش ئەکوژرێت لە تۆڵەی بەندەیە نەك ئازاد بکوژرێت لە تۆڵەی بەندەدا وەك بێ باوەڕان دەیان کرد .

﴿ و الأنثى بالأنثى ﴾ وە ژن لە تۆڵەی ژن دا ژن ئەکوژێت ، ئەو ئایەتە پیرۆزە (٣) وێنەی ڕوون کردۆتەوە کەئازاد بەئازاد ئەکوژرێ بەند بەندە و ژن بەژن ئەکوژرێ ، بەلاّم ئەو ئایەتە پیرۆزە (٤ ) وێنەی تر ماوە بۆمانی باس نەکردووە ئایا ئازاد بە بەندە ، بەندە بە ئازاد پیاو بە ژن و ژن بە پیاو ئەکوژرێت یان نە لە وەلاّمی ئەوەدا ئەبێژرێت : دەقی ووتراوی ئایەتەکە وەك باسی (٣) سێ‌بەشیانی کردووە . بەلاّم نە بەدەق وە نەبە ناوەرۆك باسی ( ٤) بەشەکەتی تری نەکردوە نە بە بوون و نە بەنەبوون، لەو باوەڕەیشدا پێشەوایان مالیك وشافیعی و ئەحمەد لایان وایە سەربەست بە بەندە ناکوژرێت، پێشەوا حەنەفی لای وایە ئەکوژرێت لە تۆڵەی جگەی بەندەی خۆی نەك بەندەی خۆی ژن بە پیاو بەندە بە ئازاد ئەکوژرێت بەلای هەر چواریانەوە هەروەها چەند کەسێ لە تۆڵەی یەك کەس دا ئەکوژرێت لە کوشتنی دەستیان قەسدا .

﴿ فمن عفى له من اخيه شئ ﴾ دووایی هەرکەسێ وازی هێنا لە بۆ سوودی بکوژە براکەی لە لایەن خاوزەن خوێنە براکەی شتێك لە خوێنی کوژراوەکە یان هەندێ لە میراتبەرەکان شتێك لە خوێنەکەی خۆش بون یان هەندێکیان لە تۆڵە سەندنەوە بە کوشتن وازیان هێنا یان لە هەموو خوێنەکەی بوردن ئەوانە لەهەموویانا بکوژ ناکوژرێت لێبووردن کە بە خوێن بوو پێویستە بە جۆرێ بێت کە ئەفەرموێ .

﴿ فاتباع بالمعروف ﴾ دووایی پێویستە خوێندەرو خاوەن خوێنەکان پەیڕەوی چاکەو خۆشەویستی بکەن دووای لێبوردن هیچ لایەکیانەن نەکەونە ئازاری یەکتر ی دا ن نە بە

دەست نە بە دەم ، خاوەن خوێن داوای زۆرتر نەکات ، بکوژیش بــە چـاکی و بـێ سـەر چەوتی خوێنەکە بدات.

﴿ و اداء اليه باحسان ﴾ وە پێویستە لە سەر بکوژ ببەخشێ بە میرات بـەری کـوژراو خوێنی کوژراو بە بـێ سـەر چـەوتی و بـەد ڕەوشـتی هـەروەك پێویسـتە کـار بەدەسـتان کەمتەرخەمی لەو بارەیەوە نەکەن ، پوختەی مانای ئـەو ئایەتـە ئەمەیـە : خـوای گـەورە پێوستی نەکردووە بۆ خاوەن خوێن کوشتنی بکوژی دەسـتیان قەسـت هـەروەك پێویستی نەکردووە لە سەر بکوژ بەخشینی خوێن کە بیەوێ خـۆی بدایـە دەسـتەوە بـۆ کوشـتن، بکوژیش بۆی نیە بیسەپێنێ بەسەر خاوەن کوژراودا وەرگرتنی خوێن ئەگەر بیانەوی خۆیان بدەن بەدەستەوە بۆکوشتن ،بکوژیش بۆی نیە بیسەپێنی بەسەر خاوەن کوژراودا ورگرتنـی خوێن ئەگەر بیانەوێ بیکوژن بەڵکو هەردوولایان بەبێ لەڕودامان لەنیو خۆیانا بە خۆشـی بێك بین وەئاشتەوایی بکەن لە سەر خوێنی تەواو یازۆرتر یان کەمتر بـە خۆشـی پێـك بـین لەجیاتی کوشتنی یەکسانی دوای پێك هاتن پێویستە تێکی نەدەن پێویستە لە سـەر خـاوەن کوژراو داوای ئاشتەوایی چاك بکا تەنگ بـەبکوژ هەڵنـەچنێ داوای خوێنـی گـران نـەکا وەپێویستە لە سەر پیاکوژیش خوێنەکەی بەچاکی بـداو سـەرچەوتی نـەکا بێکـەمووکوڕی بێت وەئازار بەکار نەهێنێ .

﴿ ذلك تخفيف من ربكم ورحمة ﴾ ئەو لێبوردنە لــە کوشـتنەوەی یەکسـانی وەداوای خوێنکردن سوکیو ئاسانە لە لایەن پەروەردەکەرتانـەوە میـهرەبانی و بەخشـندەییە کـە بـۆ ئاسان کردنی کاروو بارتان و پیداکردنی سودتان لە نێوان براکانتانا .

﴿ فمن اعتدى بعد ذلك ﴾ دووای هەرکەسێ سنور بشـکێنێ و دەسـت درێـژی بکـا دووای لێبوردن و خوێن وەرگرتن ، یانی بەکوشتنی بکوژەکە ، یا کەسێ تر لە گەڵ خوێن وەرگرتندا بکوژێت .

﴿ فله عذاب أليم ﴾ دووای بۆئـەو کەسـە هەیـە سـزایەکی زۆر ئـازاردەرترو بـەئێش لەجیهاندا بە کوشتنەوەی یەکسانی و لە دووا ڕۆژدا بە ئاگری دۆزەخ سزائدرێ .

﴿ ولكم في القصاص حياة ﴾ وەبۆ ئێوە هەیە لە فەرماندان بە تۆڵەسەندنەوەی یەکسانی مانەوەتان بە ژیانێکی ئاسودەیی . یانی ئەگەر کەسێ بیەوێ مرۆڤێ بکوژێ وەترسا لە وەی

ئەیکوژانەوە کەمرۆڤەکەی کوشت و ئەو مروڤە نەمایەوە ، تۆڵەی لێ ئەکرێتەوە بە کوشتن واز لەکوشتن ئەهێنێ . کەواتە ژیان و مانەوەی هەردوو لایان پایەدار ئەبێ .

﴿ يا أولي الالباب﴾ ئەی ئەو کەسانەی خاوەن ئەقڵ و ژیرن چاك وخراپ جوێی ئەکەنەوە، ئەو ڕستەیە ئەمەمان فێرئەکات هەر مرۆڤێ ژیر بێ بە وردبونەوە سودی تۆڵە سندنەوە یەکسانی ئەزانێ .

﴿ لعلكم تتقون ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان بپارێزن لە کوشتنی ناڕەواهەتا خۆتان وخەڵکیش بپارێزن لە کوشتن ، کاری ئاسان بکەن وەلە خوا بترسن وەدەست درێژی نەکەن . ئەو زانایانە مانای قورئانیان کردوە لە بارەی خۆش وێژی رەوانی پاراوی ئەو ئایەتە زۆریان نوسیوە ئەگەنە پترلە ( ١٣) سێزدە جۆر مانا کردن ، هەموویان ئەگەڕێنەوە وە بوڵای دارڕاندنی زۆر شایانی جۆری ووتنی ووشەو ڕستەکانی بە شێوەی بە کەس نەکراوە ،زۆربەی ماناکان پەیوەندیان بە ناوەڕۆك هۆی ڕاست و بەرزو بە نرخی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەوە نیە بۆچی فەرمان دراوە بە تۆڵە سەندنەوەی یەکسانی لە وەلام دا ئێمە ئەڵێن : ئەو فەرماندانە بۆ بنەبڕکردنی تاوانی کوشتنە چونکە کوشتن ، بە دەست ئەنقەست بە ستەمناکترین تاوان دا ئەنرێ بۆ نەهیهشتنی ئاسایش بۆیەش تۆڵەکەی لە هەموو یاسایەکا پێویستە بە گرانترین تۆڵە بێ بۆیە زۆر جاران بکوژیان کوشتوە ئەو تاوانە خراپە دەستی پی کردوە لە کاتی پەیدابوونی کۆمەلی ئادەمیزادەوە لە هەموو یاساو ئایینە کۆنەکان دا باسی ئەو تاوان و تۆلەیانە کردووە هەر یەکەیان بە جۆرێ : یاسای تەورات پیویستی کردوە لە سەر کاربەدەستان و خزمانی کوژراو هەرئەبێ تاوانبار بکوژرێ لە تۆڵەی کوشتندا بە بێ چەندو چوون گاورەکان میهرەبانی لە گەڵ تاوانبارو پیاوکوژدا بەکاردێنن و نای کوژنەوە بە بیری ناتەواوی خۆیان ،کەسێ کوژرا با کەسێ تر نەکوژرێ وەمانەوەی باشترە : ڕۆمانەکان پیاوەگەورەکانیان مرۆڤێکان بکوشتایە نەیان ئەکوشت بەڵکو دووریان ئەخستەوە بەڵام ئەگەر پیاو کوژ لە مام ناوەندیەکان بوایە ئەیان کوشت ، ئەگەر بکوژ لە چینە خواروەکان بوایە ئەیاندا لە دار و هەڵیان ئەواسی ، لە دوای ماوەیە بە زیندویی فڕێیان ئەدایە نێو مۆڵگای درندەکانەوە هەتاپارچەپارچەیان ئەکرد دوایی ئەوەیان گۆڕی بە خنکاندنی پیاو کوژ، عەرەبەکانی پێش ئسلام بە کوشتنی ڕازی نە ئەبون بگرە لە گەڵ

بکوژدا چەند مرۆڤی تریان ئەکوشت، لە بریتی بکوژ کەسی تری بێ تاوانیان ئەکوشت بەلاّم یاسای بەرزی ئیسلام ڕێگەی مام ناوەندی گرت لە نێو هەموو یاساو ئاینە کاندا هەتا بەبیٚ گۆڕان کۆمەڵێ ئادەمیزاد بیکەن بە یاسا تاوانی کوشتنی پیٚ بنبڕ بکەن ، بڕیاری دا تۆڵە بکرێتەوە لە بکوژ هەر بەکوشتنی خۆی و بەس ، یان میرات بەرانی کوژراو وەکە لەبریتی کوشتنی خوێن لە بکوژ وەرگرن : کاربەدەستانیش بۆیان نیٚیە سەربەخۆ بن لە کوشتن و وەرگرتنی خوێن و لێبوردن لە پیاوکوژ بەبیٚ پرسی خاوەن کوژراوەکە . بەلاّم بۆیان هەیە بکوژ بخەنە ژێر چاودێری هەتا ڕەوشتی خۆی چاك دەکات ، هەروەها چاودێری خزمانی کوژراویش بکەن نەوك ئازاری بکوژ بدەن . ئەگەر زۆر بە قوڵی بیر بکەینەوە لە شاراوەی زۆر ووردو بەنرخی مانای ئایەتی ﴿ ولکم فی القصاص حیاة یاأولی الألباب ﴾ بۆمان ڕوون دەبێتەوە وەك دەستدرێژی بۆ گیانی مرۆڤیٚ دەست درێژی کردنە سەر هەموو کەسیٚ چونکە هەموو کەس نێرو میٚ بیەوێت بژی کەس ناکوژیٚ وا ئەزانیٚ ئەی کوژن ، هەموکەس لە ئاستی خۆی بەو جۆرە بیٚ وەکەس نەکوژیٚ ژیانی هەموو کەس بەردەوام ئەبیٚ .بە کورتی پێویستە بۆجیٚبەجیٚکردنی یاسای قورئان ئەمانەی خوارەوە جیٚبەجیٚ بکەین:

١. پێویستە لە سەر کاربەدەستانی میری فەرمانی قورئان بەسەر پیاوو کوژاندا بسەپێنن بەو جۆرەی خاوەن کوژراوەکان ئەیانەویٚ بۆ ئەوەی کۆمەڵیٚ ئادەمیزاد بە ئاسوودەیی بژێن.

٢. بۆیان نیە جگە لە پیاکوژ کەسی تر بکوژن ، چونکە ئەگەر وانەکەن تاوان تەشەنە ئەکا وەنابڕێتەوە . بەدەیان تاوان پەیدا ئەبیٚ

٣. قەدەغەیە لەجیاتی تاوانبار باوکی یا کوڕی یا برای یا خزمی بکوژرێن لە بەر ئەوەی باسی تۆڵەی یەك سانی ئەکریٚ ، چەندین ڕوداوی کۆمەلاّیەتی پەیدا ئەبیٚ .لەو بارەیەوە ، ئەتوانین واچاکە باسی هەندیٚ لەو گومان و بوختانانە بکەین دوژمنانی ئیسلام ئەیدەنە پاڵ ئەو فەرمانە بەرزانەی قورئان ،ئەو بوختانانیش ئەمەیە ئەڵێن :کوشتنی پیاوکوژ فەرمانێکی دڕندانەیە، کەسیٚ کوژرا بۆ کەسی تر بکوژریٚ و بەتاوانی دائەنێن لە وەلاّمدا ئەڵێن : بێگومتان تاوان و دەست درێژی بۆ سەر گیانی مرۆڤێکی بیٚ تاوان ئەوپەڕی

درندەییە نەك كوشتنی یەكسانی ، لەكوێدا درندەیی ئەبینرێ تۆڵە بسێنرێ لە مرۆڤێكی تاوانبار بەرانبەر لەگەڵ ئادەمیزادێكی بێ تاوان بجولێتەوە بەكارهێنانی مرۆڤایەتی و نەرمی لەگەڵ تاوانباری دڵ رەق و میهرەبانی لەگەڵیا كارێكی نەوتراو نەبێژراوە و نەبیستراوە لە هیچ خاوەن ئەقڵ و خاوەن ویژدانێكدا مرۆڤی خاوەن هۆش و هەست چۆنی بەڕەوا دائەنێ پیاو كوژان ڕێزیان بگیرێ ، بگرە بەكارهێنانی چاكە لە گەڵیان تاوانە بۆ سەر مافی كۆمەڵێ لە ئادەمیزاد وە ئابروبردنیانە و دەست درێژ یە بۆ سەر هەستی دەیان كەس بۆ دڵخۆشكردنی جانەوەرێكی پیاو خۆر و خوێن مژ و دڵ پیس، زۆر جێگەی سەرسورمانە نەزانان و دوژمنانی ئیسلام بەو پروپاگەندەیە ئەیانەوێ تانە لە یاسای خوا بدەن ، بەنەزانین ئەیانەوێ ئاگری كینەو و دڵی پیسیان ئاو پێداكەن و ئەیانەوێ ساویلكەكان بیخەڵەتێنن ئەو كەسانە كۆمەڵەی ئادەمیزاد بە كۆمەڵی لە ئاژەڵ دا ئەنێن و ئەڵێن ئەگەر گیانەوەرێ گیانەوەرێ تر بكوژێ نەفامیە ئەوی تر یان بكوژێ و زیانە كوشتنەوەی بەبیری ناتەواوی خۆیان ئەڵێن : ئەو گیانەوەرە چەموشە لە ئاژەڵەكە دوور ئەخرێتەوە بۆماوەیە هەتا ژیر ئەبێ و رام ئەبێ لەسەر ئەوە هاورێكانی نەكوژێ ، لە دوایدا ئەیگەڕێننەوە بۆ ناو ئاژەڵەكە هەتا بەیەكەوە بژین و بەبێ وەیی ئەو خاوەن ووتەو خوارو خێچانە و بیر لاوازانە بە هەموو گەوجێكیانەوە ئاژەڵ ئەكەن بە وێنەی كۆمەڵێ ئادەمیزاد و ئەڵێن : مرۆڤی پیاو كوژ تۆڵەی بە كوشتنی یەكسانی لێ ناسێنرێ بۆ ئەوەی كاربكا سامانی پتر بێ بەو بۆنەوە بە گوێرەی خاوەن ستەمیانەوە بۆ چەند ساڵێ ئەیخەنە بەندیخانە وە هەتا ژیر ئەبێ وە خۆی چاك ئەكا و بە خۆشی و بەبێ وەیی دێتە وە نێو كۆمەڵگای ئادەمیزاد بەبێ ناكۆكی بە بەیەكەوە ئەژین دوژمنایەتیە كە لەلایەن گیری مانەوەی پیاوكوژ و خوێن مژان ئەكەن بزانن و نەزانن نایانەوێ ڕێزی بگرن و بە زەییان بە وانا نایەتەوە بەڵكو ئەوان ئەیا نەوێ لەو ڕێگەیەوە پارەو و پولی پێ پەیدا بكەن و بەكاری بێنن بۆ تاوانی پیسی خۆیان وە چاو لەو مرۆڤە بێ بەشەكە ناكەن بە دەستی پیسی ئەو گیانی پاكی لەدەست چووە وە هیچ نرخێكی نە بۆ ئەو كوژراوە نە بۆ دایكە دڵسوتاوە كانی دانەنراوە وە چەندین منالی شیرە خۆریان بێ باوك و كردووە وە پاڵی پێوە ئەنێن و هانی ئەدەن بۆ تاوانی تر .

ئەو کەسانەی ڕەخنە لەیاسای خوا ئەگرن و تانەی لیٚ ئەدەن ، ڕێزی تاوانباران وپیاو کوژان ئەگرن ، بەلایانەوە وایە بەدوررخستنەوەیان بۆ ماوەیەك بەسە بۆ چاك کردنی خۆیان، نازانن هانی ئەدەن بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی تری تاوان نەك جاریٚ بەڵکو چەند جاریٚ ، بۆ نمونە ( تۆماس لارش ) لەئەنجامی کوشتنی چەند مرۆڤێکی بیٚ تاوان نەیان کوشت لەتەمەنی (٢٣) بیست و سیٚ ساڵیدا فەرمانی بەندیان دا لەبەندیخانەی ناوەندی (شیکاگۆ) بۆ ماوەی (٣٠٠) سیٚ سەد ساڵ ، بۆ ماوەیە هێنایانە دەرەوە لەبەندیخانە بۆ پشودان ، تاوانەکانیشی بریتی بوون لەکوشتن و دزی و قومار، ئەوەی شایانی باس بیٚ پاش ئەو بەندە زۆرە بەبیٚ بیانو پەلاماری کچێکی شازدە ساڵەی دا و کوشتی و بەپەلە گەڕانیانەوە بەندیخانە .

ئەوەی پێویست بیٚ بکریٚ هەندیٚ لە ڕۆژئاواییەکان بەناچاری پەشیمان بونەوە ، فەرمانی کوشتنی پیاو کوژی دەستیان قەستیان دەرکرد و کردیانەوە بەیاسا . پاش ئەوەی بەچاوی خۆیان هەزاران مرۆڤی کوژراویان بینی ، نزیکترین وێنەی نەتەوەی سەر زەوی وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە سەرۆك کۆمار ( فۆرد ) بۆ سەرکەوتنی خۆی لەهەڵبژاردندا لە ( فلۆریدا ) بڕیاری دا تۆڵە سەندنەوە لە پیاوکوژان بگێڕێتەوە بۆ کوشتیان و بەس . لە دووانەکەیدا ووتی : نەکوشتنیان هانیان ئەدا بۆ تاوانی گەورەتر ، هەروەکو کوشتنیان ئەبێتە هۆی کەمبونەوەی کوشتن ئەگەر بنەبڕی نەکا ، بێگومان گەڕانەوەی ئەو نەتەوانە بۆلای کوشتنی پیاو کوژان وپەشیمان بونەوەیان گەورەترین بەڵگەیە بۆ ووردوخاش کردنی بلاوکردنەوەی تانەدان لە پەیڕەوی ئیسلام ، بەهێزترین گەواهیە ئەو ئاینە نەگۆڕاوە یاسا و ئاینی خۆایە و پەوەردگاری بونەوەرانە کەبەر لەهەزار و چوا سەد و هەژدە ساڵ فەرمانی داوە بەکوشتنی یەکسانی بەبیٚ گۆڕان ، بائەمەیش بزانریٚ خاوەنی ژیر و ئەقڵ نەبیٚ لەوانەی ڕابووردن ناگا ، بۆیە خوا ڕویان تیٚ ئەکا و ئەفەرمویٚ: ﴿ یا أولی الألباب ﴾ کەواتە لای ئەوان ڕوون و ئاشکرایە ئەو سودانە لەسەپاندنی یاسای قورئاندا هەیە لەماوەی نزیك و دووردا مەگەر هەر ئەوان بیزانن ، ئەوانەیش بیزانن و لەخوا ناترسن و بیر لەمانای قورئان ناکەنەوە وەك چوارپیٚ وانە و گومڕا و سەر لیٚشێواون .

خوای گەورە بەشی میراتبەرانی لە باوك و دایك و خزمانی تری مردووان لەمیراتبەران ڕون کردوەتەوە لەقورئانی پیرۆزدا کەواتە ئەو کەسانە بەشیان نادرێ لەڕاسپاردەدا (وصیة) بەڵام وائەبێ ئادەمیزادێ دارایی زۆر ڕەوا و پاك بەڕێگەی ئاینی پەیدا ئەکا و لەدواییدا ئەمرێ ، باوك و دایك و خزمی وای هەیە بەشیان لەمیرات نادرێ چونکە لە سەریەك ئاینی نین ، بەگوێرەی یاسای ئیسلام میرات ناگرن لەو مردووە ، یا کوڕێکی بەر لەخۆی ئەمرێ ، کوڕەزاکانی کوڕەکەی میراتی لێ ناگرن ، یاخزمی هەژاری میرات نەگری هەیە ،لەو کاتانەدا واچاکە ڕاسپاردە بکا ئەو کەسانە بەشیان بدرێ لەداراییەکەی بەو ئەندازەیە بۆیانی دیاری ئەکا ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

كُتِبَ عَلَيْكُمْ
إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ
وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ
بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾
فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ
عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾

﴿ كُتِبَ عَلَيكُمْ ﴾ نوسراوە و پێویست کراوە لەسەر ئێوەی باوەردار .

﴿ اِذا حَضَرَ اَحَدَكُمُ المَوتُ ﴾ کاتێ لە ئێوە نزیك بوویەوە مردن ، بە دەرکەوتنی نیشانەکانی و پێشەکییەکانی ، وەك پیری و نەخۆشی ، بۆتان دەرکەوت مردنتان نزیکە.

﴿ اِنْ تَرَكَ خَيراً ﴾ ئەگەر ئەو کەسەتان بە جێ هێشت دارایی زۆر ، زۆرییەکەشی بە گوێرەی توانای مرۆڤە ، چونکە وا ئەبێ ئەندازەیێ بۆ کەسێ کەمە و بۆ کەسی زۆرە.

﴿ الْوَصِيَةَ ﴾ پێویست کراوە لەسەر ئەویەکەتان راسپاردە ، یانی ئەندازەیە لە دارایی خۆی دیاری بکات .

﴿ لِلْوالِدَينِ وَلأَقْرَبينَ ﴾ بۆ باوك و داییك و خزمانی ، ئەوەمان لە بیر بێ راسپاردە پێویستبوە بەر لە هاتنە خوارەوەی ئایەتی میرات ، دوای هاتنە خوارەوەی ئەو کەسانەی بەشیان بۆ دیاری کرا لە میرات بەشیان لە راسپاردە نەما ، بەلاَم فەرمان کردن بە فەرمانی راسپاردە هەر مایەوە بۆ ئەوانەی میرات ناگرن لە باوك ودایکێ ، لەگەلْ مردووەکەییاندا ، ئاینیان جیاواز بێ ، هەم بۆ ئەو خزمانەی میراتیان نەئەبرد .

﴿ بِالْمَعروفِ ﴾ راسسپاردەکە بە جۆرێك دادپەروەری و چاك بێ ، یانێ جیاوازی نەخاتە نێوان هەژار و سسامانداار ، یا بێبەشیان بکا هەروەها راسپاردە ڕێك بکەوێ لەگەلْ چۆنێتی راسسپاردە بۆ کراو یانێ ئەوەندە کەم نەبێ نرخی بۆ دانەنرێ ئەوەندەش زۆر نەبێ زیان لە میرات بەران بدات ، واتە لە سێیەکی دارایی زۆرتر نەبێ .

﴿ حَقّاً على الْمُتَّقينَ ﴾ هەلْسان بەو راسپاردەیە بەو جۆرەی خوا کردوویەتی بە یاسا دروشمێکی پێویسست کراوە لەسەر ئەو کەسانەی خۆیان لە گوناه ئەپارێزن ، وە لە رۆژی دوایی ئەترسن ، هەموو یاسا نوسانی ئیسلام پێك هاتوون لەسەر ئەوەی راسسپاردە بۆ میرات بەران دروست نی‌یە ، چونکە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ئەفەرمویی ﴿ فَلا وَصيةَ لِوارثْ﴾ راسپاردە بۆ میرات بەران دروست نی‌یە .

﴿ فَمَنْ بَدَّلَهُ ﴾ دوایی هەر کەسسی راسپاردە کردنەکە بگۆڕێ و تێکی بدات ، یانیی هیچ کەسی لە شایەت و ئەو کەسانەی کار و باری کەلەپوریان پێ سپێردراوە بۆیانْ نی‌یە دەست کاری راسپاردە بکەن نەبەکەم و نەبە زۆر ، یا کەسێ لەوانە ڕاسپاردە کەر ناوی بردووە دەری بکەن یا کەسێ تر بەشدار بکەن .

﴿ بَعْدِ ما سَمِعَهُ ﴾ دوایی شتی بیستبووی لای راسپاردەکەر و لای ڕوون بوویێتەوە.

﴿ فَاِنَّما اِثْمُهُ على الذينَ يُبَدِّلونَهُ ﴾ دوایی بەڕاستی گوناهی ئەو گۆڕانە هەر لەسەر ئەو کەسانەیە ڕاسپاردەکە ئەگۆڕن ، ئیتر لە میرات بەران بن یا کاربەدەستان یا کەسێ تربێ.

﴿ إِنَّ اللّٰهَ سميعٌ عَليمٌ ﴾ بە راستی خوا هەمو شتی ئەبیستی لە ووتە ڕاسپاردە کەران و تێکدەران وشاراوەی دلّیان ، ئەیشیانزانێ . ئەو ئایەتە ئەمەمان پێ فێر ئەکا هەر کەسێ گوناهێ بکا سزا وتۆڵەی هەر لەسەر خۆیەتی نەك لەسەر کەسێ تر . ئەگەر مرۆڤێ ڕاسپاردەی کرد بۆ خزمانی ئەو کەسانەی لە سەریەتی بۆی بدەنەوە و بیبژێرن بۆ خاوەن مافان گوناه لەسەر مردوو نامێنێ ، ئەو کەسانەی کاری دانەوەیان پێ سپێردراوە گوناهبار دەبن بۆیانی نەبژێرن ، بۆ یە زانایان ئەلێن ئەو ئایەتە بەلگەیە لەسەر ئەوەی منال بە گوناهی باوکی سزای نادرێ وەك : خوا فەرموویێ :

﴿ وَ لا تَزِروا وازرة وزر اخرى ﴾ هیچ گوناه کارێ گوناهی یەکێ تر هەلناگرێ .

﴿ فَمَنْ خافَ مِنْ موصٍ جَنَفاً ﴾ دوایی هەر کەسێ لەو کەسانەی کاروباری ڕاسپاردەیان پێ سپێردراوە ترسان لە ڕاسپاردەکە هەلّیە لە ڕاسپاردەدا یا لە ڕاستی لایدا ، یا ترسا لە ستەمێ ، بە نەزانین خۆی لە ڕێگە لایدا ، گۆڕینی نارەوای دەرکرد بەرامبەر خزمانی خۆی ، وەك ئەوە کە ڕاسپاردە کە لە سێ یەکی دارایی یەکەی زۆرتر بوو ، یا بۆ کارێکی قەدەغە بوو .

﴿ اَوْ اِثماً ﴾ وەیا لە ڕاسپاردە کەرەکەوە بە دەست ئەنقەست گوناهی لێ دەرکەوت و ستەمی بە ڕاسپاردە کردنی پتر لە سێ یەك ، یا هەندێکیان بێ بەش کرد ، هەتا دێ .

﴿ فأصلح بينهم ﴾ دوایی چاکەی کرد لەنێوانیانا بەگەڕانەوەی ڕاسپاردەکە بۆلای دادپەروەری بۆهەمویان .

﴿ فَلا اِثمَ عَلَيهِ ﴾ دوایی هیچ گوناهێ لەسەر کاربەدەستان و خاوەنی مردوەکە نییە ، ئەیانەوێ چاکە بکەن لەگەلّ زیندووەکان ، خوای گەورە چاکە کردن لەگەل زیندەوەران بە کارێکی گەورە دائەنێ ، گۆڕانی کاری خراپ بۆلای ڕاستی بگۆڕێ قەدەغە نییە ، قەدەغە ئەوەیە ڕاستی بگۆڕی بۆلای خراپ .

﴿ اِنَّ اللّٰه غَفورٌ رَحيمٌ ﴾ بە ڕاستی خوا لە ڕاسپاردەکەر خۆش ئەبێ بگەڕێتەوە بۆلای کاری چاك و ڕەوا ، میهرەبانە بۆ ئەو کەسانەی ناوبژییان ئەکا و ڕێکیان ئەخا .

ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان پێویست کرا لەسەر موسوڵمانان لە مانگی کۆڵە مانگی ساڵی دووەمی کۆچی ، خوای گەورە بە ئایەتی ( ١٨٣ ) هەتا ئایەتی ( ١٨٥ ) بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە کە پێویستە لەسەر موسوڵمانان ڕۆژوو بگرن ، بۆمانیشی ڕوون ئەکاتەوە کە فەرمان کردن بە ڕۆژوو گرتن شتێکی تازە نی‌یە تەنها بۆ موسوڵمانان لە یاسای خوادا ، بەڵکو پێویست کراوە لەسەر نەتەوەی پێغەمبەرە ﴿ ﷺ ﴾ پێشووەکان کەواتە ئەبێ موسوڵمانان زۆریان پێ خۆش بێ و هەست بە ناخۆشی نەکەن لە گرتنی ڕۆژوودا ، بە ئاسانی وەری گرن ، چونکە لەو فەرمانەدا هەر موسوڵمانان بەتەنها نین ئەوە لە لایێ ، لەلایەکی‌ترەوە ڕۆژوو لە هەموو ڕوویەکەوە سودێکی زۆری هەیە بۆ ئادەمیزاد :

١–دەربارەی کۆمەڵایەتی سودی زۆرە ڕۆژوو بۆ مرۆڤ و بۆ ئادەمیزاد ، چونکە بە گرتنی ڕۆژوو توشی برسێتی و تینوێتی ئەبن ، هۆیە بۆ بەزەیی هاتنەوەیان بۆ هەژاران ، شتێکی ڕوونە مرۆڤ هەتا ناخۆشی نەبینێت نازانێ چۆن میهرەبانی بەکار بهێنێ لەگەڵ هەژاراندا ، کاتێ بەزەیی دەسەڵاتی پەیدا کرد مرۆڤایەتی ، خۆشی وکامەرانی باڵی ئەکیشێ بەسەر ئادەمیزادا .

٢– بە ڕۆژوو گرتن یەکسانی نێوان هەژاران و ساماندااران دیاری ئەدا ، چونکە هەر ڕۆژووە هەژاری زۆری خۆی پەیدا بکات و پێویستی بکا بەسەر هەموو کەسدا بەبێ جیاوازی ، بۆ ئەوەی کۆمەڵگای ئادەمیزاد هەست بکات بە یەکسانی ، وەك لێرەدا ئیسلام ڕۆژوو بەکار ئەهێنێ بۆ ئەوەی هەست بکەن بە یەکسانی ، چ کار بەدەستانیان ، یا هەژار یا سامانداار بن .

٣– زۆر جار ئەبینرێ کە خواردن وخواردنەوە کاری زۆر نالەباری کردۆتە سەر هەستی هەندێ لە ئادەمیزاد بە جۆرێ ئەگەر نەختێ خواردنی دوا بکەوێ لە کاتی جارانی شێت و هار ئەبێ ، وای لێ دێ خواردن و چاو قاوە لە منداڵەکانی خۆشتر ئەوێ ، ئەو نەریت و کارانە بەجۆرێ کار ئەکەنە سەر مرۆڤ ئەیکەن بە بەندەی خۆیان ، بە هۆی ڕۆژووەوە لەو نەریت و بەندایەتی‌یە ڕزگاری ئەبێ و ئەیکات بە بەمرۆڤێکی ئازاد و سەربەست .

٤- ڕۆژوو هەستی مرۆڤ بەهێز ئەکات بە جۆرێ گیانی پاکی فریشتەیی دەسەڵاتی ئەبێ بەسەر گیانی ئاژەڵیدا ، بەو بۆنەوە مرۆڤ ئەبێتە خاوەنی خۆی و نابی بە بەندەی خواردن و خواردنەوە ، وەك ئاژەڵ .

٥- ڕۆژوو ئەو پەڕی سوودی هەیە بۆ لەش ساغی ، چونکە گەدە و لەشی مرۆڤ بۆ ماوە ی ( ١١ ) مانگ لە گەڕ و کارکردن دایە ، ئەوپەڕی ماندوو بوونی چەشتووە بۆیە پێویستی بە پشوودان هەیە بۆ ماوەیە ، خۆ ئەگەر ئادەمیزاد بە ویستی خۆی ئەو پشووە نەدا بە لەش و گەدەی ، گەدە و لەش بەناچاری کارکردنیان لاواز ئەبێ ، و پشووێ بۆ پەیدا ئەبێ بە هۆی نەخۆشی ترشەڵۆکی خواردن ، خاوەنەکەی سەری سوڕ ئەمێنێ هەتا گەدەی ئەگەڕێتەوە بۆ لای ئیشی جارانی ، بەو بۆنەوە دامان گیری دەیان پزیشك ئەبێ پارەیەکی زۆر بەو بۆنەوە دائەنێ ، بۆیە پزیشکەکان ئامۆژگاری نەخۆشەکانی ئەکەن بە گرتنی ڕۆژوو هەتا لە زۆر نەخۆشی ڕزگاریان ببێ لەوانە نەخۆشی قەڵەوی و جگەر و شەکرە و بەرز بوونەوەی خوێن ، هەرچەندە هەندێ لەو پزیشکانە ناوی ئەبەن بە پارێز کردن نەك بە ڕۆژوو بۆ چەند ڕۆژێ یا قەدەغە کردنی جۆرە خواردەمەنی‌یە ، هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆلای پشوودانی لەش وگەدە ، ئیتر چۆن سەرشۆڕ نەکرێ بۆ یاسای ئیسلام .

وەك زانیما ن ڕۆژوو پێویستە ، یەکێکە لە پێنج بنچینەی پیرۆزی ئیسلام کە بەوانە دروست بووە ، مەرجەکانی دروست بوونی ڕۆژوو چوار شتن : (ئیسلامەتی ، باڵغ بوون، ئاقڵی ، توانای ڕۆژو گرتن )، بێ باوەڕ و مندال و شێت و نەخۆش و ژنی بێ نوێژ( حیض) و سك پڕ و شیر دەر ڕۆژوویان لەسەر نی‌یە ، بەمەرجێ نەتوانن و کەفارەتی بۆ بدەن.

پێویستی‌یەکانی ڕۆژوو گرتن ( ٤ ) چوار شتن : نیازی گرتنی ڕۆژوو بۆ هەموو ڕۆژێ لە شەودا ، وازهێنان لە خواردن وخواردنەوە لە ڕۆژدا خۆ ڕاگرتن لە ژن ومێردی لە ڕۆژدا ، خۆ گرتن لە ڕشانەوەی دەست ئەنقەست .

ئەو شتانەی ڕۆژوویان پێ ئەشکێ ( ١٠ ) شتن : چونە خوارەوەی شتێ بۆ گەدە بە دەست ئەنقەست ، چونی شتێ بۆ نێو مێشك لەلوت و گوێچکە ، نەك لەچاوەوە . هەڵگرتنی شتێ لەپاش و پێشەوە . ڕشانەوە بە دەست ئەنقەست ، ژن و مێردی بە ڕۆژدا،

هاتنە خوارەوەی شەهوەت بە دەست بازی کردن ، پەیدا بوونی خوێنی حەیز ، خوێنی پاش منالّ بوون ، شێت بوون ، وەرگەڕان لە ئاین ، بەبیر کردنەوە شـەهوەت بـڕژێ .دەرزی لێدان ڕۆژویان پێ ناشکێ ، بە هۆی تەماشا کردنەوە لەش پیس ببێ ڕۆژووی پێ ناشکێ.

وا چاکە لە ڕۆژوودا ( ۳ ) شت بە کار بهێنرێ : پەلە کردن لـە شـکاندنی ڕۆژوودا بە کۆتایی پێ هاتنی ڕۆژ، دواخستنی پارشێو، واز هێنان لە گفت وگۆی نارەواو بێ هودە.

قەدەغەیە ڕۆژوو گرتن لە ( ٦ ) ڕۆژدا : ڕۆژووی جەژنی ڕەومەزان ، ڕۆژی جـەژنی قوربان، ڕۆژی (١١) و (١٢) و (١٣) ی دوای جەژنی قوربـان ، ڕۆژی کۆتـایی مـانگی کولەمانگ ، نەزانرێ ڕەمەزانە وکۆتایی مانگی کولەمانگە یا یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانە بە مەرجێ ئەو ڕۆژە ڕێك نەکەوتبێ لەگەڵ نەریتی خۆی .

ئەگەر کەسێکی بەڕۆژوو ژن ومێردی کرد واتە : دروست بوو لەگەڵ مێردەکەیدا لـە مانگی ڕەمەزاندا و بوو بەهۆی شکاندنی ڕۆژووەکەی پێویستە لە سەری کـە یـەکێ لـەم شتانەی دواوە بە مەرجێ لە دوای یەکبن : یەکەمجار ئازاد کردنـی بەندەیـەکی سـاغی بـێ عەیب و باوەڕدار ، ئەگەر توانای بەندەی نەبوو پێویستە دوو مانگ ( شهرین متتابعین ) بـە ڕۆژوو بێ ، ئەگەر ئەوەیشی نەتوانی پێویستە لەسەری خواردەمەنی یا بەرگێ ببەخشـێ بـە (٦٠) هەژار یەکەیەکەیان ، کە نزیکەی (٥٨٣) گـرام خواردەمەنیـە، ئەگـەر یـەکێ لـەو سیانەی بۆ نەکرا ئەمێنێتەوە لە گەردنیدا تا کاتێ توانای کامیانی پەیدا کرد ئەوەیان بکات.

ئەگەر کەسێ کۆچی دوایی کرد ، قەرزار ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بوو ، پێویسـتە بـۆ هەر ڕۆژێ لە میراتەکەی ( ٥٨٣ ) گرام ،خواردەمەنی بدا بە هەژاران ، ئەگەر بەبێ بیانوو ئەو ڕۆژووەی نەگرت ، وە ڕۆژووە کەی نەگرتەوە ، هەتا ڕەمەزانێ تـری بەسـەردا هـات پێویسـتە لەسـەری بـۆ هـەموو ڕۆژێ لەگـەڵ گرتنـەوە ڕۆژووەکـەی (٥٨٣) گـرام خواردەمەنی بدرێ بەهەژاران ئـەو خواردەمەنیـە دووپـات ئەبێتـەوە بەئـەندازەی سـالآنی نەگرتنەوەی ڕۆژووەکە .

پیرێکی پەك کەوتە ، یا نەخۆشێ هیوای چاك بوونـــەوەی لێ نـەکرێ و نـەتوانێ ڕۆژوو بگرێ پێویستە لەسەریان هەموو ڕۆژێ (٥٨٣ )گرام خواردەمەنی بدەن بەهەژاران .

ئەگەر ژنێ سکی پڕبو ،یا شیر دەر بوو بەمناڵ ، بەڕۆژوو گرتن ترسیان لـەخۆیان بـوو بەگرتنی ڕۆژوو تووشی زیان ببن ڕۆژو نەگرن ، لـەدواییدا ڕۆژووەکـە بگرنـەوە ، ئەگـەر ترسیان لەخۆیان و لەمناڵەکەیشیان بوو ڕۆژوو نەگرنو لـەدواییدا بیگرنـەوە، بۆ هـەموو ڕۆژێ (٥٨٣) گرام خواردەمەنی بدەن بەهەژاران .

ئەگەر نەخۆش نەی توانی ڕۆژ وبگرێت ،توشـی زیـان ئـەبوو بـەگرتنی ڕۆژو نـەگرێ ولەدواییدا هەرکاتێ توانای هەبوو بیگرێتەوە .

لەم ئایەتانەی دواییدا ئەوانەی باس کران هەموویان ئەزانرێ خوای گەورە ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ
عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ
لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم
مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ
يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ
لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهۡرُ
رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ

وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ
فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ
أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ
ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا
هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾

﴿ يا ايُها الذينَ امَنوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصيامْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە وپێویست کراوە لەسەرئێوە ڕۆژو یانی ئەوپەرستنەی پێ ئەبێژرێ ڕۆژو خوای گەورە بەتایبەتی ڕوو ئەکاتە باوەڕداران بەو فەرمانە چونکە هەرئەوان خوا ئەناسن وەفەرمانی وەرئەگرن هەرۆژوی ئەوان دروستە ،هەرکاتێ لەقورئانی پیرۆزدا بەرگوێمان کەوت ڕستەی ئەی باوەڕداران پێویستە بزانین ئەوە فەرمانە بۆ پێویست کردنی شتێکە یا بۆ قەدەغەکردنی شتێکە .

﴿كما كُتِبَ على الذينَ منْ قبلكمْ ﴾ هەروەك پێویست کراوە ڕۆژو لەسەرکەسانێکی ئەوتۆکەلەپێش ئێوە بوون لەگەلانی پێغەمبەرە﴿ ﷺ ﴾ پیشوەکان هەرلەئادەمەوە ﷺ: (هەتا عیسا ﷺ ئەوشتەی لەو ئایەتەوە بزانرێ ڕۆژو لەسەرگەلانی پێشین پێویست بووە، ئیتر ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بێ یان جگە لەڕەمەزان ،لەمەبەستەکە ناگۆڕێ لەپێویست بوونی لەسەرهەموو ئادەمیزاد ،بۆ شمان ئەسەپێنێ ڕۆژو یەکێکە لەهەرەگرنگەکانی پەرستن. گومان لەپیوەیست بوونی دا نیيە بەبێ جیاوازی لەناو گەلی ئیسلامدا ووەك پێویست

بوونی نوێژو زەکات وحەج و ووتنی ڕستەی شایەتوومان ،هەرکەسێ بڕوای بەپێویست بوونی ڕۆژو نەبێ بەبێ باوەڕدائەنرێ ،وەلەئایینی ئیسلام لای داوە ،پێویستە بکوژرێ،ئەگەر بڕوای بەپێویست بوونی هەبێ بەتەمەڵی نەیگرێ یابەسوکی تەماشا بکات و لاقرتێی بکات پێویستە دادگا تەمێی بکات بەو جۆرەی خۆی بەچاکی ئەزانێ .هەتا(٣) جار بۆ جاری چوارەم ئەبێ بکوژرێ .

﴿ لَعَلَكُمْ تَتَّقونْ ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان بپارێزن لەگوناه بەڵکو ئێوە ڕۆژ بگرن لەکاتی تەنگانەدا خۆگربن وە ڕاوەستاوبن لەسەر فەرمانی خوا ، ئەوڕستەیە پێمان پیشان ئەدا پێویست بوونی ڕۆژو بۆ ئەوەیە ڕۆژو گران ڕام بن و لەرسەر خۆ پاراستن لە ئارەزوە قەدەغەکراوەکان ،ڕۆژوزەکاتی لەشی مرۆڤە مرۆڤی پێ تاقی ئەکرێتەوە چونکە هەموو فەرمان و پێو یست کردن وقەدەغەکراو بۆ تاقی کردنەوەی ئادەمیزادە و بەڵام ڕۆژو لەهەمویان گران ترە و،سەرکەوتن وزاڵ بوونە بەسەرکردەوەی ئاژەڵیدا ، کۆششە بۆ پاك کردنەوەی ئادەمیزاد لە پاك کردنەوەی خواردەمەنی ڕابووردوو .

﴿ اَياماً مَعْدوداتْ ﴾ ڕۆژووگرتن چەند ڕۆژێکی دیاری کراوە هەڵبژێراون کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە ، چونکە خوا هیچ شتێ لەسەرمان پێویست نەکردووە جگە لە مانگی ڕەمەزان .

﴿ فَمَنْ كانَ منكُمْ مريضاً ﴾ دوایی هەر کەسێ لە ئێوە نەخۆش بوو ، زیانی پێ گەیاند گرتنی ڕۆژو یا نەخۆشییەکەی زۆر ئەکرد .

﴿ اَوْ عليَ سَفَرٍ ﴾ یا ئەو کەسە لەسەر کاروانیدا بو ، ئەو کەسە لەکاتی نەخۆشی و کاروانیدا ڕۆژوی نەگرت ، بەمەرجێ ڕێبواریەکەی دەستی پێ کرد بەر لە ڕۆژ بوونەوە ، بەڵام ئەگەر دوای ڕۆژ بوونەوە بووکەوتە ڕێ پێویستە بەپێی توانا ڕۆژووەکە نەشکێنێ ، وەك لەمەو پاش باس ئەکرێ .

﴿ فَعِدَةٌ من اَيامٍ اُخَرْ ﴾ دوای ئەوانە ئەو کەسە ڕۆژوی نەگرتبوو لە کات نەخۆشی و ڕێبوریدا ڕێبوارییەکەی بەر لەڕۆژبونەوە بوو با ڕۆژووەکەی بگرێتەوە بە ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە نەی گرتووە لە چەند ڕۆژێکی تردا لە جگەی مانگی ڕەمەزان...خوای

گەورە کاتێ فەرمانی دا بەگرتنی ڕۆژو بڕیاری دا ئەو کەسانەی توانای ڕۆژوو گرتنیان هەیە ئەتوانن ڕۆژوو نەگرن . بەلاّم پێویستە (فدیة) بدەن کە خواردەمەنی هەژارێکە ئەیشتوانن ڕۆژو بگرن ، ئەو فەرمانە لەبەر ئەوە بو باوەڕداران لەوەوبەر ڕام نەبوبون بۆ گرتنی ڕۆژوو بۆیە خوا فەرموی .

﴿ وَ علی الذینَ یطیقونه فدیة طَعامُ مِسْکینْ ﴾ وەپێویستە لە سەر کەسانێکی ئەوتۆ ئەتوانن ڕۆژو بگرن و نایانەوێ بیگرن بریتی بدەن کە خواردەمەنی هەژارێکە بۆ هەمو ڕۆژێ بەئەندازەی (٥٨٣) گرام.

﴿ فَمَنْ تَطَوَع خَیْراً فهوَ خیرٌ لهُ ﴾ دوایی هەر کرسێ ویستی زۆرتر لە ئەندازەی دیاری کراو فیدیە یدات ئەوا ئەو زۆرترە چاکترە بۆ ئەو کەسە لە پاداشتا .

﴿ وَانْ تَصوموا خَیرٌ لَکُمْ ﴾ وە ڕۆژو گرتنتان چاکترە بۆ ئێوە لەوەی بریتی بدەن بۆ ئەو کەسانەی توانای ڕۆژو کرتنیان هەیە .

﴿ اِنْ کُنْتُمْ تَعْلَمونْ ﴾ ئەگەر ئێوە یزانن ڕۆژوتان چەندە گەورەیەو ڕزگارتان ئەبێ لە هەموو شتێ و بیانوتان لێ ناگیرێ ، خوای گەورە بۆ جاری دووەم ئەو فەرمانەی گۆڕی بەمەی لەکاتی توانا دا پێویستە هەر ڕۆژو بگرێ ، نابێ بریتی بۆ بدات ، هەروەها بۆمان ڕوون ئەکاتەوە ئەو ڕۆژە دیاری کراوانە و هەڵبژێراوانە پێویستە لەسەرمان ڕۆژوی تێدا بگرین مانگی ڕەمەزانە ، وەك ئەفەرموێ :

﴿شَهْرُ رَمَضانَ الذي اُنْزِلَ فیه القرآن ﴾ ئەو ڕۆژە دیاری کراوانە بۆ ڕۆژوو گرتن مانگی ڕەمەزانێکی ئەوتۆیە هێنراوەتە خوارەوە لەودا قورئان ، بەسە بۆ پیرۆزی ئەو مانگە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە ، شەوێکی بەڕێزی تێدایە ، پەرستن لەو شەوەدا چاکترە لە پەرستنی هەزار مانگ .

﴿ هُدیً لِلْناسِ ﴾ ئەو قورئانەڕانومایی‌کەورە بۆ ئادەمیزاد، یاساوبەختیاری هەردو جیهانە.

﴿ وَ بَیناتٍ منَ الهُدی وَالفُرْقانْ ﴾ وە ئەو قەرئانە چەندین بەڵگەی ڕوونە لە ڕانومایی کردن و جوێ کەرەوەیە لە نێوان چاك و خراپ دا هەر وەك خوێ لە خۆیا ڕانومایی کەرە .

﴿ فَمَنْ شَهِدَ منْكُمُ الشهْرَ فليصمهُ ﴾ دوایی هەر کەسێ لە ئێوە ئامادەی ئەو مانگە بوو، نیشتە جێ بوو لە کارواندا نەبوو ، نەخۆش نەبوو ، دوایی پێویستە رۆژوی ئەو مانگە بگرێ سەرانسەر ، نەگرتنی بەبێ بیانوو قەدەغەیە و بریتی بۆ نادرێ ، یانێ فەرماندانی ئەم رستەیەیە بە رۆژو گرتن فەرمانی رستەی ﴿ وَ علی الذينَ يطيقونـهُ فِدْيَةٌ طعامُ مِسْكينْ ﴾ گۆڕیەوە بەوەی پێویستەرۆژو بگرێ و بریتی بۆ نەگرتنی نەدا بە بێ بیانوو ، هەر لەبەر ئەو گۆڕینەیشە ﴿ فَمَنْ كانَ منكُم مريضاً اوْ على سَفَرٍ ﴾ دووپات کراوەتەوە ، چونکە لەبەرئەوەی لەگەڵ گۆڕارو باسی کراوە ، پێویستە لەگەڵ گۆڕەریشدا باسی بکرێ هەتا بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی فەرمانەکە بۆ نەخۆش و رێوارە .

وە هەندێ لە زانایان ئەڵێن ووشەی ﴿ يُطيقُ ﴾ لە﴿ أطاقَ﴾ بەمانانەمانی توانایە وە ﴿يُطيقونهُ ﴾ بە مانای ﴿ لايقدرون ﴾ ە کەوابێ فەرمانی ﴿ وَ علی الذينَ يُطيقونهُ ﴾ نەگۆڕاوە .

﴿ ومَنْ كانَ مريضاً اَوْ على سَفَرٍ ﴾ وە هەر کەسێ نەخۆش بوو ، توانای رۆژو گرتنی نەبوو ، یا بەگرتنی رۆژوو توشی زیان ئەبوو با نیشتە جێ بێ یا لەسەر رێواری بێ و با ساغیش بێ ، خحوا بۆی روا کردووە رۆژوو نەگرن .

﴿ فَعِدةُ منْ ايامٍ اُخَرْ ﴾ دوایی بەو ئەندازەیەی لە مانگی رەمەزاندا بەرۆژوو نەبووە با بیان گرێتەوە لە جگەی مانگی رەمەزاندا ، ئەو زانایانە ئەڵێن ئەو ئایەتانە گۆڕانی تێدا نیيە ، ئەیشلێن : بۆیە رستەکانی ﴿ ومن كان مريضاً او على سَفَرٍ فَعِدةٌ مِنْ ايامٍ اُخَرْ ﴾ دووپات کراوەتەوە نەوەك گومان ببرێ ماناکانیان بە رستەی ﴿ فَمضنْ شَهشدَ مِنكُمُ الشَهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ گۆرراون .

﴿ يُريدُ اللّه بِكُمُ اليُسْرَ﴾ خوا بۆ ئێوە ئاسانی ئەوێ ، بە شکاندنی رۆژ و یا نەگرتنی و بریتی بۆ بدەن ئەو کەسانەی گرانە لایان رۆژو گرتن ، خوا بە رەوای داناوە نەخۆش و رێبوار رۆژو نەگرن لە رەمەزاندا و دوایی بیگرنەوە .

﴿ وَ لا يُريدُ بِكُمُ العُسْرَ ﴾ وە خوا ناخۆشی و ئـازاری بـۆ ئێـوە نـاوێ ، تـەنگتان پـێ هەڵناچنی بۆ گرتنی ڕۆژو کاتێ ئێوە نەخۆش بوون یا لـە سەفەردا بوون ، بۆ ئەو مەبەسـتە خوا ئەوپەڕی میهرەبانە بۆتان .

﴿ وَ لِتُكْمِلوا العدة ﴾ وە پێویستە لـە سەر ئێوە ژمارەی ڕۆژە نەگیراوەکان تەواو بکـەن بە گرتنەوەیان لـە جگەی ڕەمەزان ، یانێ خوا ڕۆژووی ڕێبوار و نەخۆشی دواخسـتووە بـۆ چەند ڕۆژێ تر لـە جگەی مانگی ڕەمەزان ، هەتا بتوانن بیان گرنەوە ، ئیتر مانگی ڕەمەزان (٣٠) ڕۆژ بێ یان ( ٢٩ ) .

﴿ وَ لِتُكَبِروا اللّه على ما هَداكُمْ ﴾ وە هەتا ئێوە خوا بە گەورە دابنێن و سوپاسی بکەن لـە سەر شتێ ڕانومایی ئێوەی کردووە لـە ڕوون کردنەوەی فەرمانەکانی ئاینی خۆیا کە ئێوە ساغ بوون ڕۆژو بگرن لـە مانگی رەمەزاندا ، وە نەخۆش ەڕێبوار نەی گـرن و لـە دوایـدا بیگرنەوە ، هەندێ لـە زانایان ئەڵێن : ئەو ڕستەیە فەرماندانە بەباسی گـەورەیی خـوا پـاش نوێژی مەغریبی شەوی جەژن و دوای نوێژی عیشا و بەیانی بەم ڕستانە ﴿ اللّـه اکبر اللّـه اکبر اللّه اکبر لا اله الا اللّه و اللّه اکبر و لله الحمد ﴾ .

﴿وَ لَعَلَكُمْ تَشْكُرون ﴾ وە بۆ ئەوە ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئـەوەی بـۆ ئێـوەی ڕوون کردەوە ڕۆژو نەگرتن لـە کاتی نەخۆشی وکارواندا ، لـێرەدا پێویسـتمان بـە ڕوون کردنەوەی ئەمانەی خوارەوە هەیە .

١- نەخۆش ئەگەر توانای ڕۆژ و گرتنی نەبوو بە هیچ خۆرێ پێویست نی‌یە لەسەری ڕۆژوو بگرێ خۆ ئەگەر ئەیتوانی ڕۆژو بگـرێ بـە گرانـی و بـە زیانـەوە وا چاکـە ڕۆژ و نەگرێ و گرتنی نەفامی‌یە ، ئەگەر چاوەڕوانی نەخۆشی ئەکرد بەو بۆنەوە بۆی نی‌یە ڕۆژوو نەگرێ بەڵکو پێویستە لەو کاتەدا ئەیەوێ ڕۆژ و نەگرێ ئەبێ نەخۆش بێ .

٢- ڕێبوار پێویستە سەفەرەکەی بۆ گوناه نەبێ ، وەماوەکویشی لـە (٤٨) میلکـەمتر نەبێ کە ئەکاتە (٧٣) کیلۆمەتر .

٣- ئەو کەسەی بیەوێ سەفەر بکات نابێ هەر لە شەودا واز لەوە بێنێ بەیانی بەڕۆژو نەبێ ، ئەبێ نیاز بکا بۆ گرتنی ڕۆژوو ، کاتێ بیشکێنێ ڕێبواریەکەی دەستی پێ کرد .

٤- ڕێبوار ڕۆژو نەگرتنی چاکە بەلام پیشەوایان مالیك وشافیعی لایان وایە گرتن ونەگرتنی وەکویەك وایە بۆ ڕێبوار ئەگەر توانایشی هەبێ .

٥- گرتنەوەی ڕۆژو چۆن بۆی ڕێك بکەوێ دروستە پچڕپچڕ بێ یا لەسەر یەك بێ هەرچەندە وا چاکە لەسەر یەك بێ .

کاتێ خوای گەورە لە ئایەتی پێشوودا فەرمانی دا بە گەورە دانانی خوا و ڕێز گرتنی و ناوبردنی خوا و سوپاس کردنی هۆشیارمان ئەکاتەوە کە خوا ئاگاداری لە باسکردنی خۆی هەیە ، پاڕانەوە و بانگ کردنی ئادەمیزاد لە خۆی ئەبیستێ ، وەلامی پاڕانەوەیان ئەداتەوە ، نزایشیان وەر ئەگرێ ، وەك لە ئایەتی دوایدا بۆمان باس ئەکات .

ئەگێڕنەوە پیاوێکی عەرەب ووتی بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ : ئایا خوا لێمانەوە نزیکە هەتا هاواری لێ بکەین ، خوای گەورە فەرموی :

وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

﴿ وَإذا سَأَلَكَ عبادِيْ عَنّي ﴾ وە کاتێ پرسیاریان لە تۆ کرد بەندەکانی من لەبارەی منەوە ، بەوان بلێ خوا ئەفەرموێ :

﴿ فَإنِي قَرِيبٌ ﴾ بەڕاستی من نزیکم لێیانەوە ، بگرە لەوانەوە نزیکترم لە دەروونی خۆیان ، ئاگادارم لە کردەوەی ئەوان و کاروکردەوە و چۆنێتی ئەوان ، ئەگەر پرسیاری منیان لێ کردی پێیان بلێ :

﴿ أجيبُ دَعْوة الداعِ ﴾ مـن وەڵامـی داواكـەر و پاڕانـەوەی ئەدەمـەوە و لـەوی وەر ئەگرم ، هەموو شتێ ئەبیستم بۆیە وەڵامیان ئەدەمەوە و ئەگەر پرسیاریان لێ كردی بلێ:

﴿ إذَا دعانِ ﴾ كاتێ هاوارم لێ بكەن ، بانێ وەڵامی نزا كەران ئەدەمەوە كاتێ هـاوارم لێ بكەن ، كار و كردەوەی من وایە دەستورم داوە لێم بپاڕێنـەوە بـە مـەرجێ لـە یاسـای شەرم دەرنەچێ وەك ئەوەی داوای خواردەمـەنی و دارایـم لێ بكـەن بـە بـێ كۆشـش و ماندوو بوون ، زانین و زانیاری بە بێ خوێندن و فێر بـوون ، ئـەو داوایانـە وەرناگـیرێن و دژی یاسا و سروشتن ، بێ كۆشش و هـۆو بەڵگـە خـوا هیـچ شـیێ بـە كـەس نـەداوە و نایشیدا.

لە ووشەی ( عبادی ) یانێ بەندەكانم وامان بۆ دەر ئەكەوێ خوا وەڵامی ئـەو كەسـانە ناداتەوە كە بەندەی ڕاستیەقینەی خوا نەبن و نەی پەرستن ، نـەڵكو بـەندەی ڕاستەقینەی خوا بن و بیپەرستن و پەیڕەوی كاری ڕەوای خوا بن ، خۆیان بپارێزن لە گونـاهو قەدەغـە كراوەكان ، وەڵامی ئەو كەسانە ناداتەوە خەریكی گوناهن و خراپـەكارن ، بۆیـە پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : پیاوی وا هەیە قژدرێژ و سەر گژن و خۆڵاوی دەست بەرز ئەكاتەوە بـۆلای ئاسمـان و هـاوار ئـەكا بـۆلای خـوا ، بـەڵام خـواردن و خواردنـەوە لـە قەدەغـە كراوەكانە، لە قەدەغە ئەولاو لەوەڕانی نی‌یە ، خوا چـۆن وەڵامـی مرۆڤـی وا ئەداتـەوە ، كەواتە بۆمان دەركەوت نزای باوەڕدار و پیاوی چاك وەرئەگیرێ ،نـەك گونـاه كـاران و تاوانباران ،كەوا بوو نابێ بێزرێ مرۆڤ ئەوپەری نزا و پاڕانەوە بەكاردێنێ و گـیرا نابـێ و وەڵامی نادرێتەوە بەر لە هـەموو شـتێ پێویسـتە ئاگـادار بـن و خۆمـان گێـل نەكـەین ، مـانای ئـەو ئـایـەتە ئەوەمان پیشـان ئەدات كە وا وەڵامی نزای داواكـەرانی بـاوەڕداران و چاكەكاران ئـەداتـەوە ، مـانـای وانیە هـەر كەسـێ داوای هیـچ شـتێكی لێ نەكـا نـەیداتـێ ، چـونـكـە بـەچـاوی خـۆمـان ئـەیبـینـین كـە خـوای گـەورە سـەروەت و سـامـان ئـەڕێژێ بـەسـەر ئـەو كـەسـانـەدا كـە لـەو نـاپـاڕێنـەوە بـە وێنـەی

ئەو کەسانەی کە لەو ئەپارێنەوە و داوای لیٚ ئەکەن ، ئەوەتـە خـوا ئەفـەرمویٚ : ﴿ اِنَّ اللّـه قَريبٌ مِنَ الُمحْسِنِين ﴾ بە ڕاستی خوا نزیکە لە چاکەکارانەوە ، وەك ئەفەرمویٚ :

﴿ وَ رَحْمَتِىْ وسِعَتْ كُلَ شيء﴾ وە میهرەبانی من هەموو شتیٚ ئەگرێتەوە .

﴿ فَلْيَسْتَجيبوا لي ﴾ دوایی پێویستە بەندەکانی من وەلاٌمی مـن بدەنـەوە بـە پەرسـتنم و فەرمانەکانی من جیٚ بەجیٚ بێنن .

﴿ وَلیؤمنوا بي ﴾ وە پێویستە ئەوان باوەڕ بەمن بێنن هەتا من لـەگەلٚیان بم و ڕزگاریـان بکەم وسەریان بخەم ، یانیٚ خوا ئەفەرمویٚ بە بەندەکانی خوٚی : من وەلاٌمی توٚ ئەدەمـەوە ، بەتەمای هیچ شتێکی توٚ نیم لە هەموو لایەکەوە ، پێویستە تـوٚش وەلاٌمـی مـن بدەیتـەوە و بروام پیٚ بێنی ، بزانی لە هەموو ڕوویەکەوە چاوەڕوانی منی ، وە بەرامبەر من هەژاری .

﴿ لَعَلهُمْ يَرْشُدونْ ﴾ بوٚ ئەوەی ئەوان ئەمرٚو و دوا ڕوٚژ ڕێگای ڕاست بدوٚزنەوە ڕامـوو بن بوٚلای ڕێگەی ڕاست ، چونکە پەرستنی من چاکەی هەردوو لای تێدایە ، ئەو کەسانەی من ناپەرستن دلٚ تەنگ و گوزەران تەسکن .

زوٚرتر لە زانایان کە مانای قورئانیان کردووە ئەلیٚن : یەکەم جـار کـە ڕوٚژوو پێویسـت کرا پێویست بوو کە نوێـژی خـەوتنیان کـرد ، یـا خـەوتن خـواردن وخواردنـەوە و ژن ومێردییان بەکارنەهێنایە هەتا شـەوی دوایـی ، هـەندیٚ لـە هـاوەلاٌنی پێغەمبـەر﴿ ﷺ﴾ خوٚیانیان بوٚ نەگیرا و هەلٚسان و ژن و مێردییان کـرد ، دوایـی پەشـێمان بونـەوە ، چونـە خزمەت پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ داوای لیٚ بوردنیان بوٚ بکات لای خوا ، ئەو ڕوداوە هـەر چوٚنـیٚ بیٚ دەروونی ئادەمیزاد داوای لیٚ ئەکات لە زوٚر کات، و لە زوٚر شوێن خوٚی پیٚ نـەگیریٚ بە نهێنی هەندیٚ کاری ناڕەوا بکـات ، یـا پـەنا بباتـە بـەر بـرو بیـانووی پڕووپـوچ بـە دوٚزینەوەی فڕوفێلٚ لە ئایندا یا ڕاستەو خوٚ فەرمانی خوا بگوٚڕیٚ بوٚ مەرامی خوٚی ، بوٚیـە چاك وایە بەگوێرەی توانا هەولٚ بدەین بوٚ دوٚزینەوەی فەرمانێکی ڕەوای ئاینی هـەتا درێـژە نەدریٚ بە یاخی بوون و گویٚ نـەدان بـە یاسـای ئیسـلام و گونـاه ڕای بکێشـیٚ بـوٚلای

گوناه نەك یەك جار بەڵكو بەدەیان جار ، لە ئەنجامدا وای لێبێ فەرمانی خوا بە سووك بگرێ ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ
لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ
أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ
وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ
ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ
إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ
تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ 


﴿ أُحلَ لَكُمْ لَيْلَةَ الصيامِ الرَفَثُ إلى نسائكُمْ ﴾ ڕەوا کراوە بۆ ئێوە لە شەوانی مانگی ڕەمەزان نزیك بوونەوە لە ژنەکانتان و چونە لایان لە هەموو شەوانێ بە ڕۆژو بن لە ڕۆژەکانیدا .

﴿ هُنَّ لِباسٌ لَكُمْ ﴾ ژنەکانتان بەرگ و پۆشاکن خراپە و نەنگی ئێوە ئەشارنەوە ، هەر وەك پۆشاك لەشی ئێوە دائەپۆشێ لە سەرما و گەرما.

﴿ و انتمْ لِباسٌ لَهُن ﴾ وە ئێوەی پیاوان بەرگ و پۆشاکن بۆ ژنەکانتان و هۆی ڕێزی ئەوانن و نەنگی ئەوان ددائەپۆشن و لەخراپە دووریان ئەخەنەوە .

﴿ عَلِمَ اللّه انَكُمْ تَخْتانونَ انْفُسَكُمْ ﴾ خوا ئەزانێ بەڕاستی هەندێ لە ئێوە نادروستیتان لەگەڵ خۆتان کردووە بە ڕانواندنی خۆتان بۆ سزا و کەم کردنەوەی پاداشتی خۆتان بە چوونە لای ژنەکانتان و خواردن و خواردنەوە کە قەدەغە کرابوون لە ئێوە لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا دوای نوێژی عیشاء، یا دوای خەوتن و بێدار بوونەوەتان .

﴿ فتابَ عَلَيْكُمْ ﴾ دوایی خوای گەورە لە ئێوە خۆش بوو ، کاتێ پەشێمان بوونەوە بە میهرەبانی خۆی ، ڕەوای کرد بۆتان چونە لای ژنەکانتان و خواردن و خواردنەوە لە هەموو شەوانی ڕەمەزاندا سەرانسەر .

﴿ و عَفا عَنْكُمْ ﴾ وە خوا لێتان بووردوو شوێنەواری گوناهتانی سڕیەوە ، لێرەدا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە لێبوردەیی خوا و سڕینەوەی گوناه دوای تاوان و قەدەغە کراوەکان ئەبێ ، کەواتە ئەبێ هەندێ لە موسوڵمانان کاری ناڕەوایان کردبێ .

﴿ فالآن باشِرُوهُنَّ ﴾ دوای ئەوە بۆتان ڕوون کرایەوە ئێستا نزیکی ژنەکانتان بکەون و بچنە لایان لە ئێوارەی هەموو شەوانی مانگی ڕەمەزاندا هەتا ڕۆژ بوونەوە .

﴿ و ابتغوا ما كَتَبَ اللّه لَكُمْ ﴾ وە داوا بکەن لە خوا شتێ پێویستی کردووە بۆ ئێوە و بۆی داناون لە ڕابواردن لەگەڵ ژنەکانتان لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا کەلەمەو بەر قەدەغە کرا بوو لێتان ، بۆ ئەوەی زاو وزێ بکەن ، نەك ڕابوردن لەگەڵ ژنەکانتان بە مەبەستی شتێ تر بێ لە چونە لایِ ژنەکانتان ، بۆ ئەوەی توشی داوێن پیسی نەبن ، وە لە شوێنی دیاری کراوە بچنەلایان ، تۆوی حۆتان بە فیڕۆ مەدەن و بیڕژنەسەر زەوی بە دەست بازی و شتی تر .

﴿ و كلوا وَاشْرَبوا حَتى يَتَبينَ لَكُمْ الخَيْطُ الأبيضُ منَ الخيطِ الأسوَدْ﴾ وە ئێوە بخۆن وبخۆنەوە لە هەموو شەوانی ڕەمەزاندا هەتا ڕوون ئەبێتەوە بۆ ئێوە ڕشتەی سپی ڕۆژ لە

کەناری ئاسماندا سەر هەڵئەدا، بەباریکی وورده وورده فراوان ئەبێ ، جوێ ئەبێتەوە لەڕشتەی ڕەش ، نەك ئەو ڕشتە باریکەی پەیدائەبێ لەناوەڕاستی ئاسماندا بۆ ماوەی نزیکەی نیو کات لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا دوایی ڕوناکی‌یەکەی وون ئەبێ و سەر لەنوێ تاریکی پەیدا ئەبێتەوە بۆ نزیکەی نیو کاتژمێر ، دوواتر ڕشتەی سپی کەناری ئاسمان سەر هەڵئەداو بەتەواوی ڕۆژ ئەبێتەوە .

﴿ منَ الفَجْرْ﴾ یانی ڕەوا کراوە بۆ ئێوە خواردن و خواردنەوە ، هەروەك بۆتان ڕەوا کراوە چونە لای ژنەکانتان لە ئێوارەوە هەتا هەڵهاتنی ڕوناکی بەیانی .

**بۆ زانین:** سەر هەڵدانی رۆژبوونەوە یانی ( الفجر ) دوو جۆرە :

یەکەمیان : ڕوناکی‌یەکی وەها پەیدا ئەبێ وەك کلکی گورگ ،بەراستی ڕەوا ناکا هیچ شتێ و قەدەغەی ناکا .

دوهەمیان : ڕوناکی کەناری ئاسمان و بڵاو بوونەوەی ئەو کاتە نوێژ ڕەوایە و چونە لای ژن و خواردن وخواردنەوە قەدەغەیە لە مانگی ڕەمەزاندا .

﴿ ثُمَ اَتِموا الصيامَ الى الليلِ ﴾ پاش ڕۆژ بوونەوەی‌ڕاستی بە هەڵهاتنی ڕوناکی ڕاست پێویستە ئێوە تەواوی بکەن ڕۆژووەکانتان هەتا شەوێ ،یانی پێویستەلەسەرتان خۆتان بگرنەوە لەو شتانەی ڕۆژو ئەشکێنن بە درێژایی رۆژ هەتا ئاوابوونی خۆر دوایی ڕۆژوەکانتان بشکێنن .

﴿ الأْعتكاف ﴾ یانێ مانەوە لە مزگەوتا بۆ پەرستنی خوا ، موسوڵمانان ئەمێننەوە بۆ نزیك بوونەوە لە خوا و پەرستنی خوا بۆ ماوەیەك ، پێویستە لەو ماوەیەدا نەلە مزگەوت بچونایەتە دەرەوە و نەچونەلای ژنەکانیان ئەگەر ئەو کارەیان بکردایە بە گوێرەی دەستووری ئاین بەم جۆرە پرستنە ئەڵێن ( الأْعتكاف ) بەڵام هەندێ لە موسوڵمانان کە ئەو پەرستنەیان ئەکرد ئەچوونە دەرەوە بە بێ بیانوو ، وایش ئەبوو ئەچوونە لای ژنەکانیان، دوای خۆشۆردن ئەوهاتنەوە بۆ مزگەوت ، بە گوێرەی ئاین ئەو پەرستنە پوچ ئەبۆوە ،

خوای گەورە ئەو شتانەی لێ قەدەغە کردن ، ڕێگە و ڕچەی چۆنێتی چۆڵەوانی و مانەوەی مزگەوتی بۆ پەرستن بۆ موسوڵمانان دیاری کرد و فەرمووی:

﴿ و لا تُباشِروهُنَّ ﴾ وە ئێوە نزیکی ژنەکانتان مەکەون بە چونە لایان ، چونکە پەرستنەکەتان پوچ ئەکاتەوە ، بەڵام جگە لە چوونە لایان باش نی‌یە بە مەرجێ ئارەزوو نەجولێنێ ، ئەگەر جولانی ئەویش قەدەغەیە .

﴿ وَ اَنْتُمْ عاكِفونَ فی المَسْاجِدْ ﴾ وە ئێوە کە مانەوە لە مزگەوتا بۆ پەرستنی خوا لە چۆڵەوانی دا ،ئەو ڕستەیە ئەوەمان نیشان ئەدا کە ئەبێ مانەوە هەر لە مزگەوتا بێ کە پێی ئەوترێ ( الأعتكاف ) وە زۆر پەسەندە بەڵام پێویست نەکراوە لەسەر موسوڵمانان ، هەرچەندە خۆی ئەتوانێ لەسەر خۆی پێویست بکات بۆ ماوەی‌یەك بە نیازی تایبەتی ، لەو ماوەیەی ئەو دیاری کردوە پێویستە لە مزگەوت نەچێتەدەرەوە ، نایشبێ بچێتەلای ژنەکەی.

﴿ تِلْكَ حُدودُ اللّه ﴾ ئەو شتانەی باسکران بۆ ڕۆژوو گرتن ومانەوە لە مزگەوتا بۆ پەرستن ، سنورەکانی خوان و نابێ بیان شکێنی و باز بدەی بەسەریاندا .

﴿ فلا تَقْرَبوها﴾ دوایی ئێوە نزیکی ئەو سنورانە مەکەون بە دژایەتی و گۆڕانی ، بەتایبەتی نزیکی ژنەکانتان مەکەون هەتا کۆتایی پەرستنەکە لە چۆڵەوانی مزگەوتا ، هەر کەسێ لە دەوری پاکژ و پاوان ئاژەڵ بلەوەڕێنێ نزیکە ڕانەکەی بکەوێتەوە و ئاوی لێ بخوات.

﴿ كَذلكَ یُبَیِنُ اللّه آیاتِهِ للناسْ ﴾ هەر بەو جۆرە ڕوون کرایەوە ئەو سنورانە خوا ڕوونی ئەکاتەوە و دەستووری خۆی بۆ ئادەمیزاد لە فەرمانە ڕەواکانی و قەدەغە کراوەکانی و پاداش بۆیان .

﴿ لَعَلَهُمْ یتقونْ ﴾ بۆ ئەوە ئێوە خۆتان بپارێزن لە تێکدانی بڕیار و قەدەغە کراوەکانی خوا بۆ ئەوەش دەستورو سنورەکانی حوا نەبڕن و بازنەکانی نەشکێنن .

لە کاتێکدا خوای گەورە باسی ڕۆژوو گرتن و بریتــی و ڕاسپاردەی بـۆ کردیـن کـە ئەوانیش سەرکەوتنە بەسەر ئارەزووی ئاژەڵیدا و دەست کاریە لە سامانی خۆمــاندا باســی چۆڵەوانی مزگەوتی بۆ کردین ، جێگەی شایانیشە باسی خواردنــی خواردەمــەنی سـامانی غەیری خۆمانمان بۆ بکات ،وەك بەرتیل دان و وەرگرتنی و بــەفیڕۆدانی دارایــی خۆمــان ، موسوڵمانان بە نارەوا بخەینە بەر کەڵبەی تیــژی کاربەدەسـتان و دادوەرانــی سـتەمکار بـۆ چەوسانەوەیان بۆیە خوای گەورە ڕوومان تێئەکا و ئەفەرموێ :

وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾

﴿ وَلا تَأْكُلُوا اَمْوالَكُمْ بَيْنَكُمْ بالْباطِلْ ﴾ وە ئێوە دارایــی خۆتــان بـە جـۆرێ یاسـا بـە ڕەوای دانەناوە وەك مامەڵە کردنتان بە سود ، بە حواردنەوەی ئارەق و گۆشــتی بـەراز و مردارەوە بوو و فێڵ لە مامەڵەدا و بەرتیل دان وبەرتیل خواردن ، مەیان خۆن.

﴿ وَ تُدْلوا بها الى الحُكامْ ﴾ وە مەگەیەنن کــار و فرمــان و دارایــی خۆتــان بـۆلای داد وەران وکاربەدەستان بۆ نەهێشتنی ئاژاوەی نێــوان خۆتــان ، ڕێــك بکــەون لەگــەڵیاندا و بەرتیلیان بدەنێ .

﴿ لِتَاْكُلوا فَريقاً مِنْ اَموالِ الناسْ ﴾ بۆ ئەوەی ئێوەبخۆن ئەندازەیە لە دارایی ئادەمیزاد .

﴿ بالاْثمْ ﴾ بە شایەتی درۆ و بەرتیل دان و ستەمکردن .

﴿ وَ اَنْتُمْ تَعْلَمونْ ﴾ وە ئێوە ئەزانن لەسەر کاری خراب و پـوچ ئـەڕۆن ، فـەرماندانی کاربەدەستان کاری قەدەغە کرا و ناگۆڕێ بە ڕەوا ، کاری ڕەوایش نـاگۆڕێ بـە قەدەغـە کراو مەرجەکانی قازی و دادوەران : پێویستە دادوەر : ئیـسـلام بـێ ، بـالـغ وئـاقلْ بـێ ، سەربەست ونێر بێ ، دادپەروەر بێ و ئاگاداری فەرمانەکانی خوا و پێغەمبـەر﴿ ﷺ ﴾ بـێ، ئاگاداری ئیجماع بێ و ئاگای لە کەسانێ بێ کاروباری ئـاین ئەبەسـتن وتێکـی ئـەدەن ، ئاگاداری گۆڕانکاری نێوان زانایان بـێ ، هۆکـانی کۆشـش ( اجتـهاد ) بزانـێ ، زمـانی عەرەبی بزانێ ، ئاگای لە خۆی بێ .

لەلای حەنەفی‌یەکان دروستە دادوەر گوناهبار بێ و فـەرماندانی جـێ بـەجێ ئـەکرێ ودروستە ژن ببێ‌بە دادوەر لەجگەی ،( حدود ) و ( قود ) یانێ ئەو شتانەی سـنوریان بـۆ دانراوە و، ئەو شتانەی تۆڵەن بۆ کوشتنی پیاو کوژبێ .

ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەموو خواردن و کاری ناڕەواو فڕ و فێڵ ئەگرێتەوە وەك بـەرتیل و ستەم کردن و قومار کردن و وەرگرتنی پارە لەسەر ئەستێرە گێڕی و گۆرانـی ووتـن و دەهۆڵ لـێدان و جوزەلە لـێدان و بۆلاوانەوەی شیوەن وسود خواردن و کڕین و فرۆشـتنی ئارەق و بێگار کردن بە دانیشتووان بـە نـاڕەوا ، پـارە وەرگرتـن لەسـەر دانەگرتنـەوە ، دوکانداران بۆ نوسینی نوشتەو سواڵ کردن و زێوانی گۆڕستان ، ... هەتا دێ .

پێش هاتنی ئیسلام هەر کەسێ برۆشـتایە بـۆ حـەج کـردن لـە دەرگـای ڕاسـتەقینەی خانووەکانیان و چاتۆڵەکانیانەوە نەئەچونە دەر هەتا کۆتـایی حەجـەکانیان بـەڵکو کـون و قوژبنی تریان دائەنا بۆ چونە ژوورەوە و هاتن دەرەوە ، ئەو جۆرە کارانەیان بە چاك دائەنا بۆیە خوای گەورە ڕێگەو ڕچەی چاکەی بۆ ڕوون کردنەوە و فەرموی :

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾

﴿ يَسْأَلونَكَ عَنْ الأَهِلَةِ ﴾ پرسیار ئەكەنلەتۆ هاورێكانت لە مانگەكان بۆ یەكەم جار باریكە و ووردە ووردە گەورە ئەبێ تا ئەبێ بە (١٤) چواردە شەو ، پاشان بچوك ئەبێتەوە هەتا وای لێ دێ ، ماوەیەك وون ئەبێ دووبارە لە مانگی تردا پەیدا ئەبێ ، وەك مانگی پێشوو ، ئەوە بۆ وای لێ دێ و بۆچی و سوودی چی‌یە ؟

﴿ قُلْ هیَ مَواقیتُ لِلْناسِ ﴾ موحەمەد﴿ ﷺ﴾ تۆ بلێ بە وان و وەلامیان بدەرەوە ئەو مانگانە چەندین كاتێكن بۆ ئادەمیزاد و نیشانەن بۆیان ، گۆڕینیان سودیان زۆرە بۆ ئادەمیزاد ، بۆ ژیانی رۆژانەیان و بۆ چاندنی كشت و كاڵ و بۆ بازرگانی و مامەڵە و ، بۆ دیاری كردنی كاتی پەرستن و كاتی رۆژو و كاتی سەرفیترە .

﴿ وَ الحَجِ ﴾ وە نیشانەن بۆكاتی جێ بەجێ كردنی حەجی باوەرداران ، هەر لە كاتی وەستانی عەرەفە تا كاتی فڕێدانی بەرد بۆ (٣) میلەكەی مینا ، ئەو گۆڕینە سودی زۆرە بۆ ئادەمیزاد ئەگەر مانگ لەسەر یەك شێوە بووایە كاتیان بۆ دیاری نەئەكرا ، زۆر ڕوونە

ئەگەرئەو گۆڕانە نەبێ نەکاتی مامەڵەو چاندنی کشت وکاڵ و ناشتنی درەخت و کاتیرۆژو چۆنێتی کات و هەڵسان بۆ دروشمەکانی حەج و کۆتایی حەیز و پاش منداڵ بوون و ماوەی شیردان بە منالاّن و بۆمان ڕوون نابێتەوە .

پێویستە ئەمانەمان بۆ روون بێتەوە لە وەڵامدانەوەی پرسیار کەراندا بە باسکردنیئەو سودانە دەستیان ئەکەوێ لە گۆرانی مانگدا لە هەموو مانگەکاندا بێ ئەوەی باسی هۆی سروشتییەکان و دروست بوونی مانگ بەو جۆرە کە لەنیوەی مانگدا بچوك و باریکە هەتا ئەگاتە (١٤) ی شەو ئەنجا بچوك و باریك ئەبێ لە نیوەی مانگدا باسیان بکا .

ئەو باس نەکردنە گەورە ترین فێر کردن و وانەی خوایە بۆ ئادەمیزاد کەکاتێ پلەی زانین و رۆشنبیری یان و هۆشیارییان کەمبێ ، وا پێویستە باسی ئەو شتانەیان بۆ بکرێ پەیوەندیان بە ژیان و گوزەرانی رۆژانەیانەوە هەبێ کە هەستیان پێ کردوون و تاقیان کردونەتەوە و زانیویانە ، یانێ ئەی ئادەمیزاد ئێوە چیتانە بەسەر گەورەیی و بچوکی مانگەوە، ئەگەر ئەتانەوێ بیزانن چۆن ئەو گۆڕانە دروست ئەبێ هەوڵدەن و فێری بن و بخوێنن هەتا بۆتان دەرکەوێ و زانیاری فێرتان بکات بۆچی مانگ ئەگۆڕێ و باریك و گەورەیی بەسەر دێت بە بۆنەی گەرانی بەدەوری خۆردا .

﴿ وَ لَيْسَ البِرُ بأنْ تأتوا البيُوتَ منْ ظهُورهاْ﴾ وە چاکە و پەرستن ئەوە نییە وبەوە نابێ کە ئێوە بچنە ناو خانوو چاتۆڵەکانتان لە پشتیانەوە ، بۆ ئەو مەبەستە لە پشتەوە کونیان تێ بکەن ، پەیوەندی ئەو ڕستەیە بە ڕستەی پێشەوە ئەمەیە ، بەرێکەوت پرسیاری مانگەکان و پرسیاری چونە ژورەوە لە یەك کاتدا بوو بۆیە خوای گەورە بۆ هەردوو ڕووداوەکە ئەو ئایەتەی ناردۆتە و خوارەوە .

﴿ وَ لكِنَ البِرَّ مَنِ اتقى﴾ وەبەلاّم چاکە چاکەی کەسێکە خۆی بپارێزێ لە خەشمی خوا و لە قەدەغە کراوەکانی خوا ، لە پشتەوە نەچنە خانووەکانتان بێ ئەوەی فەرمانێکی ڕەواتان بۆ هاتبێ لە لایەکەوە .

﴿ وَأتوا البيُوتَ منْ ابْوابِها ﴾وە ئێوە بچنە ژورەوە بۆنێو خانووەکانتان لە دەرگاکانیانەوە لە کاتی حەج و عەمرەدا نەك لە پشتیانەوە .

﴿ وَاتقوا اللّٰه لَعَلَكُمْ تفلحونْ ﴾ بۆ ئەوە ئێوە سەرکەوتن و ڕانومایتان دەست کەوێ و ڕزگارتان بێ لە هەردوو جیهاندا ،ئەو کەسەی یاسا و دەستووردانێ پێویستە ، هەر ئەبێ خوای گەورە بێ بەتەنها ، چاو لێکردن وکەوتنە دووای جگە لە خوا گومڕایی و سەر لێشێوانە، ڕێگەی ڕاست بگرن بۆئەبێ لە پشتەوە بچنە خانوە کانتانەوە .

هەروەك هەموو شتێ دژی دەستوورو پەیڕەوی خوا بێ پێویستە نەکرێ ، وەك ئەو کەسانە زیاد لە پێویست ڕێز لە دار و بەرد و پەڕۆی سەر گۆڕ ئەگرن کە ڕێز گرتن لە دار و پەڕۆی گۆڕستان قەدەغەیە .

بەر لەوەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کۆچ بکات لە مەککەوە بۆ مەدینە موسوڵمانان بێ هێز بوون جەنگ کردنیان قەدەغە بوو لەگەڵ بێ باوەڕاندا ، یاسای ئیسلام لەو کاتەدا بۆی دانا بوون بە هەر چۆنێ بیانزانیایە چاکەیان بکردایە لەگەڵ بێ باوەڕاندا ، ئەبوو زۆر بە ژیرانە هەڵسانایە و گفت و گۆیان لەگەل بکردانایە ، سەریان نەخستایەتە سەریان نەوەکو تووشی شەڕ بن ، وە نەیان توانییایە خۆیان ڕزگار بکەن .

کاتێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە موسوڵمانان هێزیان پەیدا کرد ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەگەڵ هاوڕێکانی چوون بۆ مەککە ، بۆ کردنی عەمرە و لە نزیك بیری‌حودەیبی‌یە خستیان بۆ پشوودان ، بت پەرستان ڕێگەیان پێ گرتن ونەیان هێشت بچن بۆلای خانەی خوا و پەرستن بەجێ بهێنن ، مانگێ لە حودەیبی‌یە مانەوە ، ئەو ڕوداوە لە ساڵی (٦) شەشەمی کۆچیدا بوو ، لە پاش ووت و وێژ لە نێوان موسوڵمانان و بت پەرستان پێك هاتن کە موسوڵمانان ئەمساڵ بگەڕێنەوە بۆ مەدینە بەمەرجێ ساڵی دوایی بێنەوە بۆ مەکە و (٣) ڕۆژ لەوێ بمێننەوە ، هەتا (١٠) ساڵیش جەنگ و ئاژاوە لەگەڵ یەکتری دا نەکەن .

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ گەڕایەوە بۆ مەدینە ، ساڵی دوایی خۆیان ڕێك خست بۆ بەسەر

کردنەوەی عەمرەی لە کیس چویان ، موسوڵمانان ترسیان لە بێ ویژدانی و بێ پەیامی بێ باوەران پەیدا کرد بە تایبەتی جەنگ کردن لەگەڵیان ، ئەو جۆرە کارانەیان لە حەرەمی کەعبەدا لە مانگە بەرێزەکاندا زۆر پێ ناخۆش بوو ، لەگەڵ ئەوەیشدا خوا بۆ یەکەمجار فەرمانی جەنگی بۆ دەرکردن و فورموی :

وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ
وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾
وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ
أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ
فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ
فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ
ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾

﴿ وَ قاتِلوا فی سَبيلِ اللّهِ ﴾ وە پێویستە ئێوەی موسوڵمان جەنك بکەن لە رێگەی بەرز بوونەوەی ئاینی خوادا ، ووشەی خوا و بەرز کردنەوەی ئاینی ئیسلام و یاساکانی بەو مەرجەیە ئەو جەنگە بۆ ئەو ئاینە بێ خوا ناردویەتی و پەیڕەوی بکەن .

﴿ الذينَ يُقاتِلونَكُمْ ﴾ لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگتان لەگەڵ ئەکەن و ، دەست و بردی لێ ئەکەن و پەیمان ئەشکێنن و دژی خوان .

﴿ وَ لا تَعْتَدوا﴾ وە ئێوە دەست درێژی مەکەن و یەکەمجار جەنگ هەڵمەگیرسێنن ، ژن و پیر و مناڵ و کەشیش و بێ تاوان مەکوژن ، بەبێ ئابڕوانە و خراپە دوژمنەکانتان مەکوژن ،خراپە بەسەر لەشەکانیاندا مەیەنن .

﴿ اِنَّ اللّهَ لایُحِبُ الْمُعْتَدینْ ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ کەسانێ دەست درێژی بکەنە سەر بێتاوانان وبە نارەوایی موسوڵمانان ئەکوژن ، پێویستە جەنگ کردنتان بۆ سوودی تایبەتی خۆتان نەبێ ،بەڵکو ئاین پاڵتان پێوە بنێ بۆ جەنگ ، لە کاتی شەڕ کردنتان خانووکۆشك و تەلاری دوژمنانتان مەڕوخێنن و دار و درەختی بەردار و بەسوودیان مەبڕن، ڕێزی پەککەوتە و ئەو کەسانەی بێ چەکن بگرن ، بەم جۆرە قورئان فەرمانی داوە دادپەروەری بلاو بکەنەوە ، بە چاوی بێ نرخ تەماشایان مەکەن ، وەك موسوڵمانان رەفتاریان لەگەڵ بکەن لە هەموو ڕوویەکەوە ، نان وپۆشاك و بەرگ و میوەیان بدەنێ، جێگەی حەسانەوەیان بۆ دیاری بکەن ، ئاینی ئیسلام جەنگ لە دژی ستەم و گێرە شێوێنی و دست درێژی بەکار ئەهێنێ ، هەرچەندە هەندێ کەسانی تازە پێ گەیشتوو ئەیانەوی بە گوێرەی بیر وڕایخۆیان پشتیوانی و لایەنگیری ئیسلام بکەن ، با وەکو لەگەڵ پەیڕەوی قورئانیشا یەك نەگری و ئەڵێن : ئاینی ئیسلای جەنگی قەدەغە کردووە بەهەموو حۆرێ مەگەر لەگەڵ ئەو کەسانە نەبێ جەنگیان پێ فرۆشتوون و جەنگیان هەڵگیرساندبێ ئەڵێن : جەنگەکانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەمویان بۆ بەرگری بوون لە موسوڵمانان ، نەك بۆ پەلامار دانی لە پێشەوە بەبێبیانوو بەڵکو ئەو ئایەتەی پێشوو و ئایەتی﴿وَ قاتِلوا الْمُشرکینَ كما یُقاتِلونَکُمْ﴾ یانێ جەنگ بکەن لەگەل بت پەرستان هەروەك چۆن ئەوان جەنگتانیلەگەڵ ئەکەن ، ئەو شتانەی پاڵی پێوە ناون ئەو تازە پێگەیشتوانە ،ئەو بیر و باوەڕەیان دەرئەبڕن ، ئەو پڕوپاگەندانە بە دوژمنانی ئیسلام بلاوی ئەکەنەوە بە بیروڕای خۆیان ئاینی ئیسلام ئاینێکی جەنگاویە ، نەك ئاشتی خوازانە ، ئەڵێن : بەڵگەمان جەنگەکانی پێغەمبەرە﴿ﷺ﴾.

بەلام ئەو شتەی شایانی باس بێ ئیسلام جەنگ لەچەند شوێنێکدا بەرەوا دائەنێ بۆ بەرگری کردن لە حۆیان کاتی جەنگ کردن لەگەڵیان ، بۆ بنەبڕ کردنی بی باوەڕی و

بڵاوکردنەوەی ئاسایش و ،بۆ پاراستنی ڕاستی و دادپەروەری ، بەڵام پێویستە جەنگ نەکری بۆ کردنی ئادەمیزاد بەبەندە و تاڵانکردن و چەوساندنەوەیان و دەست گرتن بەسەر سامان و بازاڕیاندا ، ئیسلام لەگەڵ ئەو کەسانەیش ئەبێ بەرگری بکەن لە ڕێزو سەربەستی ئادەمیزاد .

با ئەمەشمان لە بیر نەچی داگیرکەران و خوێن مژان جەنگ هەڵ ئەگیرسێنن و خوێنی نارەوا ئەرێژن و زانیاری خۆیان بەکار ئەهێنن بۆ کارکردن و لەناو بردنی مرۆڤایەتی ، هەر لەبەر تاڵان و داگیر کردن و چەسپاندنی ستەم و دەست درێژی ،جەنگی ئەوسای لوبنان لە نێوان هەموو ئاین و هۆزەکان کە بە هەزاران گیانی بێ تاوان و خانووبەرەی تێدا لەناو چوو ،باشترین بەڵگەیە بۆ موسوڵمانان کە داگیر ەران بەرپایان کردووە بە تایبەتی ئەمەریکا و زایۆنی ( یهود ) .

جەنگی داگیر کردن لەلایەن (ڕوسیای شیوعیەوە )(١١٥)هەزار سەربازی هێنابوو بۆ ناو (ئەفغانستان ) بۆ داگیر کردن و کوشتنی دانیشتووانی بێ تاوانی موسوڵمانانی ئەفغان ، هەر چەندە ئێستا ئەو جەنگە لە نێوان پارتە موسوڵمانەکاندایە .

جەنگی نێوان ( عێراق و ئێران ) ی دراوسێی کە (٨) ساڵ کە بە هەزاران کوژراو و دیل و سەدان شارو دێهاتی وێران وکاول کراوی تێدا پەیدا بوو ، بەنارەوا نیو ملیۆن کوردی بی تاوانی تێدا کوژرا ،هەر بە تەنها عێراق (١٨٢) سەد و هەشتا و دوو هەزاری تێدا سەرنگون کرد ،بەناوی ئەنفالەوە ، شاری هەڵەبجە چاکترین شایەتە بە گازی کیمیاوی (٥) پێنج هەزار کەسی تێدا شەهید کرا ، نزیکەی پێنج هەزار دێهات و شارۆچکەی تێدا رووخاند .

نمونەیەتر ( تریتۆن) ناوی ئەمەریکی نامەیەکی داناوە بەناوی ( مستقبل الذرة ) ئەڵێ پێش کەوتنی زانیاری نرخی مرۆڤایەتی کەم کردۆتەوە ، بەر لە دروست کردنی بۆمبای (ئەتۆم ) کوشتنی مرۆڤێ هەزاران جونەیهی تێ ئەچوو ، بەڵام پاش دروست کردنی بۆمبای

زەرەرە نرخی هەموو پیاوێك بوو بە یەك جونەیە ، دوای موشەكی هایدرۆجین بوو بـە یـەك شەلیف بە تەنها ( واتە یەك پوولە سوورە ) .

ئەوانەی بێژران گرنگترین وەلامە وەلامی دوژمنانی ئیسلامی پێ بدرێتەوە ئەو کەسانەی ئەیانەوی لە نرخی ئاینی ئیسلام کەم بکەنەوە ئەلێن : بە بیر و باوەڕی پیسی خۆیان : ئـاینی ئیسلام بە زەبری شیر و تیر چەسپاوە ، بە ڕاستی ئاینی ئیسلام جەنگە لەسەر ئەو کەسانەی دژی ڕاستی و دادپەروەرین ، ئەیانەوێ گێرە شێوێنی بلاو بکەنەوە ، بە بێ پێچ و پـەنا بـێ باوەڕی وستەم و دەست درێژی‌یە بۆ سەر یاسای ئیسلام ، ئەو یاسایە ئەگەر مـرۆڤ خـۆی گێـل نـەکا یاسـای مرۆڤایەتی‌یـە ، ئـەو شـتەی پێویسـتە ببێـژرێ بـەو بۆنەیـەوە : هـەموو موسولـمانان بە بێ جیاوازی تێکڕا پێکهاتوون لەسەر ئەوەی هەر کەسێ و هـەر پارتـێ ڕێـز گیراوەکانی خوا بە سووك بگرێ و پێشێلیان بکا و خوێنی موسولـمانان بڕێژێ و سـامانیان تالان بکا و بە ڕەوای بزانێ بە بێ باوەڕ دائەنرێ ، نوێژ و حەجی لێ وەرناگیرێ، لەگەلْ بێ باوەڕی ڕاستەقینەدا یەکسانن ، بگرە بێ باوەڕە کۆنەکە وا ئـەبێ ئـازاری بـەندەکانی خـوا نادات ، ئەم بێ باوەرە تازەیە ستەم و ئـازاری ئـادەمیزاد ئـەدەن و بـە ڕەوایشـی ئـەزانن ، بەڕاستی هەر کەسێ بڕوای بە یاسایێ نەبێ کە قورئان یان فـەرمودەی پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾، یـا تێکڕای موسولـمانان بڕیاریان لەسەر دابێ ، بێ باوەڕە ئەو کەسە ، پێویستە لەناو ببرێ ئیـتر با ئەو کەسەش دایك وباوك و کەس وکاریشی باوەڕدار بن .

﴿ وَٱقْتُلوهُمْ حَيثُ ثَقِفْتُموهمْ ﴾ وە پێویستە ئێوەی باوەڕداران بێباوەڕان بکوژن دەست کەوتن و چۆنتان بۆ جوت بور لەهەر کات و لەهەر جێگەیەك بوون ، بەلام ئێوە چاودێری یاسا بکەن ، مەیان سوتێنن و بە شێوەیەکی ناهەموار مەیان کوژن ، لە مزگـەوتی حـەرامدا مەیان کوژنن مەگەر ئەوان پێش دەستی بکەن بۆ جەنگ .

خوای گەورە لە ئایەتی پێشوودا فەرمانی داوە بە جەنگ بـە مـەرجێ بێباوەڕان پێش دەستی بکەن ، لەم ئایەتەدا فەرمانی‌داوە بە جەنگ پێش دەستی بکـەن یـان نـا ؟ نـەك لـە مزگەوتی حەرامدا .

﴿ وَ اَخرِجوهُم مِنْ حَيثُ اَخرَجوكُمْ ﴾ وە پێویستە ئێوەی باوەڕداران بێباوەڕان دەربکەن لەو جێگەیە ئەوان ئێوەیان دەر کردووە وەك مەککە بێ .

﴿ وَالفِتنَةُ اَشَدُّ مِنَ القَتْل ﴾ وە بت پەرستی وبێباوەڕی ئەوان سەخت ترە لای خوا لە کوشتن ، ڕێگە گرتن و دەرکردنی باوەرداران گەلێ ناهەموار ترە لە کوشتن چونکە ئازار و ئێشەکەی گرانتر و بەردەوام ترە ، هەوڵدانیان بۆ گەڕانەوەی ئێوە بۆ بێباوەری سەحت ترە لە کوشتن.

﴿ و لا تُقتاِلوهُم عِنْدَ المَسْجِدِ الحَرامِ حَتى يُقاتِلوكُمْ فيه ﴾ وە ئێوە جەنگ مەکەن لەلای مزگەوتی ڕێزدار هەتا ئەوان جەنگتان لەگەڵ نەکەن لە وێدا لەو کاتەدا جەنگ کردنتان لەگەڵیاندا ڕەوایە .

﴿ فَاِنْ قاتَلوكُمْ فَاقْتُلُوهم كَذلِكَ جَزاءُ الكافِرينْ ﴾ دوایی ئەگەر بێباوەڕان جەنگیان لەگەڵ ئێوە کرد ،دوایی ئێوە ئەوان بکوژن ، هەر بە جۆرەیە تۆڵە سەندن لە بێباوەران کە پێش دەستی بکەن لە جەنگدا و ڕێزی مزگەوتی ڕێز گیراو نەگرن .

﴿ فَاِنِ انْتَهَواْ فَاِنَّ اللّهَ غَفورٌ رَحيمْ ﴾ دوایی ئەگەر بێباوەڕان کۆتاییان هێنا بە جەنگ کردن لەگەڵ ئێوە لە مزگەوتی ڕێزداردا ئێوەش واز بێنن ، دوایی خوا لێ خۆش بوونی زۆرە بەڕاستی ، میهرەبانە لەگەڵیان ئەگەر وازیان هێنا لە بێباوەڕی ، باوەڕیان بە خوا و بە فرستادەی خوا هێنا ، چونکە خوا لە بێباوەڕی خۆش نابی بە واز هێنان لە جەنگ بە تەنها، بەڵکو مەرجە واز لە بێباوەڕی بهێنێ .

﴿ وَ قاتِلوهمْ حَتى لا تَكونَ فِتْنة﴾ وە پێویستە جەنگ بکەن لەگەڵ بت پەرستان هەتا بێباوەڕی نەمێنێ و موسوڵمان ئەبن ، هیچ شتێ لە بت پەرستان وەرناگیرێ جگە لە باوەڕهێنان ، بە پێچەوانەوە پێویستە بکوژرێن ، یانێ جەنگ بۆ باوەڕ هێنانە بە خوا و بنەبڕکردنی بێباوەڕی ، پێویستە هەتا بت پەرستی لەسەر زەویدا نەمێنێ ، ئەگەر بێباوەڕی نەما و هەموو ئادەمیزاد باوەڕی هێنا بە خوا جەنگ لە ئیسلامدا هەڵ ئەگیرێ.

با ئەمەیشمان لەبیر نەچێ کاتێ پێویستە بۆ بڵاوکردنەوە ی ئاینی ئیسلام کە فەرمان لە پێشەوایانی دادپەروەری موسوڵمانەوە دربچێ ، بەڵام جەنگ و ڕاپەرین بۆ پاراستنی ئاین و بەرگری لە موسوڵمانان پێویستە و مەرجی بۆ دانەنراوە .

﴿ وَيَكونَ الدينُ للّه ﴾ وە هەتا ئاین بە پوختەیی دابین ئەکرێ بۆ خوا و پەرستنی ڕاستی هەر بۆ ئەو بێ ، نەك بۆ شەیتان و بت وكاربەدەستان ، هەتا ئادەمیزاد بە سەربەستی بژین .

﴿ فَإنْ انتهوا فَلا عُدْوان الاّ علـى الظـالِمينْ ﴾ دوایـی ئەگـەر بێبـاوەڕان وازیـان لـە جەنگ هێنا ئیتر دوژمنایەتیتان جێگەی خۆی نییە مەگەر لە ستەم کاران کە واز ناهێنن لـە جەنگ کردن ، ئەو کاتە ئەوان پێش دەستی ئەکەن و ئێوەش بەرگری لە خۆتان بکەن.

هەتا ئێرە باسی ڕێز گرتن لە مزگەوتی ڕێزدار کرا کە جەنگ لەوێ قەدەغەیە ، ئەگـەر بێباوەڕان جەنگ لەوێدا نەکەن ، ئەگەر جەنگیان بەرپاکرد ئەو کاتە ئێوە ئەتوانن وەڵامیان بدەنەوە ، لە مە دوایش باسی ڕێز گرتن لـە مانگە ڕێزدارەکان ئەکرێ واته:( اشهرالحرام ).

ئەوەی شایانی باس بێ وەك لەمەو پێش باسکرا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کەوتە ڕێگە لـە مـانگی (ذی القعدة ) دا بۆ بـەجێ هێنـانی عـەمرە لـە سـاڵی شەشـەمی کۆچیـدا ، بـێ بـاوەڕان بەرەنگاریان بوون لە حودەیبییە و نەیان هێشت بڕوا بۆ لای خانـەی خـوا ، دوایـی پێـك هاتن ئەو ساڵە بگەڕێنەوە ، و ساڵی دوایی بێنەوە و (٣) سێ ڕۆژیش لە مەککە بمێننـەوە و ئەوسـا عەمرەکـە بـە جـێبێنن ، سـاڵی دوایـی پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾ گەڕایـەوە بـۆ مەککـە و عەمرەکەی بەسەر گرتەوە ، ، موسوڵمانان پێشەکی ترسیان هەبوو بت پەرستان لەو مانگـە ڕێزدارەدا جەنگیان لەگەڵ بکەن ، خوای گەورە دەستووری دا بە موسوڵماناو بەرگری لە خۆیان بکەن ، بۆی ڕون کردنەوە ئەوەی قەدەغەیە دەست درێژی کردنەبە جەنگ نەك بە بەرگری لە خۆ کردن ، وەك خوا ئەفەرموێ :

ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ
بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ
عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ

ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾

﴿ الْشَهرُ الحَرامُ بالْشَهرِ الحرامِ ﴾ ئەم مانگە ڕێزدارە کە تۆ لەودا ئەچی بۆ بەسەر گرتنەوەی عەمرە بەو مانگە ڕێزدارەی بێباوەڕان لەودا ڕێگەیان بە تۆ گرت نەیان هێشت بچی بۆ عەمرە کردن ، یانی ڕێزی ئەم مانگەی ( ذی القعدة )ی ئەم ساڵ لە جیاتی ( ذی القعدة ) ی ساڵی پێشوو کە ئەو مانگە ڕێزدارە بەرەنگاری ئێوەی بێ باوەڕی ئەکرد لە بێباوەری و کردەوەی خراپ ، چۆن بەرەنگاری ئێمە ئەکات لە جەنگ کردن لەگەڵتان بۆ بنەبڕ کردنی خراپەتان و چاك کردنەوەی گێرە شێوێنیتان ، ئەو کەسەی خوێن ڕشتن بەرەوا دانێ بۆ ئێوە ، ئێوەی باوەڕداریش خوێن ڕشتنی ئەوان بە ڕەوا دانێن هەر لەم مانگەدا .

ئەو مانگانەی ڕێزیان گیراوە جەنگیان تێدا نەکرێ چوار مانگن : سیانیان بە یەکەوەن (ذی القعدة ، ذی الحجة ، موحرم ) ەوی تریان بە تەنهایە کە مانگی ( رجب )ە .

﴿ وَالحُرماتُ قِصاصٌ ﴾ وە هەموو شتێکی ڕێزدار یەکسانن بۆ تۆڵە سەندنەوە ،ئیتر مانگەکان بن یا مزگەوتی ڕێزدار ، هەر کاتێ ڕێزی نەگیرا بە ڕێگە گرتنی بێ باوەران لە ئێوە لەو مانگەدا ئێوەی موسوڵمانیش وێنەی بکەن وبدەن بەسەریاندا بە زۆر ، جەنگیان لەگەڵ بکەن ئەگەر جەنگیان پێ فرۆشتن ، هەر کەسێ بەرەوای دابنێ خوێن ڕشتنی ئادەمیزاد و خواردنی داراییان و ڕوشاندنی ناموسیان ڕەوایە بۆ کەسانی تر ئەوانەی ئەوان بە ڕەوای دائەنێن ئەمانیش بیکەن لەگەڵیان ، بەڵام پێویستە لە سنوور دەرنەچن .

﴿ فَمَنْ اِعْتَدى عَلَيْكُمْ فاْعْتَدوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ ما اعْتَدىَ عَلَيْكُمْ ﴾ دوایی هەر کەسێ دەست درێژی کردە سەر ئێوە بە نارەوا ، ئێوەی موسوڵمانیش دەست درێژی بکەنە سەریان بە وێنەی ئەو شتەی دەست درێژی پێ کردووە تە سەر ئێوە بە بێ کەم وزۆر ، بەو جۆرەیە تۆڵەی یەکسانی .

﴿ وَاتَّقوا اللّٰهَ ﴾ وە پێویستە ئێوە لە خوا بترسن پێشەکی و لە کاتی سەرکەوتنانائەو کەسانەی ستەمیان لە ئێوە کردووە ستەمیان لێ مەکەن بە زۆرتر لە مافی خۆتان ، ئەو شتەی بۆتان ڕەوا نەکراوە هەنگاوی بۆ مەنێن .

﴿ وَاْعْلَموا اَنَّ اللّٰهَ مَعَ الْمُتَقينْ ﴾ وە ئێوەبزانن خوا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خۆیان ئەپارێزن لە خراپە و لە خوا ئەترسن ، خوا ئەیان پارێزێ و کاریان بۆ ئەڕەخسێنێ و سەریان ئەخات .

﴿ وَاَنْفِقوا فی سَبيلِ اللّٰه ﴾ وە ئێوە ببەخشن سامان و دارایی خۆتان لە ڕێگەی خوادا بۆ ئەوەی خوا پاداشتان بداتەوە و میهرەبانیتان لەگەڵ بکا ،ڕێگەی خوا هەموو کارێکی چاکە ئەگرێتەوە لە حەج و غەزا و سەردان لە خزمان و دەست گیرۆیی کردنی هەژاران و بە خێو کردنی ژن و مناڵ و دروست کردنی حوێندنگا و خەستەخانە و خانوو دابین کردن بۆ هەتیوان .

﴿ وَ لا تُلقوا بِاَيْديكُمْ الى التَهْلُكَةَ﴾ وە ئێوە خۆتان فڕی مەدەن بە دەستی خۆتان بۆ لەناو چوون بە دەست بڵاوی لە بەخشینی سامانی خۆتان بە بێ سنوور ، خۆتان لەناو مەبەن بەواز هێنان لە کۆشش کردن بۆ بەرزی ئیسلام .

﴿ وَ اَحسِنوا اِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنينْ ﴾ وە ئێوە چاکە بکەن لەگەڵ هەژاران و پێویستیە گشتیەکانی نیشتمان ، بە ڕاستی خوا خۆشی ئەوێ چاکەکاران ئەوەی شایانی باس بێ لە کاتی جەنگدا ژنان و منالان و کەشیش و پەك کەوتە و پیران و بەکرێ گیراوان و جوتیاران و دیلەکان پێویستە نەکوژرێن ، مەگەر گێرە شێوێنی و جەنگ بەرپا بکەن

پاش ئەوەی پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی مانگە یەك شەوەکان ، پێغەمبەر(ﷺ) وەلامی دانەوە و کە مانگەکان بەلگەو نیشانەن بۆ جێ بەجێ کردنی کاروباری جیهانیتان و پەرستنی خوا بە تایبەتی حەج و رۆژوو ، هەروەها خوا فێری کردین خوا پەرستی بریتی نییە لەچونە ژوورەوەی خانووەکان لە پشتەوە ، بەلکو خوا پەرستی بریتییە لە چاکە کردن و ترسان لە خوا ؛ نەك خۆماندوو کردن بە پرسیاری پڕوپوچەوە ، هەروەها باسی جەنگ کردنی لەگەڵ بێ باوەران و ڕێز گتن لە حانەی خوای بۆ کردین لەگەڵ ڕێزگرتنی مانگە ڕێزدارەکان ، وە باسی ڕێگە گرتن بە پێغەمبەر(ﷺ) لە لایەن بی باوەرانەوە نەیان هێشت بچێ بۆ عەمرە ، فێری کردین چۆن ولە چ کاتێکدا جەنگ لەگەڵ بێ باوەراندا بکەین ، ئەوانەیش هەموویان پەیوەندیان بە جەنگەوە هەیە ، بۆیە خوای گەورە باسی حەج کردنمان بۆ ئەکات بە (٨) ئایەت لەمەو دووا ، بەلام بەر لە چوونە سەری و مانا کردنی ئایەتەکان باسی سوودی حەج و مەرجەکانی و پێویستی و سوودی حەج ئەکەین لەسەر موسولمانان و مەرجەکانی دروست بوونی و ڕوکنەکانی و چۆنێتی بە جێ هێنانی ئەکەین بە کورتی :

حەج بریتییە لە چوون بۆ خانەی خوا بۆ بە حێ هێنانی کاروباری حەج لە هەموو ڕوویەکەوە بە گشتی ، لای زۆربەی مرسولمانان حەج لە سالی شەشەمی کۆچیدا پێویست کراوە لەسەر موسولمانان لەماوەی تەمەنیدا یەکجار ، حەج یەکێکە لە پێنج ئەرکانەکانی هەرە بەرزی ئیسلام ، هەر کەسێ باوەڕی بە پێویست بوونی حەج نەبێ لە ڕیزی موسولمانان دەرئەچێ .

سوودی حەج زۆرن بەکوورتی : بریتییە لە لێحۆش بوونی تاوان ، نەهێشتنی هەژاری، ناساندنی خۆیان بە هەموو دانیشتووانی هەموو هەرێمەکانی موسولمانان ، پەیدا کردنی مەیل و خۆشەویستی بۆ دانیشتووانی مەککە ومەدینە ، وەلامدانەوەی بانگەوازی پێغەمبەر ئیبراهیم ( عليه السلام ) بۆ سەردان لە دانیشتوانی مەککە ، بیر کردنەوە لە ڕۆژی زیندوو

بوونەوەی هەموو کەسێ بە ڕووتی ، بیر کردنەوە لە وەستان لــە ڕۆژی دوایـدا لەبـەردەم توانای خوادا ، بیر کردنەوە لە ژیانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە بینینی مەڵبەندی ژیانی و گـۆڕی و خەبات و شەڕگاکانی .

حەج دەرکەوتنی ڕواڵەتی ئیسلامە کۆبوونەوەی گشتی‌یە بـۆ هـەموو موسـوڵمانان بـە هەموو جیاوازی نیشتیمان و ڕەنگ و ڕەگەز و زمانیانەوە ، چوونی هەموویان بۆ جێگەیەك تەنها بۆ خوا پەرستی ، پەیوەندی بەندەکانی خوا بە پەروەردەکەری خۆیانەوە ، بەڵێن دانـە بە بچوکی خۆیان بۆ خوا ، بەستنی پەیوەندی توندە بە هـێزی کۆمـەڵگای موسـوڵمانان ، زۆربوونی ناسینی نێوان دانیشتوانی هەموو موسـوڵمانانە ، دروسـت کردنـی مرۆڤایەتی‌یـە لەسەر بنچینەی گۆڕینەوەی سوودی نێوان خۆیان ، حەج ناسـینی جێگـە پیرۆزەکانـە کـە موسوڵمانانی پێشوو لەناو ئەواندا سەرکەوتوون ، حەج یەکسانی‌یە بۆ هەموو ئـادەمیزادێ بەبێ جیاوازی لە نێوان گەورە و بچوك دا ، لە نێوان هەژار و سامانداردا .

مەرجەکانی پێویست بوونی حـەج لەسـەر موسـوڵمانان : بـاڵغ بـوون ، ئیسـلامەتی ، ژیری، سەربەستی ، توانای چوون و هاتنەوەی ڕێگای حەج ، لەش ساغی ، ڕێگەی چوون و هاتنەوەی مەترسی تێدا نەبێ ، ئەوەندە دارایی هەبێ بەشی چوون و هاتنەوە بکـات هـەتا ئەگاتەوە نیشتیمانی خۆی بۆ خۆیی و خێزانی ، ئـەوەندەی هـەبێ قـەرزەکانی بېژێـررێ ، بەشی ئەو شتەی هەبێ خۆیی و کـەل و پەلەکـەی هـەڵگرێ لـە ڕێگـەدا ، ئەگـەر خـۆی نەیتوانی بەتەنها بڕوا بۆ حەج ئەبێ بەشی کرێ گرتەیەکی هەبێ ، کەسێ هەر نەیتوانی بچێ بۆ حەج کەسێ بەکرێ بگرێ بۆی بکات بە مەرجێ ئەو کەسـە خـۆی حـەجی کردبـێ لەوەو بەر .

مەرجەکانی دروست بوونی حەج دوو شتن : کاتی دیاری کراو بێ بۆ حـەج کـردن ، ئیسلامەتی ، ئەو کەسەی باڵغە خۆی نیاز ببەستێ بە ئیحرام بۆ حـەج ، خـاوەن منـاڵ لـە جیاتی مناڵەکەی نیازی حەج بێنێ بۆ خۆی چ شتێ ئەکا بۆی خۆی ئەوەش بۆ مناڵەکەیشی

بکا لە تەواف و هاتوو چۆی نێوان سەفا و مەڕوە و لە هەموو ئەو کار و بارانەی بۆ حەج ئەکرێ هەتا کۆتایی حەج .

کاتی نیاز هێنان بۆ ئیحرام بە حەج پێویستە لە مانگی ( شوال و ذی القعدة ) و هەتا ڕۆژ بوونەوەی (١٠)دەهەمی مانگی ( ذی الحجة ) بێ ، هەر کەسێ ئیحرام ببەستێ لە جگەی ئەو کاتانەدا بۆ حەج دروست نیيە بە حەج بۆی دانانرێ ، بەڵام بە عەمرە بۆی دا ئەنرێ ، چونکە هەموو کاتەکانی ساڵ کاتە بۆ عەمرە کردن.

مەرجەکانی بەجێ هێنانی کاروباری حەج بۆ ئەوەی لەسەر مرۆڤ لاچێ و خێگەی خەجی ئیسلام بگرێتەوە پێنج شتن : (١) ئیسلامەتی ، (٢) سەربەستی و بەندە نەبێ ، (٣) باڵغ بوون ، (٤) ژیریەتی ، (٥) کاتەکە کاتیحەج بێ.

ئەو ڕوکنانەی حەج بەبێ کردنی ئەوان دروست نەبێ پێنج شتن : ١- ئیحرام بەستن بە حەج ، ٢- گەڕان بەملاولای خانەی خوادا حەوت جار ، ٣- هاتوو چۆی نێوان سەفا و مەڕوە حەوت جار لە سەفاوە بۆ مەڕوە دەست پێ بکات کۆتایی پێ دێ لە مەڕوەدا ، گەڕانەوەیشی لە مەڕوە وە بۆ سەفا ئەبێ بە دوو جار ، وە هەروەها ، ٤- وەستان لە دەشتی عەرەفەدا لە ڕۆژی نۆهەمی مانگی ( ذی الحجة ) هەتا ڕۆژ بوونەوەی شەوی دەهەمی دەست پێ دەکات لەو کاتەدا بۆ ماوەیەك لە عەرەفەدا بمێنینەوە بەسە ، ٥- تاشینی سەر یا کورت کردنەوەی موی سەر ، ئەو پێنج شتە بریتیان بۆ نادرێ.

ئەو جێگایانەی ئیحرامیان تێدا ئەبەسترێ ئەمانەن : بۆ دانیشتوانی مەککە هەر لە مەککەوە ئیحرام ببەستن ، دانیشتوانی مەدینە لە ( ذو الحليفة ) ، شامی‌یەکان و میسری‌یەکان و ڕۆژئاوایی‌یەکان لە (الجحفة ) ، توهامەی یەمەن لە یەلەم لەم ، نەجدی یەمەن و نەجدی حیجاز لە قەرەن ، ڕۆژهەڵاتی لە عەرق ، وە مرۆڤ لەو جێگایانە نەبێ پێویستە ئیحرام نەبەستێ و نابی تێپەڕ بکات لەوان ، ئەگەر تێپەڕی و نەگەڕایەوە و پێویستە مەڕێ یان بزنێ یان ئاژەڵێ دەست بدات بۆ قوربانی سەری ببڕێ بەناوی فیدیەوە .

حەج و عەمرە بە سێ جۆر ئەکرێن :

**یەکەم :** { الإفراد } ئەوەیە نیاز بە حەج بێنی یەکەم جار ، هەموو کار و فرمانەکانی حەج بە جێ بێنی دوای تەواو بوونی حەج لە ڕۆژی (١٤) ی مانگی ( ذی الحجة ) بچێ بۆ دەرەوەی شاری مەککە و شارەوانی‌یەکەی لەوێ نیازی عەمرە بێنێ و عەمرەکەی بەجێ بهێنێ ئەو جۆرەیان سەر بڕینی خوێنی پێویست نی‌یە.

**دووەم :** { القران } ئەمەیە نیاز بە حەج و عەمرە بێنێ ، لە سەر پێویستی خۆی بڕوا هەتا هەموو مەرج و پێویستی‌یەکانی حەج بەجێ دێنێ ، بەو جۆرە حەج و عەمرەی بۆ جێ بەجێ ئەبێ ، بەڵام پێویستە لەسەری مەڕی یا بزنێ سەر ببڕێ ، مەڕ یەك ساڵە بێ بزن دوو ساڵە بێ ، کردنی حەج بەو جۆرە بۆ دانیشتوانی مەکە خوێنیان لەسەر پێویست نی‌یە .

**سێهەم :** { التَمَتعْ } یانێ یەکەمجار لە جێگەی دیاری کراودا نیاز بە عەمرە ببەستی و عەمرە بەجێ بهێنێ و نیازەکەی خۆی بشکێنی و پشووی خۆی بدات ، لە پاشدا بەر لە ڕۆژی نۆهەمی ( ذی الحجة ) نیاز بە حەج ببەستی و کار و پێویستی حەج بەجێ بهێنێ ، بەڵام پێویستە سەربڕینێ بکات و گۆشتەکەی بدات بە هەژاران ، وەك لە (القراندا) باسی کراوە ، ئەگەر تواناى سەربڕینی ئەو گیان لەبەرەی نەبوو ئەوا (٣) ڕۆژ لە مەککە و (٧) ڕۆژ لە نیشتیمانی خۆیدا کە گەڕایەوە بەڕۆژوو بێ ، هەمووی ئەکاتە (١٠) ڕۆژی تەواو.

چۆنیەتی بەجێ هێنانی حەج بە کورتی : مرۆڤ گەیشتە جێگەی دیاری کرا و بۆ بەستنی ئیحرام بە نیازی خۆ پاك کردنەوە بۆ ئیحرام خۆی بشۆرێ و، دەست نوێژ بگرێ و دوو ڕکات نوێژ بکات دوای خۆ ڕووت کردنەوە و بەرگی ئیحرام پۆشین ،دوایی (١) نیازی حەج بێنێ و ئیحرام بە حەج ببەستێ ،(٢) یا نیازی حەج و عەمرە بەیەکەوە بکات ، (٣) یا نیازی عەمرە بەتەنها بێنێ ، بە هەر جۆرێ ویستی لەو سێ جۆرانەی باسمان کرد دروستە ، ئینجا بەرەو مەککە بکەوێتە ڕێگە بچێ بۆ حەرەمی کەعبە ، لە بەردە ڕەشەوە دەست بکات بە تەواف و لای چەپی بکاتە حانەی خوا و حەوت جار بە دەوریدا بگەڕێ بە مەرجێ دەست نوێژی هەبێ ولەشی پیس نەبێ (جنابة) ، بەرگ و لەش و جێگەی پاك بێ نێوان ناوك و ئەژنۆی دابپۆشێ بە هەردوو خاولی‌یەکەی کەواتە تەواف وەك نوێژ وایە، بەڵام گفت وگۆی تێدا دروستە ، دوای تەواف لای جێگە وەستانی ئیبراهیم (عليه السلام)

وا چاکە دوو ڕکات نوێژ بکات ، دوایی بچێ بۆ لای هاتووچۆی نێوان سەفا و مەڕوە حەوت جار لە سەفاوە دەست پێ بکات و لە مەڕوە کۆتایی پێ بهێنێت ، ئیتر دوای وەستانی عەرەفە ، تەوافو{الافاضة } و هاتووچۆی نێوان سەفا و مەڕوە تەوافی تر نەکات کە پێی ئەوترێ ( طواف القدوم ) ی بۆ پێك دێ ، بەلاّم ئەگەر ( طواف القدوم )ی نەکردبوو پێویستە دوای هاتووچۆکردنی سەفا و مەڕوە بیکات ، پاش ( طواف القدوم ) ئیحرامەکە ئەشکێنی ئەگەر نیازی بە حەج هێنا بێ ، یا بە حەج و عەمرە هێنابووی ، هەتا ڕۆژی هەشتی مانگی ( ذی الحجة ) ، بەو ئیحرامەوە بکەوێتە ڕێ بۆ وەستانی عرەفە ، وە وا چاکە خۆی بشۆرێ ، نوێژی نۆهەمی ( ذی الحجة ) نوێژی عەسری بباتە لای نیوەڕۆ بەیەکەوە هەردووکیان بکات ، پاش تەواو بوونی ڕۆژ هێدیهێدی بکەوێتەڕێ هەتا ئەگاتە ( مزدلیفة) ، وا چاکە لەوێ خۆی بشۆرێ ، نوێژی مەغریب باتە لای عیشاء بەیەکەوە هەردووکیان بکات ، لە نیوەی شەوی (١٠) دەەمی ( ذی الحجة ) لە (مزدلیفة) (٧٠) بەرد بە گوێرەی پێویست هەڵگرێ ، ئەو کاتە بڕوا بۆلای (مشعر الحرام ) ، نوێژی بەیانی بکات ، پاش حۆر کەوتن بەرەو مینا بکەوێتەڕێ هەتا ئەگاتە لای (٣) سێ میلەکەی مینا کە دانراون بۆ ڕەجمی شەیتان ، لە یەکەم ودووەم تێپەڕی کە گەیشتە لای سێهەم کە پێی ئەوترێ ( جمرة العقبة) و لەلای مەککەوەیە ، پاش بەرز بوونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێ حەوت بەرد لەو بەردانە لە موز دەلیفە هەڵی گرتووە بیدا لە (جمرة العقبة ) و هەموو جارێ بڵێ : ( اللّه اكْبر ) دوایی ئەگەر قوربانی لەگەڵ حۆی هێنابوو سەری ببڕێ، سەری خۆی بتاشێ یا مووەکەی کورت بکاتەوە ، دوای ئەوەی کە مووی سەری کورت کردەوە یان تاشی هەموو شتێکی بۆ ڕەوا ئەبێ جگە لە ژن و مێردی و نێچیر کوشتن ، دوایی بەرەو مەککە بکەوێتە ڕێ ، حەوت جار بە دەوری کەعبەدا بسوڕێتەوە ، بەم تەوافە حەجەکەی کۆتایی پێ دێ ، هەموو شتێکی بۆ ڕەوا ئەبێ بە ژن و مێردییەوە و نێچیریشەوە ، ئەم تەوافە { طواف الركن ، طواف الزيارة ، طواف الاسلام ، طواف الأضافة} یشی پێ ئەوترێ ، لە نیوەی مانگی ( ذی الحجة ) کاتی ئەو تەوافە دەست پێ دەکات ، وا چاکە لە ڕۆژی جەژندا بێ بەلاّم هەر کاتێ بیکات ئەتوانێ و کاتی بۆ دیاری نەکراوە ، لەکیس چوونی بۆ نییە ، بەلاّم هەتا تەواف نەکات ژن ومێردی بۆ ڕەوا نابێ ،

پاش ئەو تەوافە ئەگەر (طواف القدوم ) و هاتووچۆی نێوان سەفا ومەڕوەی نەکرد بوو پێویستە بیکات ، ئەگەر کردبووی دووبارەی نەکاتەوە ، دوای ئەو تەوافە بەرەو مینا بکەوێتە ڕێ ، شەوی یازدە و دوازدەی مانگ لەوێ بمێنێتەوە لە ڕۆژەکانیاندا هەموو ڕۆژێ پاش دەست پێ کردنی نوێژی نیوەڕۆ لە یەکەم میلەوە دەست پێ بکا هەتا ئەگاتە (جمرة العقبة ) یەك لە دوای یەك حەوت بەردیان لێ بدات ، لە ڕۆژی دوانزەی مانگ ئەتوانێ پێش خۆر ئاوابوون مینا بەجێ بێلێ ئەوکاتە بەرد لێدانی ڕۆژی سیازدەی مانگی لەسەر نامێنێ ، ئەگەر مایەوە شەوی سیانزەی مانگ پێویستە لە ڕۆژەکەیا حەوت بەرد بدات لە هەر سێ میلەکە هەر یەکەیان حەوت بەرد . هەرکەسێ فڕەدانی بەرد بۆ میلەکان بەجێگەی نەپەری بەدەستیان قەستبێ یا نە ، وەیا لەجێگەی دیاری کراو ئیحرام نەبەستێ پێویستە لەسەری مەڕێ یا شتێ سەر ببڕێ .

بەو جۆرەی باسمان کرد حەجەکەی کۆتایی پێ دێ ، هەموو شتی بۆ ڕەوا ئەبێ بە ژن و مێردی و نێچیریشەوە ، ئەو کەسەی ئیحرامی بە حەج بەستووە لە ڕۆژی (١٤)ی مانگی ( ذی الحجة ) بچێتە دەرەوەی شارەوان مەککە و ئیحرام بە عەمرە ببەستێ و بێتەوە بۆ مەککە حەوت جار بەملاولای خانەی خوادا بسوڕێتەوە ، پاش ئەو تەوافە حەوت جار هاتوو چۆ بکات لە نێوان سەفا و مەڕوەدا ، دوای سەری بتاشێ یا موی سەری کورت بکاتەوە ، عەمرە بەوانە کۆتایی پێ دێ و پێویستی بە وەستانی عەرەفە نی یە .

کەواتە ڕوکنی حەج پێنج شتە : ١- ئیحرام ، ٢- طواف ، ٣- هاتووچۆی نێوان سەفا و مەڕوە ، ٤- وەستانی عەرەفە ، ٥- تاشینی سەر یان کورت کردنەوەی مووی سەری .

ڕوکنی عەمرە چوار شتە : ١- ئیحرام ، ٢- طواف ، ٣- هاتووچۆی نێوان سەفا و مەڕوە ، ٤- تاشینی سەر یان کورت کردنەوەی مووی سەری.

ئەو شتانەی قەدەغە کراون لە کاتی حەج وعەمرەدا شەش شتن :

١/ پۆشینی بەرگی دوراو و داپۆشینی دەست و پێ ، جگە لە دوو خاولی بۆ سەر شان و خوارەوەی پیاو ، بەڵام ژن ئەتوانێ خۆی بە هەموو بەرگێ داپۆشێ ، جگە لەڕومەت و چاوی .

٢/ بەكار هێنانی بۆنی خۆش بۆ هەموو جێگەی لەشی ، ئەگەر بەكاری هێنا پێویستە مەڕێ یا بزنێ سەر ببڕێ .

٣/ تاشینی مووی سەروو هەڵكەندنی مووی لەشی و نینۆك كردن ئەگەر ئەوانەی كرد پێویستە مەڕێ یا بزنێ سەرببڕێ ، ڕشتنی چاو و خۆشۆردن و ڕێك خستنی مووی زیانی نی‌یە .

٤- چوونە لای ژن ئەگەر ژن و مێردی كرد بەر لە بە جێ هێنانی دوو ڕوكن لەسەر تاشین و فڕێدانی بەرد بۆلای ( جمرة العقبة ) و (طواف الافاضة ) حەجەكەی پوچ ئەبێتەوە پێویستە تەواویشی بكا ، پێویستە ساڵی تر بیكاتەوە ، عەمرەیش وەك حەج وایە لەو كارەدا ، پێویستە ووشترێ سەر ببڕێ وئەگەر نەی بوو ڕەشەووڵاخێ سەرببڕێ و ، تەواویشی بكات ، پێویستە ساڵێ تر بیكاتەوە ، عەمرەیش وەكو حەج وایە لەو كارەدا پێویستە ووشترێ سەرببڕێ ئەگەر نەی بوو ڕەشە ووڵاخێ ئەگەر ئەوانەی نەبوو حەوت مەڕ یا حەوت بزن سەرببڕێ ، ئەگەر ئەوانە نەبوون بە ئەندازەی نرخی هوشترێ خواردەمەنی بكڕێ و بیدات بە هەژارانی مەككە ئەگەر ئەوەشی نەبوو بۆ هەموو مودەی ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێت ، ئەگەر دوای بەجێ هێنانی ئەو سێ ڕوكنە چووە لای ژن حەجەكەی لەكیس ناچێ ، بەڵام پێویستە ووشترێ یا ڕەشە ووڵاخێ یا حەوت مەڕ یا حەوت بزن سەرببڕێ .

٥ - ماچ كردنی ژن و گاڵتەكردن بە ئارەزووەوە دەست لێدانی ژن ، ڕژاندنی شەهوەت بەدەست ئەنقەست ، ئەگەر ئەوانەی كرد پێویستە مەڕێ یا بزنێ سەرببڕێ .

٦ - نێچیر كردنی زیندەوەرانی گۆشت خوراو ، ئەگەر كردی پێویستە زیندەوەری وەك ئەوان سەری ببڕی بۆ خێر ، ئەگەر نێچیری گرت پێویستە بەرەڵای بكات ، بە درێژی لە نامەكانی یاسادا باسیان كراوە ئەتوانی تەماشایان بكەین ، كاتێ لە ئیحرامدا بوو پێویستە كەوی ڕاوی و قاز و كەروێشك بوڕام كراو بەرەڵا بكا .

ئەوانەی باسمان كرد لە بەجێ هێنانی حەج و عومرە كورتەیەكە لە باسەكانیانا .

لەبەر ئەوەی حەج و عەمرە وا ئەبێ دوژمنانی ئیسلام قەدەغەی بکەن ، هەروەك لە سالّی حودەیبیی‌دا ڕێگەیان بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوڕێکانی گرت لە سالّی شەشی کۆچیدا بۆیە شایانی خۆیەتی دوای باسی جەنگ بۆ ئیسلام باسی حەجمان بۆ بکرێ .

خوای گەورە ئەفەرموێ :

وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ
فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ
ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ
مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ
فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ
إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى
ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾
ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ
وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ

يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ وَٱتَّقُونِ
يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن
تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ
عَرَفَـٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ
وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ
ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾
فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَـٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ
ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن
يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ
خَلَـٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا
حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾

أُولَٰئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا ۚ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾
وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ ۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي
يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ لِمَنِ اتَّقَىٰ ۗ
وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾

﴿ وَ اَتِمّوا الحَجَّ و العُمْرة لله ﴾ وە ئێوە تەواو بکەن حەج و عەمرە لەبەر بە جێ‌هێنانی فەرمانی خوا کاتێ دەستمان کرد بە بەحێ هێنانیان ، هەرچەندە لای هەندێ لە زانایان پێویست نی‌یە لەسەر موسوڵمانان ، بەڵام کە دەستی پێ کرا پێویستە تەواو بکرێ .

﴿ فَاِنْ اُحصِرتُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە قەدەغە کران لە بەحێ هێنانی حەج وعەمرە و رێگەتان پێ گیرا و بۆتان نەکرا حەج و عەمرە بەکەن لەبەر نەخۆشی و دوژمن وپەك کەوتنیان و ڕووت کردنەوەتان و نە بوونی دارایی‌تان پاش بەستنی ئیحرام ، وەك لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا دوژمنای ئیسلام لە حودەیبی‌یە رێگەیان گرت لە پێغەمبەر(ﷺ) و گەڕانیانەوە ، وەك لەمەو بەر باسکرا .

﴿ فما اِسْتيسَرَ منَ الهَدْيِ﴾ دوایی پێویستە لەسەرتان شتێ ئاسانە بۆتان سەری ببڕن لەو شتانەی ئەکرێن بە قوربانی لای خوارووی مەڕێکە و لای سەرووی ووشترێکە ئەگەر ویستان ئیحرام بشکێنن .

﴿ و لا تُحْلَقوا رءوسَكُمْ حَتى يَبْلُغَ الهَدىُ مَحِله ﴾ وە نابێ ئێوە بتاشن سەری خۆتان دوای شکاندنی ئیحرام هەتا ئەگا قوربانیەکەتان بەو جێگەیە قوربانی حەج تیا سەرئەبڕێ کە مینایە ، بۆ عەمرە ، مەکەیە ، لای شافیعی‌یەکان پێویست نی‌یە حەج و عەمرە بگێڕێتەوە بە قەزا بەڵام لای حەنەفی‌یەکان پێویستە بکرێتەوە.

﴿ فَمَنْ كانَ مِنكُمْ مَرِيضاً او بِهِ اذىً منْ رَاْسِهِ ﴾ دوایی هەر كەسێ لە ئێوە نەخۆش بوو، یا ئازارێ بەسەری ئەو كەسەوە بوو وەك برین و دومەڵ ، ئەتوانێ سەری بتاشێ ، ئەوكەسە بەر لە گەیشتنی قوربانی‌یەكەی ئەتوانێ سەری بتاشێ .

﴿ ففديةٌ من صيامٍ أو صدقةٍ أو نسكٍ ﴾ دوایی پێویستە لەسەر ئەو كەسە تۆڵەیە بدات لە گرتنی سێ ڕۆژ ڕۆژوو یا خواردەمەنی ببەخشێ بە شەش كەس هەریەكەیان نیوە ساعێ، یا زیندەوەرێ سەر ببڕێ بەلای كەمەوە مەڕێ بێ .

﴿ فاِذا اَمِنتُمْ فمن تمتع بالْعُمرةِ الى الحَجْ ﴾ دوایی هەر كەسێ ترسی نەبوو ، هیچ شتێ ڕێگەی نەگرتبوو بۆ تەواو كردنی حەج دوایی هەر كەسێ عەمرەی كرد ، لە پاشدا هەر لەو ساڵەدا دەستی كرد بە حەج كردن ، عەمرەكەی تەواو كرد و ئیحرامەكەی شكاند مایەوە بەخۆشی ڕای بوارد ، لە ڕۆژانی حەج دا نیازی بەستەوە بە كردنی حەج .

﴿ فما اِسْتيسَرَ منَ الهَدْيِ ﴾ دوایی پێویستە لەسەر ئەو كەسە ، شتێ بۆی ئاسان كراوە لە قوربانی بەلای كەمەوە سەر بڕینی مەڕێ .

﴿ فمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصيامُ ثلاثةَ ايامِ فی الحَجِّ وسَبْعَةٍ اِذا رَجَعْتُمْ ﴾ دوایی هەر كەسێ قوربانی دەست نەكەوتبوو ، نەیتوانی بیكڕێ پێویستە لەسەری ڕۆژووی سێ ڕۆژو لە و ڕۆژانەدا خەریكی بە جێ هێنانی حەجە ، وا چاكە ڕۆژانی حەوتەم و هەشتەم و نۆهەمی ( ذی الحجة ) بێ ، حەوت ڕۆژی تر بەڕۆژو بێ كاتێ لە حەج گەڕایەوە بۆ نشتیمانی خۆی با لە ریگەیشدا بێ ، ئەگەر ئەو سێ‌ڕۆژەی بۆ نەگیرا پێویستە لەسەری بیگرێتەوە دوای رۆژانی حەج و سەربڕینی لەسەر پێویست نی‌یە .

﴿ تلكَ عشرةٌ كامِلة﴾ ئەوانە هەردوانیان دە رۆژی تەواو ئەكەن ، ئەو ڕستەیە چاكتر و باشتر بۆمان ئەچەسپێ ڕۆژووی ئەو (١٠) ڕۆژە ، بۆمانی ڕوون ئەكاتەوە پیتی (و) لە ( و سبعة) بە مانا (او) نیە وەك (و ) لەووشەی ( مثنی و ثلاث و رباع ) .بەمانای (أو)٥.

﴿ ذ لك لِمَنْ لَمْ يَكُنْ اَهْلُهُ حاضرى المَسجِدِ الحرامِ ﴾ ئەو فەرمانەلە پێویستی قوربانییەك و ڕۆژووی ( ١٠ ) ڕۆژ بۆ کەسانێکە لە دانیشتوانی شارەوانی مزگـەوتی ڕێـزدار نـەبێ ، ئەو کەسە هیچ شتێکی لەسەر پەیەست نییە بۆ ئەو کەسانەی نیازیان بە عـەمرە بەستبێ لە دەرەوەی شارەوانی مەکە .

﴿ و اتّقوا اللّهَ ﴾ وە ئێوە لە خوا بترسـن و خۆتـان بپـارێزن لـە قەدەغـە کراوەکـان لەکاتی حەجدا ، ولە کاتی عەمرەدا هەر فەرمانێکتان پێ ئەدرێ حێ بەحێی بکەن .

﴿ و اعْلَموا انّ اللّهَ شَديدُ العِقابْ ﴾ وە ئێوە بزانن کە بە ڕاستی خوا سزای سەحتە بـۆ کەسانێ فەرمانبەرداری خوا نەبن .

پاش ئەوە خوای گەورە باسـی حـەج و عـەمرەی بـۆ کردیـن بۆمـانی ڕوون ئەکاتـەوە کاتەکانی لەیەك جوێن ، هەموو کاتیسالْ کاتە بۆ بەستنی نیاز بە عەمرە ، بەلاّم نیاز بەسـتن بە حەج سالّی جارێك و پێویستە لە مانگەکانی حەجدا بێ ، وەك ئەفورموێ :

﴿ الحَجّ اَشْهُرُ مَعْلوماتْ ﴾ کاتی بەجێ هێنانی حەج چەند مانگێکی دیـاری کـراوون ناوبراون کە بریتییە لە انگی ( شوال ، ذیی القعدة ، (١٠) ڕۆژی یەکەمی مـانگی ذی الحجة ) ، کەواتە ئەو کەسەی نیاز بە حەج ببەسـتێ بـەر لەئـەو کاتانـە حەجەکـەی بـۆ نانوسرێ ، ئەو کەسـەی نیاز بە حەج ببەستی لەو کاتانـەدا حەجەکـەی دروسـتە و دوایـی دەست بکا بە کردنی پاش ماوەی حەجەکەی .

﴿ فمَنْ فرَضَ فيهِنّ الحَجّ ﴾ دوایی هەر کەسی پێویستی کرد لەسەر خۆی لەوکاتانەدا بە نیاز بەستنی بە کردنی حەج و نیازی هێنا .

﴿ فلا رفثَ ﴾ دوایی پێویستە ژن ومێردی نەکات ،ئەگەر لە کاتی حەجە و عـەمرەدا چـووە لای ژنەکـەی حـەج و عەمرەکـەی لـە کیـس ئـەچێ ، پێویسـتە هـەموو کـار و کردەوەکانیان بەجێ بهێنێ ، سەرەڕای ئەوەش پێویستە لە سالّی دوایدا بچێتەوە بۆ حەج و عەمرەکەی و بەسەریان بگرێتەوە .

﴿ و لا فُسوق ﴾ وە دەرچوون لە سنووری یاسای خوادا نی‌یە بە جنێو دان و کردنی قەدەغە کراوەکان وەك درۆ و فێلّ وشتی تر.

﴿ وَ لا جِدالَ ﴾ چەنە بازی قالّە قالّ و دەمە دەمە لەگەلّ جگەی خوێی ، لە خۆهەلّ کێشان و دوژمنایەتی کردن و شتی تری نا رەوا نابێ بکرێ .

﴿ فی الحَجّ ﴾ ئەوانەی ڕابواردن پێویستە نەکرێن لەکاتی حەجدا ، خوا هانمان ئەدا بۆ چاکە کردن پاش ئەوەی ئەوانەی قەدەغە کرد ، ئەفەرموێ :

﴿ وَما تَفْعَلوا منْ خَیرٍ یَعْلَمهُ اللّه ﴾ وەهەر شتێ ئێوە بیکەن لە چاکە خوا ئەزانێ بەو شتە ، هیچ شتێ لە خوا وون نابێ ، پاداشتی ئەداتەوە .

دانیشتوانی یەمەن ئەهاتن بۆ کردنی حەج بەبێ توێشوو خواردەمەنی ئەیان ووت : ئێمە پشتمان بە خوا بەستووە ، بۆ خانەی خوا ئەچین ، ئەبوون بە بار بەسەر موسولّمانانەوە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ و تَزودوا فاِنّ خَیرَ الزادِ التَقوی ﴾ وە ئێوە توێشوو هەلّگرن بۆ ڕێگەی حەج وعەمرەتان مەبن بەبار بەسەر خەلّکەوە ، دوایی بەڕاستی چاکترین توێشوو پارێزگاریتانە بۆ فەرمانەکانی خوا و کردنی چاکە ، توێشووش هەلّگرن بۆ کاتی زیندو بونەوەتان.

﴿ و اتَقونِ یا اُولی الاْلْبابْ ﴾ وە ئێوەش بترسن لەمن ئەی ئەو کەسانەی خاوەن ئەقلّن، وهەمووکارێ ئەزانن لە چاك وخراپ ، ترس لە خوای گەورە گەورەترین سەرمایەیە بۆتان.

ئادەمیزاد بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام بازرگانی و مامەلّەیان ئەکرد لە ڕۆژانی کردنی حەج و غەمرەدا ، هەندێ لە موسولّمانان وایان ئەزانی بازرگانی قەدەغەیە ، خوای گەورە گومانی بڕین وبۆی ڕوون کردنەوە بازرگانی دژی یاسای خوا نی‌یە ، دلّسۆزی بەکار هێنانە بۆ جێبەجێ‌کردنی کارو کرەوەی حەج وعەمرە ، زیانی نی‌یە بازرگانی بۆ حەج ، بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ ليسَ عَلَيْكُمْ جُناحٌ انْ تَبْتَغوا فضلاً منْ رَبِكَمْ ﴾ هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نی‌یە کە ئێوە داوای سوود و سامان و خواردەمەنی بکەن لەپەروەردگاری خۆتـان بـەهۆی قـازانجی بازرگانی‌یەوە مامەڵە بکەن ، لە کاتی چونتان بۆ حەج و عەمرە ، بە جۆرێ لـە سـنوری یاسای ئیسلام دەرنەچێ .

﴿ فإذا اَفَضتُمْ منْ عَرَفاتٍ ﴾ دوایی کاتێ ئێوە دەرچوون لە عەرەفات و پاڵەپەستۆتان کرد ئەگەڕێنەوە لەعەرەفات کۆمەڵ کۆمەڵ .

﴿ فاذْكُروا اللّهَ عِنْدَ الَمشْعَرِ الحَرامِ ﴾ دوایی ئێوە یادی خوا بکەن و ناوی بـەرن لـەلای دروشمی ریزدار کە جێگەیەکی ناسراوە لە موزدەلیفە ، نوێژی مـەغریب و عیشـای تێـدا بکەن و ناوی خوا بێنـن لـەوێدا وبلێـن : { لبیـك } { لاالـه الا الله} { الحمـد لله } بە پارانەوەی تر .

﴿ و اذْكُروه كَما هَداكُمْ ﴾ وەئێوە یادی خوا بکەن و ناوی بەرن بـەو جـۆرەی خـوا ئێوەی ڕانومایی کردووە بە شیرینتر ڕانومای بۆ بە جێ هێنانی حەج و عـەمرە وشـارەزای کردن لە جۆرەکانی پەرستنی خوا .

﴿ وَ اِنْ كُنْتُمْ منْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضالينْ ﴾ وە بەراستی ئێوە لە پێش ئەو ڕانومای‌یە لـەو کەسانە بوون ڕێگەی ڕاستان وون کردبوو بەهۆی بێ‌باوەڕیتانەوە .

عەرەبەکان بەر لە هاتنی ئیسلام کە لە حەج وعەمرە ئەبوونەوە کۆئەبوونەوە و دەستیان ئەکرد بە خۆهەڵکێشان ، باسی بـەرزی پلـە و پایـەی خۆیانیـان ئـەکرد بـە هۆنـراوە و پەخشان بە تایبەتی قورەیشی‌یەکان ، تێکەڵاوی کەسی تریان نەئەکرد وخۆیـان بـە گـەورە ئەزانی ، جا بۆ ئەوەی بزانـن حـەج کۆبوونـەوەی گشـتی موسـوڵمانانە گـەورەیی و بچوکی لە ئیسلامدا نی‌یە بە جگەی لە خوا ترسان هەموو وەك یـەك وان ، جیـاوازی لـە چینایەتیا قەدەغەیە بۆیە هەموویان لە حەجدا ڕووتن و لەیەك بەرگدان ، نموونـەی ئـەوەیش ئەوەیە هەموویان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە ، ئەو شتانەی ئێوە ئەیکەن قەدەغـەن ، خوا فەرمانی پێداون واز لەو شتانە بێنن و یادی خوا بکەن و ناوی بەرن وەك ناوی بـاب

و باپیرتان ئەبەن ، یا ناوی خوا بێنن بە باشتر وچاکتر لەوەی ناوی باب وباپیرانتان دێنـن ، واز لە ناو بردنی باب و باپیرانتان بێنن ، بـا هـەمووومان فەرمانـەکانی خـوا فـێربین ، بـەو بۆنەوە ئەبن بە نەتەوەیەکی یەکگرتوو ودادپەروەر ، یادی خوا یەکتان ئەخا ، ناوی بـاب و باپیرانتان پەرژ و بلاو بێ هێزتان ئەکات ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ ثُمّ افیضوا منْ حَیثُ اَفاضَ الناسُ ﴾ پاشان ئێوە بوەستن و دەرچن و بلاوبنـەوە لـەو جێگەوە خەلکی تر ئەوەستن و دەرئەچن ، نەك لە موزدەلیفەوە خۆتان بە بالاّتر بزانن .

﴿ و اسْتَغْفِروا اللّه ﴾ وە ئێوە داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکەن لـەو جیاوازییـەی ئێوە لەوەستان و دەرچونتان ، لەو نەزانییەتان بـۆ بـەجێ هێنـانی حـەج و عـەمرە ، لـە گۆڕانی یاسا بە گوێری ئارەزووی خۆتان .

﴿ اِنّ اللّهَ غَفُورٌ رَحیمْ ﴾ بەڕاستی خوا لێ خۆش بوونی زۆرە ، زۆر میهرەبانە لەگـەڵ ئەو کەسانەدا پەشێمان ئەبنەوە لە گوناه کردنیان و داوای لێبووردن ئەکەن لە خوا .

﴿ فَإذا قَضَیْتُـمْ مَناسِکَکُمْ ﴾ دوایـی کاتـێ ئێـوە لێبوونـەوە و بـەجێتان هێنـا هـەموو پێویستییەکانی حەج وعەومرە و سەربڕینی قوربـانی و بـەردە بـارانی جومرەتولعەقەبـە ، مانەوەی شەوەکان لە مینا .

﴿ فَاْذکُروا اللّه کَذکْرِکُمْ آباءکُمْ ﴾ دوایی ئێوە یـادی خـوا بکـەن و نـاوی بـەرن بـە وێنەی ناو بردنی ئێوە بۆ باوکـەکانتان ، بلێـن : سـوپاس و گـەورەیی و تـاك وتەنـهایی و هەمووچاکەیەك بۆ خوا یە .

﴿ اَوْ اَشَدّ ذِکرا﴾ یا یە زۆرتر و سەخت تر لە ناو بردنی باوکـەکانتان ، چونکـە هـەر خوایە چاکە ئەکات لەگەڵ خۆتان و باوکەکانتان ، هەر خوا شایانی سوپاس و یاد کردن و ناو بردنە ، هەرگییز ناوی باوباپیرارنتان مەبەن دوای حەج واز لە نەزانین و ڕەوشتی پیـس بێنن ، دوای ڕەوشتی بەرزی ئیسلام بکەون .

﴿ فمِنَ الناسِ مَنْ یَقولُ رَبّنا آتِنا فِي الدُنیا﴾ دوایی هەندێ لە ئادەمیزاد هەن ئـەڵێن : ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ ببەخشە بە ئێمە لـە جیـهاندا پلـەو پایـەی بـەرز و سـامان و دارایی زۆر و سەرکەوتن بەسەر دوژمنانمانا ، ئەوانیش بریتی بوون لە بـت پەرستـەکان ، بێگومان لەکاتی حەج و عەمرە هەر داوای جیهانیان ئەکرد ، کاریان بە پاشەرۆژ نەبوو .

﴿ وَ مالَهُ فی الآخِرةِ منْ خَلاقْ ﴾ وە بۆ ئەو جۆرە کەسانە نی‌یە و نابێ هیچ جۆرە بەش و بەهرەیەك لەرۆژی دواییدا چونکە ئەوان هەموو ئاواتیان بۆ کالاّ و ئالّفی جیهانە .

﴿ وَمِنهُمْ مَنْ یَقولُ رَبَنا آتِنا فی الدُنیا حَسَنَةً ﴾ وە هەندێ لە ئادەمیزاد هەن ئەوانەی خەریکی حەج کردنن ئەلّێن : ئەی پەروەردگاری ئێمە ، تۆ ببەخشە بە ئێمە و بماندەرێ لەم جیهانەدا چاکەی گەورە و یارییدانمان و سەرکتنمان بەسەر دژمنانی ئیسلامدا .

﴿ وَ فی الآخِرَةِ حَسَنة ﴾ وە لە دوا رۆژیشدا چاکەی گەورە ، وەك لێ بووردنمان و میهرەبانیت لەگەلّمان و پاداشت دانەوەمان بە چاکە پێمان ببەخشە .

﴿ وَقِنا عَذابَ النار﴾ وە تۆ ئێمە بپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ ،وە لێمان ببورە و لێمان خۆش ببە .

لێرەدا ئامۆژگاریمان ئەکات کە لە پارانەوەماندا تەنها باسی جیهان و ئەمرۆ نەکەین ، یادی دوارۆژ بەتەنها نەکەین ، بەلّکو ناوی هەردووکیان بەیین لەکاتی‌ی پارانەوەماندا وە داوای چاکەی هەردوو لایان بکەیین ، چونکە پێویستمان بە هەردوولایان هەیە ، لە جیهاندا کار ئەچێنین و لە پاشەرۆژدا بەرهەمەکەی کۆئەکەینەوە .

﴿ اوُلئِكَ لَهُمْ نَصیبٌ مِما كَسَبوا﴾ ئەو تاقمەی داوای چاکەی هەردوو جییهان ئەکەن بۆیان هەیە بەشێکی گەورە لە چاکە و پاداشت لەبەر ئەوشتەی کردوویانە لە جیهاندا.

﴿ وَ اللّهُ سَریعُ الحِساب ﴾ وە خوا لەماوەی‌ی زۆر کورتا پرسیار لە ئادەمیزاد ئەکا و کۆتایی پیێدێنێ با وەك خۆیان وکرداریان زۆر بێ .

﴿ وَاذْكرُوا اللّهَ فیْ ایامٍ مَعْدوداتْ ﴾ وە ئێوە یادی خوا بکەن و ناوی ببەن بە گەورەیی ، لە چەندین رۆژی هەلّبژێراو لە رۆژانی یازدە و دوازدە و سیازدەی مانگی ذی الحجة لە رۆژەکانی مینادا و بەردە باران کردنی میلەکان .

﴿ فَمَنْ تَعَجَلَ فی یَومَینِ فَلا اِثمَ عَلَیهِ ﴾ وە هەر کەسێ پەلە بکا بۆ دەرچوون لە میناوە بۆ مەکە لە دوای دوو رۆژوو نەمێنێتەوە بۆ رۆژی سێزدە ، بەردە بارانی هەر سێ

میلەکانی کردبێ لە دوو ڕۆژەی پێشوودا دوای هاتنی کاتی نیوەڕۆ بەر لە ئاوابوونی خۆری دوازدەی مانگ ، دوایی هیچ گوناهی لەسەر نی‌یە گەڕانەوەی بۆ مەکە .

﴿ وَ مَنْ تَأخَرَ فَلا اِثمَ عَلَيهِ لِمَنِ اتّقى ﴾ وە هەر کەسێ چوونی بۆ مەکە دوا بخاو لە مینا بمێنێتەوە هەتا ڕۆژی سیازدەهەم ، دوایی هیچ گوناهێکی لەسەر نی‌یە بە مەرجێ شەو لە مینا بێ و پاش هاتنی کاتی نیوەڕۆ پێویستە بەردە بارانی هەرسێ میلەکە بکاتەوە ئەوەش بۆ کەسێکە لەخوا بترسێ و خۆی لە گوناه بپارێزێ ، هەرکام لە پەلە کردن و مانەوە لە مینا مرۆڤ خۆی سەربەستە .

﴿ وَاتّقوا اللّه ﴾ وە ئێوە لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە گوناه لەبەر خوا ، هەموو فەرمانەکانی بەجێ بێنن لە حەج ولە عەمرەدا ، لە هەموو کاتەکانیانا و ، کاتی ئیحرام پێویستە قەدەغە کراوەکان نەکەن .

﴿ وَاعْلَموا اَنَكمْ اِلَيـهِ تُحْشَرونْ ﴾ وە ئێوە بزانن کە بەڕاستی ئێوە بۆلای خوا کۆئەکرێنەوە، بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵەکانی ، زیندوو بوونەوەتان بۆیە پێویستە لە خوا بترسن .

وَمِنَ
ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ
عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ
فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۗ وَٱللَّهُ
لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ
بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ

ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ  ٢٠٧

﴿ وَمنَ الناسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلهُ فى الحَياةِ الدُنياْ ﴾ وە هەندێ لە ئادەمیزاد هەن گفت وگۆیان تۆ خۆش حاڵ ئەکا، خۆشەویستیخۆیان بۆتۆ دەر ئەبرن بە زمانی لوس، بەجۆرێ جێگەی خۆی ئەگرێ لە دڵی تۆدا ، لە ژیانی جیهاندا بۆ بەدەست هێنانی سوودی ئەمرۆی خۆیان و وەرگرتنی تالاّن و نەکوشتنی خۆی و پاراستنی سووی تایبەتی خۆی ، خۆشەویستی دەرئەبرێ .

﴿ وَ يُشْهِدُ اللّٰهَ على ما فى قَلْبِهِ ﴾ وە خوا ئاگادارە و شایەتی ئەدا لەسەر شتێ لە دڵی ئەو کەسەدایە خۆی پێ دەرئەخات ، یانێ ئەوەی بە دەم ئەیلێ دڵیشی واییە بە گوێرەی پڕوپاگەندەی خۆی .

﴿ وَهوَ اَلَدّ الخِصامْ ﴾ وە ئەو کەسە گەورەترین و سەرسەخت ترین دوژمنانی تۆن ، لە ڕووی زەویدا دوژمنترین کەسە بۆ چاکە و چاکەکاران .

﴿ وَ اِذا تَوَلى ﴾ وە کاتێ گەڕایەوە لەلای تۆ لە دوایگفت وگۆی نەرمی ، یا ئەو کەسە داوای چاکە کردن ئەکا کاتێ بوو بە فەرمان ڕەوا .

﴿ سَعى فى الاَرضِ لِيُفْسِدَ فيها ﴾ کۆشش ئەکا و ئەگەڕێ بەناو زەویدا بۆ خوێن ڕشتن لە زەویدا وبۆ ئاژاوە نانەوە و لەناو بردنی موسوڵمانان .

﴿ وَ يُهْلِكَ الحَرْثَ وَالنّسلْ ﴾ وە بۆ لەناو بردنی کێڵگەو کشت وکاڵ ، بۆ لەناو بردنیی زیندەوەران بەتایبەتی نەوەی ئادەمیزاد .

﴿ و اللّٰهُ لا يُحِبُ الفَسادْ ﴾ وە خوا خۆشی ناوێ خراپە کردن و پەسەندی ناکا ، لە خوێن ڕشتن و کاری خراپ کردن و زۆر بە خەشمە لە خراپەکاران .

﴿ وَ اِذا قيلَ لَهُ اتّقِ اللّهَ ﴾ وە هەر کاتێ بێژرا بەو کەسە : تۆ لەو خوا بترسە و خۆت لە سزای خوا بپارێزە ، خراپە و دووڕوویی مەکە .

﴿ اَخَذَتْهُ العِزةُ بالاِثمْ ﴾ دەمار و فیز ئەیگرێ بەهۆیی گوناه کردنی نالەبار و ستەم کردن و گوێ نەگرتن لە ئامۆژگاری .

﴿ فَحَسْبُهُ جَهَنَمْ ﴾ دوایی بەسە بۆ ئەو کەسە سزای دۆزەخ بۆ سزادانی هەتا هەتایە، ئەو ڕستەیە گەورەترین هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسە و هەموو کەسی وەك ئەو وا بێ .

﴿ وَ لَبِئْسَ المِهادْ ﴾ وە سوێند بە خوا خراپترین ژێرە خەرە دۆزەخ ، خراپترین جێگەی خەوتنە بۆی .

ئەو سێ ئایەتە هاتۆتە خوارەوە دەربارەی ( ئەخنەسی کوڕی شورەیقیی سەقەفی ) کە پەنای بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هێنا ، مرۆڤێکی گفت وگۆ شیرین و قۆز و چاك بوو ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕوو خۆشی و گفت وگۆی شیرینی و ڕازاوەیی ئەوی لاخۆش بوو ، ئەیووت : من هاتووم بۆلای تۆ و بەڵێندەرم بۆ ئیسلام ، بەرگی حزمەتکاری ئەپۆشم و گوێ ڕایەڵ ئەبم ، لەسەر ئەوانە خوای ئەکرد بە شایەت کەچی ئەو مرۆڤە درۆزنە لەشارەوانی وسنووری مەدینە دەرچوو کشت وکاڵی هەندێ دانیشتوانی سووتان ، بە شمشێر دەست و پێی هەندێ لە ئاژەڵی قرتاند ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ وَمِنَ الناسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکان .

هەندێ لە زانایان بۆ مانا کردنی ئەو ئایەتانە ئەڵێن : ئادەمیزاد بوون بە کاربەدەست دەست ئەکەن بە چەوساندنەوەی ژێر دەستەکانیان ، هەوڵی گێرە شێوێنی ئەدەن لە زەویدا بۆ ئەوەی خوێن ڕێژی و کوشتن و ڕووتانەوە و چەوسانەوە بەکار بهێنن لە زەویدا .

﴿ وَ يُهْلِكَ الحَرْثَ وَالنّسلْ ﴾ وە کشت وکاڵ و بەری ئاژەڵ لەناو ئەبا ، وەك کاربەدەستانی ستەمکاری ئەم سەردەمە ، ئابووری و کارگەکان و نەخۆش خانەکان و زانکۆکان و هۆی ژیان و درەخت و جێگەی پەرستن لەناو ئەبەن ، ژەهری کوشندە بەنێو

هەوادا و بەناو ئاوی خواردنەوەدا بلاو ئەکەنەوە ، بۆ بنەبڕکردنی ئادەمیزاد و هەموو گیان لەبەران و نەمانی گژوگیا ، بەهەر جۆری بۆیان بکرێ ئاگری جەنگ گڕدار ئەکەن ، کەچی دەهۆڵی سەربەستی و ئاشتی و بەیەکەوە ژیان لێ ئەدەن ، چەك و ئاگر بلاوئەکەنەوە بەڕووی زەویدا .

﴿ و اللّٰهُ لا يُحِبُ الفَساد ﴾ وە خوا خۆشی ناوێ خراپەکردن ، چ شتێ بێ خراپتر لە دروست کردنی جەنگ و بەکار هێنانی چەکی ڕوخێنەر لە دژی هەموو گەلان ، بۆ داگیر کردنیان و تالآن کردنی سامانیان ، بێبەش کردنی خاوەنەکانیان و چەوسانەوەیان.

﴿ وَ اِذا قيلَ لَهُ اَتقِ اللّٰهَ اَخَذَتْهَ العِزةُ بالإثمْ ﴾ وە هەر کاتێ بێژرابێ بەئەو کەسە : تۆ لە خوا بترسە و کاری خراپە مەکە ، گەورەیی و دەمار ئەو کەسەی ئەگرت بە هۆی خۆ بە گەورە دانان و گوناه کرنەوە بێگومان کاربەدەستی خوێن ڕێژ لای گرانە رانموی بکرێ بۆلای چاکەکردن و سوودی دانیشتوان ، ئەگەر بترسێنرێ بە سزای خوا خراپتر تووڕە ئەبێ ، وا ئەزانێ ئەو پلەیە ئەو هەیەتی وای لێ کردووە لە هەموو ئادەمیزاد گەورەتر بێ لە لایەن بیر کردنەوە لە ڕووداوا ، لە هەموویان سەیرتر وا ئەزانێ لە هەموویان ژیرترە ، بەلکو وا ئەزانێ لە هەموو مافێ بەرزترە ، ئیتر چۆن دروستە پێی بێژرێ لە خوا بترسە، ئەگەر بەراوردی یاسای ئیسلام بکرێ بەو هەموو دادپەروەرییە کە هەیەتی لەگەڵ ئەو شتانەی کار بەدەستانی ڕۆژئاوا و ڕۆژ هەلآت ئەیکەن ، وەك بەکار هێنانی بۆمبای هایدرۆجین و نایترۆجین ، هیچ شتێکمان بۆ نامێنێتەووە جگە لەوەی بلاوە بکەین بە یاسای ئیسلام و واز لە خۆ ماندوو کردنی خۆمان نەیەرین بۆ ئەو مەبەستە .

﴿ فَحَسْبُهُ جَهَنَمْ وَ لَبِئسَ المِهادْ ﴾ دوای بەسسە بۆ ئەو کەسە ئاگری دۆزەخ ، وە دۆزەخ خراپترین ژێرە خەرە بۆی .

﴿ وَ مِنَ الناسِ منْ يَشْرىْ نَفْسَهُ اَبْتِغاءَ مَرضاتِ اللّٰه ﴾ وە هەندێ لە ئادەمیزاد ئەفرۆشێ و ئەبەخشێ گیانی خۆی بۆ سەر کەوتنی ئیسلام ، فەرمان ئەدا بە چاکە و ڕێگە لە خراپە ئەگرێ لەبەر خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوا ، ئەو کەسانە بریتین لە باوەڕداران گوزەرانی ژیانیان لا مەبەست نییە وەك بێباوەڕان .

زانایان بۆ هۆی هاتنه خوارەوەی ئەو ئایەتە زۆر هۆیان باس کردووە ، بەلاّم هەمویان ئەگەرێنەوە بۆلای ئەو کەسانەی فەرمانییان بە چاکە کردووە و ڕێگە لە خراپە ئەگرن ، گیانی خۆیان بۆ بەرزی ئیسلام بەخت ئەکەن و بۆ ئەو مەبەستە واز لە خۆشی جیهان ئەهێنن ، خۆیان ئەکەن بە خۆرە بۆ گیانی ستەمکاران ، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ هەتا کۆتایی ژیان .

﴿ وَ اللّه رَؤوفٌ بالعِباد ﴾ وە خوا خاوەن بەرزەیە و نەرم ونیانە بۆ بەندەکالنی خۆی.

وە لە میهرەبانی خواییە کەسی سەد ساڵ تەمەنی لە گەناه و بێ باوەڕیدا بەسەر بردبێ لە کەمترین ماوەی تەمەنیدا پەشێمان بێتەوە و باوەر بهێنێ بە ڕاستی خوا هەموو سزای لسەر هەلئەگیرێ ، بەمەرجێ پەشیمان بوونەوەکەی بەپێ یاسا جێگەی خۆی گرتبێ .

پاش ئەوەی خوای گەورە ئادەمیزادی کرد بە دوو بەشەوە : باوەڕداران و بیباوەڕان، ڕانموییان ئەکا بۆلای ئاشتی و ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ
فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ
إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ
مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
﴿٢٠٩﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٢١٠﴾

﴿ یا اَیُّها الَّذینَ امَنوا اُدْخُلوا فی السِّلْمِ کافةً ﴾ ئەی کەسانی باوەرتان هێناوە ئێوە بچن بۆ نێو پەرستنی خوا و ملکەچیتان بۆی لە هەموو فرمانەکانیدا ، بچنە ناو ئیسلام و ئاشتی هەمووتان ، ئەو ڕوون کردنەوەیەی خوای گەورە بۆ دوو ڕووەکان بێ کە بە ڕەواڵەت باوەڕیان هێنا بوو ، یا بۆ لای هەموو موسوڵمان بی مەبەست ناگۆڕێ ، کە باوەڕ هێنان و پەرستن و ئاشتی و یاریدەدانی یەکتری بە وازهێنان لە جەنگ و دوژمنایەتی ، ئارەزواتی جیهانی بخەنە ژێر پێ بەمەرجێ سوود بەخش نەبێ بۆ کۆمەڵی ئیسلام ، خۆتان بخەنە ناو توانای ئیسلام بە کردەوەتان و گوفتارتانەوە .

﴿ وَلا تَتَّبِعوا خُطُواتِ الشَّیْطانْ ﴾ وە ئێوە دوای هەنگاو و گومانی شەیتان مەکەون ، وەك دوو بەرەکی دوژمنایەتی و خراپەکردن ، مرۆڤ کە وەڵامی بانگەوازی خوای دایەوە و بوو بە موسوڵمان ئەچێتە نێو ژیانێ کە هەمووی ئاشتی و بێوەیی‌یە ئەچێتە ناو بڕوا بە خۆ بوون و ئاسودەیی‌یەوە ، ئەچێتە ناو هێمنی و خۆشەویستی‌یەوە ، سەرگەردانی و دڵە ڕاوکێ نامێنێ، ئاشتی خواز و دڵسۆز ئەبێ بۆ خۆی وگەل ، خاوەن ئاین و بە ویژدان ئەبێ لەگەڵ جانەوەران ، ئاشتی خوازی وا ئەبێ دروشمی شەکاوە ئەبێ بە ئاشکرا و نهێنی لە زەوی و ئاسماندا بەمەرجێ سوودی ئاینی لەبیر نەچێ ، بەرزی ئاین لەلای ئەو لە هەموو شتێ گرنگتر بێ .

﴿ اِنَّهُ لَکُم عَدوٌ مُبینْ ﴾ بە راستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ بڵاوکردنەوەی دوژمنایەتی و تێك شکانتان ، هەر لە کۆنەوە دوژمنی ئادەم و ئادەمیزادە لەبیرتان نەچێ .

﴿ فَاِنْ زَلَلْتُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە هەڵخلیسکان و لە ڕێگەی ڕاست وفەرمانی ئاین دەرچوون .

﴿ منْ بَعْدِ ما جاءَتْکُمُ البَیناتْ ﴾ لە دوای ئەوەی هاتووە بۆلای ئێوە چەندین بەڵگەی ڕوون دوای ئەوە ئێوە تێگەیشتن و زانیتان خوا فەرمانی پێداون بچنە ناو ئاشتی

وپەرستنی خوا و قەدەغەی کرد پەیڕەوی کردنی شەیتان ، چاك وخراپ و پاك و پیستان بۆ روون بۆیەوە ، خوا هەڕەشەی کرد و ترساندی ئەو کەسەی سەری شۆڕ نەبێ بۆ فەرمانەکانی خوا ، وە واز لە قەدەغە کراوەکگان نەهێنێ فەرموی :

﴿ فاعْلَموا انّ اللّهَ عَزيزٌ حَكيمْ ﴾ دوایی ئێوە بزانن خوای گەورە زۆر گەورە و بەدەستەڵاتە ، هیچ شێ ڕێگەی پێ ناگرێ ، هەموو شتی لە جێگەی شیاوی خۆیدا دائەنێ، پاداشتی خوا پەرستان ئەداتەوە و تۆڵە لە گوناهباران ئەسێنێ ، ئەو ڕستەیە ئەوپەڕی هەڕەشەیە چونکە هەموو بەشەکانی هەڕەشەی تێدا کۆبۆتەوە ، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بەبێ جیاوازی وەك ئەو ئایەتەی پێشوو وایە ، خوای گەورە دوای ئەو هەڕەشەیە هەڕەشەیە تریان لێ ئەکا و ئەفەرموێ :

﴿ هَل يَنْظُرونَ ﴾ ئایا چاوەڕوان ناکەن وناترسن ئەو کەسانە ئایەتەکانی خوا بە درۆ ئەخەنەوە ، ناچنە ناو ئاییینی ئیسلامەوە کە تووشی نەگبەتی و سزا بن .

﴿ اِلاّ انْ ياْتيَهُمُ اللّهُ ﴾ مەگەر کە بێت بۆلایان سزای خوا بە کوتوپڕی ، لە شتێکەوە کە ئەو کەسانە چاوەڕوانی ناکەن ئەو سزایە بێت.

﴿ فی ظُللِ منَ الغَمامِ ﴾ لە ناو چەندین پارچە و سێبەرێ لە هەوری سپی ، یانی خوا ئەنێرێ سزا بۆیان لە شێوەی میهرەبانی‌دا ، چونکە شایانی هەوری سپی ئەوەیە کە تەنکە بارانی وای لێ بێتە خوارەوە کە سود بەخش بێ بۆیان ، کەچی سزا و تۆڵە لەو هەورەوە بێتە خوارێ ، ئەویشس گەورەترین خەشمە لەلایەن خواوە کە سزای بێباوەڕان بە جۆرێ ئەدا چاوەڕوانی ناکەن ، هەروەك بۆ خزمانی شوعەیب هات .

﴿ وَ المَلائِكَةُ ﴾ وە فریشتەکانیش بێن بۆ لایان ئەوانەی ئەوتۆ سزادانی ئەوانیان پێسپێردراوە ، جێ بەجێ‌ی ئەکەن بە جۆرێ خوا فەرمانیان پێ‌بدات .

﴿ وَ قضیَ الامرُ ﴾ وە کۆتایی پێ هاتووە لەناو بردنیان وکاریان تەواو بووە لەلایەن خواوە ، بێباوەڕی ئەوان دەر کەوتووە و سزایان بۆ دیاری کراوە ، هیچ بۆ ستەمکاران نەماوەتەوە جگە لە پرسیار و تۆڵە .

﴿ و الى اللّهِ تُرْجَعُ الأمورْ ﴾ وە بۆلای خـوا ئەگەڕێتـەوە هـەموو کارەکـان ، دوایـی توشییان ئەبی تۆڵە لەو جێگەوە چاوەڕوانی چاکە بوون لێوە بێ بۆلایـان ، هـەروەك ئـەو سزایەی توشی ستەمکاران و سەرلێ شێواوان و گێلە پیاوان ئەبێ چاوەڕوانی ناکەن ، هیچ کەسی نازانێ دوا ڕۆژ چۆن ئەبێ و چ شتێکی بۆ دانراوە لە چاکـە و خراپـە بـا ئەوپـەڕی زانیاری و باوەڕی هەبێ ، زۆر جاران مرۆڤ توشی خراپـە ئـەبێ لەلایەکـەوە چـاوەڕوانی چاکەی لێ ئەکا ، چ شتی بێ لەو بە ئازار تر لەو توش بوونە ، هەروەها چ شتێ بـێ لـەوە خۆشتر مرۆڤ توشی چاکەیە ببێ لەلایەکەوە چاوەڕوانی نەکا .

مرۆڤ با ئەوپەری گەورە بی و پلەی بەرز و سامانی زۆری هـەبێ پێویسـتە لـە خـۆی بایی نەبێ ئەگەر خاوەنی هۆش بێ ، چونکە هاتوچۆی جیهان زۆر شتی تیا شـاراوەتەوە و ئادەمیزاد پێی نازانێ ، نابێ دڵنیا بی لە خۆی چونکە خولەك لە گۆڕانایـە نـازانرێ چ کەسێ سەرئەکەوی و چ کەسێ ژێر ئەکەوێ ، مانەوە لەسەر پلە و کـاری نـەگونجاوە بـۆ مرۆڤ هەتا هەتایە ، زۆر کەس چاڵ و بەندیخانە و کۆت و زنجیر و دار و فەلاقە سـاز ئـەکا بۆ دانیشتوان و بی تاوانان و خۆی توشی ئەبێ بەر لەوان .

لـە دوای ڕوون کردنـەوەی خـوای گـەورە یاسـای ئیسـلام بۆمـانی ڕوون کـردەوە ئادەمیزاد (٣) تاقمن : بـاوەڕداران ، بێبـاوەڕان ، دوو ڕووەکـان ، لـەپاش مـوژدەدان و ڕوونیشی کردەوە واز هێنانیان لە ئیسلام لەبەر بێ بەڵگەیە نی‌یە ، بەڵکو لەبەر ڕەوشـتی چەپەڵ و کاری خراپیانە ، خوا ئەفەرموێ ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەو کارە خراپانە کە لەگـەڵ تۆ ئەکری بەر لەتۆیش جولەکەکان لەگەڵ پێغەمبەرانی تردا (عليه السلام) کردوویانە، بۆیـە خـوا وێنە بە کورانی بەنو ئیسرائیل لێ ئەدا و ئەفەرموێ :

سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ

كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ



﴿ سَلْ بَنِي اِسرائيلْ ﴾ موحەمەد(ﷺ) تۆ پرسیار بكە لە بەنو ئیسرائیل ، لێرە هەرچەندە ڕوو كراوەتە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو پرسیار كردنە ، بەلاّم هەموو كەسی ئەگرێتەوە كەشیاوی ئەو كارە بێ .

﴿ كَمْ آتَيناهُمْ منْ ايةٍ بَيّنةٍ ﴾ ئێمە بەخشیومانە بەوان بەلگەی زۆر گەورە و ئاشكرا بە خۆیان بە باوباپیرانیان لەسەر پێغەمبەرایەتی موسا (عليه السلام) كەچی تەوراتیان دەست كاری كرد و درۆ و دەلەسەی خۆیانیان لە جێگەی دانا ئەوان وەك ئامۆژگاری كەرانی ئەمڕۆ بوون بۆ پول و پارە و كۆشك و پلە و پایەبوون بە بەلاّ بەسەر موسسولمانانەوە و دانیشتوانەوە ، بە تایبەتی ئەو كەسسانەی بە پڕو پاگەندەی خۆیان سەر بە گەیلانی و نەقشبەندی و دۆستانی تری خوان ، فڕیان بەوانەوە نییە ، هەنێ تریش هەن بەناوی خۆشەویستی عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە دەستیان داوەتە توانج گرتنە هاوەلاّنی پێغەمبەر(ﷺ) ، مەبەست لە ناوەڕۆكی ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوە نییە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیار بكا و بەس ، مەبەستییش ئەوە نی‌یە ئەو كارانە جولەكەكان كردوویانە و لەسەری بوون بیان گێڕێتەوە كە لە ئایەتەكانیی پێشوودا و لەمەو دوایش باسیان ئەكرێ بۆمان چونكە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوون ئەیزانی ، بەلكو مەبەیست لەم ئایەتە ئەمەیە موسولمان تەمێ خوارد بین بە بەسەرهاتی كوڕانی بەنو ئیسرائیلی كە ئەو هەموو بەلگە ڕوونانەیان بۆ هاتبوو لە دەستی سپی ڕووناكی مووسا(عليه السلام) و لە دار دەستەكەی كە ئەگەڕا بە ئەژدیهای

تیژ ڕەو ، هاتن خوارەوەی گەزۆ و شیلاقە بۆیان ، بچڕانی کێو و ڕاوەستانی بەسەریانەوە کەچی لەگەڵ ئەوانەدا هەموویان دەستیان دایە گوناه کردن لایاندا و سەرپێچی‌یان ئەکرد لە فەرمانی مووسا (ﷺ) ، بۆیە خوای گەورە ئابڕوی بردن بێ نرخی کردن لە هەردوو جیهاندا ، سزای گرانیان ئەدا لە پاشەڕۆژدا .

هەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەو کارە بەکەس نەکراوانە و بەو بەڵگە ڕوونانەوە هات کە بەڵگە بوون لەسەر ڕاستی‌ی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕاستی یاساکەی ، بەوانی ڕاگەیاند بچنە ناو پەرستنی خوا و ئاشتی‌یەوە کە سودی ئەوانی تێدایە بە هەموو ئادەمیزادەوە بۆ هەردوو جیهانیان ، خۆ ئەگەر پشت بکەنە فەرمانەکانی خوا و یاخی ببن لە خوا هەروەك کوڕانی بەنو ئیسرائیل توشی‌ی چەرمەسەری ئەبن ، ئەو شتەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئەمانیش دێ سووك و بێ‌ی نخ ئەبن ، بە دەیان کارەساتی سروشتی و جەنگ و چەوسانەوە و کوشتن و برین و ژێر دەستەیی ئەبن ، ئەبنە خزمەتکاری دوژمنان و بێباوەڕان ، وەك ئەفەرموێ :

﴿ وَ مَنْ يُبَدِّلْ نِعْمَةَ اللّهِ ﴾ وە هەر کەسێ چاکە و دیاری خوا و ئەو بەڵگانە لەسەر ڕاستین لە هاتنی ئاینی و گۆڕانی کاری تێدا بکا و باوەڕی پێ نەهێنێ بەو هەمو بەڵگە ڕووونانە هاتوون لەسەر ڕاستی‌یەکەی کە هەموویان ڕانومایی و شارەزایی‌ی تێدایە و ڕزگاری ئەکا لەناو چوون و گومرایی کەچی ناچنە نێوی .

﴿ مِنْ بَعْدِ ما جاءَتْهُ ﴾ لە دوای هاتنی ئەو چاکە و دیاریە ، لەسەر بێ باوەری بمێنێتەوە و خراپە و گوناه بکا ، تەورات بگۆڕێ پاش زانینی بەڵگەکان .

﴿ فَاِنَّ اللّهَ شَديدُ العِقابْ ﴾ دوایی بەڕاستی زۆر سخت و گرانە سزای خوا بۆ گوناهکاران ، سزای زۆر سەختیان ئدا لەسەر ئەو گوناهە کە کردویانە ، هەر بە هۆی ئەو شتەوە خۆی پێ‌ی خۆشە لە گۆڕانکاری ،خوا لە ناوی ئەبا ، بەهۆی ئەو نامانە کە ڕانومایی کەرن ئەبنە هۆی بێ باوەری و گومڕایی کە کار بە ناوەرۆکەکەی ناکەن .

مالومەکانی جولەکە تەوراتیان گۆڕی بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان ، بۆیە خوای گەورە ئەوەی خراپ بوو پێ کردن ، هەروەها بەناو زانایانی ئیسلام کە دەستییان دایە درۆ کردن بە ناوی ئاینەوە ، لایاندا لە ڕاستی مانای ئایەتەکان و فەرمودەکانی پێغەمبەریان ﴿ﷺ﴾ خستە پشت گوێ ، بۆیە خوای گەورە زاڵی کرد بەسەریانا دوژمنی خۆیان و ئاینیان و گاڵتەیان پێ ئەکەن ، ئەوەیە جولەکەکان دەریان کردن لە فەلەستین و پێش تریش لە ئەندەلوس ، وە کار بەدەستە تاوانبارەکان زانای ڕاستە قینەیان بەند کرد لە مزگەوتەکاندا بە هەژاری .

﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الحَيَاةُ الدُّنيا ﴾ ڕازێنراوەتەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا و سوپاسی خوا ناکەن و چاکە و دیاری خوا ئەشارنەوە ، گوزەران و ژیانی جیهانیان و ڕابواردن و مانەوەیان شیرین بووە لەبەر چاویان ، خۆشەویستی جیهان چۆتە ناو قوڵایی دڵییانەوە ، خۆیانی بۆ ئەدەن بە کوشت ، واز لە هەموو شتە بەسوودەکان ئەهێنن و ناچنە ناو ئاشتی .

با ئەمەیشمان لە بیر نەچێ ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا نەبێ ، ئەو کەسەی بڕوای بە خوا هەبێ بە ڕواڵەت ، وەك یەك وان ، وەك ئەو کەسەی جیهانی هەڵبژاردوە بۆ خۆیی و وازی لە پاشەڕۆژ هێنا بێ ئەوانە هەردوو لایان سەریان لێ تێك چووە ، بە هۆی جیهان و ئاڵفەکەی ، نرخی بۆ فرمانە بەرزەکان و ڕێزی مرۆڤ دانەناوە ، هەر کەسێ لە مانای قورئان وورد بێتەوە ، بە باشی بۆی داچێ ، بە چاکی بۆی ڕوون بێتەوە و بۆی دەرئەکەوێ ، باوەڕ بە خوا بەبێ ترسان و خۆ پاراستن لە گوناە هیچ شتێکی بۆ دانانرێ ، بۆیە ئەبینرێ زۆر جاران لە قورئاندا کە فەرمان بە باوەڕ فەرمانە بە خۆ پاراستن لە گوناە ، بۆیشی ڕوون ئەبێتەوە ئەو کەسەی ئاواتی جیهان بێ ، بەتەنها ئەو کەسە لە یاسای ئیسلام لایداوە ، بییەوێ یا نەیەوێ ، کەواتە بێ باوەڕی وجیهان پەرستی بەو جۆرە باسکراوە وەك یەك وان لەلایەن ئاینی ئیسلامەوە ، بۆیە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فورمووی :

جیهان و پاشەرۆژ هەوێی یەکن بەیەکەوە نایان کرێ ، دوژمنی یەکن و دوو ڕێگەی جیان بە وێنەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاّت لە هەر کامیان نزیك بیتەوە لەوی تریان دوور ئەکەویتەوە، بۆیە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان جیهان بەکار بهێنێ بۆ بەرزی ئیسلام و بەختیاری موسوڵمانان و دەست گیرۆیی هەژاران .

﴿ وَ يَسْخَرُونَ مِنَ الذينَ امَنوا ﴾ وە بێ باوەڕان گاڵتە ئەکەن بە کەسانێکی ئەوتۆ ، باوەڕیان هێناوە بە ئاینی ئیسلام لە هەژارانی موسوڵمانان وەك بیلال و عەممار و سوهەیب، زۆر ئاسایی و سروشتیی‌یە ئەو کەسانە گاڵتە بە فەرمانەکانی خوا بکەن ڕژاندنی خوێنی قەدەغە کراو بە ڕەوا دائەنێن ، گاڵتەیش بەو کەسانە ئەکەن کە خۆیان بپارێزن لە گوناه بۆ خوا ، لەبەر خوا باری گران هەلئەگرن ، ئاسایی و سروشتیە کە جیهان پەرستان گاڵتە بکەن بە خوا پەرستان و ئەو کەسانەی توێشوو هەڵ ئەگرن بۆ پاش مردنییان و پاشەڕۆژیان .

﴿ وَالذينَ اتَّقَوا فَوقَهُمْ يَومَ القيامَةْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان پاراستووە لە بێ باوەڕی و چوونە نێو ئاشتیی و بە فەرمودە و فەرمانی خوا هەڵ ئەستن لە هەژاران لە سەرەوەی بێباوەڕانەوەن لە ڕۆژی هەلسانەوە و پرسیار ، یانێ باوەڕداران لە دوارۆژدا زۆر بلند تر و پایە بەرز ترن لە بەهەشتا ، لەو کەسانەی ئەمڕۆ ساماندارن ، لە کاتێکا بێ باوەڕن لە دۆزەخ دا پاڵ وپشت ئەکەن ، کەواتە بێ باوەڕان با ئێستا گاڵتە بکەن بە باوەڕداران ، لە پاشە ڕۆژدا بە بێ گومان بە پێچەوانەوە ئەسوڕێ و ئەمانیش گاڵتە بەوان ئەکەن .

﴿ وَ اللّهُ يَرزُقُ مَنْ يَشاءُ بِغَيْرِ حِسابْ﴾ وە خوا ڕۆزی و خواردەمەنی ئەبەخشی بە کەسێ ئارەزووی هەبێ لە هەردوو جیهاندا بەبێ ئەندازە و بەبێ برانەوە لە هەردوو جیهاندا ، نایەنە ژمارە ، پرسیاری کار و کردەوەی پێشوویان لێ ناکرێ ، یانی ڕۆژی جیهان ئەژمێررێ ، بەلاّم ئەوەی دوا ڕۆژ ناژمێررێ و کۆتایی نایەت ، خەفەت و ترسی

کەم بوونەوە و نەمان ڕووی تێ ناکا ، ئەو چاکەیە لە پاشەڕۆژدا بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕدار و چاکەکارن .

با ئەمەیشمان لە بیر نەچێ لەوانەیە خوا کەسێ بەخێو بکا بەبێ ماندوو بوون ، وەك لەم ڕستەیەوە دەر ئەکەوێ، بەڵام بەرزی و سەرکەوتن و بەختیاری موسوڵمانان بە بی کۆشش وخۆ ماندوو کردن نەبووە و نابێ پێویستە هەوڵی بۆ بدرێ ئەو کاتە سەربەستی و بەختیاری بۆ موسوڵمانان پەیدا ئەبێ ، هەوڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هاوڕێکانی باشترین بەڵگەیە بۆ ئەو مەبەستە .

خوای گەورە لە ئایەتی پێشوودا داوای لێ کردین بچینە ناو ئاشتی و پەرستنی خوا ، هەموو کەسێکمان خۆش بوێ ، خزمەتی موسوڵمان بکین ، خۆمان پارچە پارچە نەکەین، پاش ئەو فەرمودەیە باسی نەتەوە پێشووەکانمان بۆ ئەکات ، کە لە بەهەشتی خۆشی و بەختەوەریدا ئەژییان بەبێ دووبەرەکی و دوژمنایەتی ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ
وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ
فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ
مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ
صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ 

﴿ كانَ الناسُ أُمَةً واحِدةً ﴾ ئادەمیزاد نەتەوەیەکی تەنـها بـوون پـاك وخـاوێن و بـێ گەرد بوون ، کاتی یەکەمین جار بە منالّی هاتبوونە جیهانەوە ، جگە لە ئاشـتی خـوازی و دۆستایەتی شتی تریان لە پێشووەکانیانەوە نەبیست بـوو هـەتا ببێتـە هـۆی پارچـە پارچـە بوونیان یەك ڕەوشت و یەك بیر و یەك ڕێگە بوون ، لەیەك بنەماڵە بوون هـەموویان لـە ئادەم وحەوا بوون ، یەك باوەڕ و یەك ئاین بوون ، دوایی بەرە بەرە گەشەیان کـردوو وۆر بوون ، و نەوەیان پەرەیان سەند و بڵاو بوونەوە بە شوێنەکانی زەویدا ، ژیانیـان گەشـەی کرد ، زیرەك و مام ناوەندیان وکەودەنیان تێدا پـەیدا بـوو ، بیریـان لـە شتی پـڕو پـوچ کردەوە ، ئەوەش پاڵی پێوە نان هەر کۆمەڵێ بە پێی بیری خۆی بیر و باوەڕێ بۆ خۆیـان دانێن ، ئەویش بوو بە هۆی جیاوازیان و پارچە پارچە بوونیان دوای ئەوی لەمەو بەر یـەك بیر و یاوەڕیان بوو بۆیە خوای گەورە بۆ یەك خستنەوەیان پێغەمبەرانی (عليهم السلام) بۆ نـاردن، و نامەیشی دانێ کە ڕانمونیان بکەن ، ڕێگەی بـیر و بـاوەڕی ڕاسـتی‌یان پـێ نیشـان بـدەن فەرمانی پێدان دەرگای دادپەروەری‌یان بۆ بکاتەوە ، هـەتا ئـەوابیش بـڕۆن بـۆلای ئـەو پێغەمبەرانـە (عليهم السلام) بـۆ نەهێشتنی‌گێرە شـێوێنی و پیشـەیان ، بـۆیـە خـوای گـەورە ئەفەرموی:

﴿ فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِينَ ﴾ دوایـی خـوا ڕەوانـەی کـرد چـەندین پێغەمبـەر(عليهم السلام) کاتـێ، نەتەوەکان دەستیان دابووە جیاوازی لـە نێـوان خۆیـاندا هـەر لەشـیس پێغەمـەرەوە هـەتا ئیدریـس لەویشـەوە هـەتا نـوح پێغەمبـەر(عليه السلام)، لەویشـەوە هـەتا ئیـبراهیم (عليه السلام) ، لـە ئیبراهیمیشەوە (عليه السلام) هەتا پێغەمبەرانی ئیسرائیل(عليهم السلام)، هەتا کۆتایی هـات بـە پێغەمبـەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ ، پێغەمبەری ئیسلام﴿ﷺ﴾ بە نامەییەکەوە نێراوە شایانی ئەوەیە بکـرێ بـە یاسا و دەستوور بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئادەمیزاد لە ژێر بـەیداخی ئاشتی خوازیـدا، ئەو نامەیە ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ بەرژەوەندی‌ی ئادەمیزادا ، لە هەموو کات و جێگەیـەکدا هـەتا ڕۆژی دوایـی بـۆ چارەسـەرکردنی دوو بـەرەکی و جیـاوازی و نـاکۆکـی

ئادەمیزاد ، بۆیە ئیتر دوای هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئادەمیزاد پێویستی بە ناردنی پێغەمبەرێ تر نی‌یە بە درێژیی ڕۆژ هەتا ئەو نامەیە هەبێ .

﴿ مُبَشِرينَ وَ مُنذِرينَ ﴾ ئەو پێغەمبەرانە (عليهم السلام) مژدەیان ئەدا بە خوا پەرستان بۆ وەرگرتنی‌ی پاداشت ، تاوانبارانیان ئەترسسان لە سسزای خوا و تۆڵە سەندنەوە لێیان .

﴿ وَ انْزَلَ مَعَهُمُ الكِتابُ بِالْحَقِ ﴾ وە نارد بویە خوارەوە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانە (عليهم السلام) نامەیەکە لەگەڵیدا بو ڕاستی و هەموویاسای ژیانی ڕۆژانەی تێدا بوو بۆ ئادەمیزاد .

﴿ لِيَحْكُمَ بَيْنَ الناسِ ﴾ هەتا هەر یەکە لەو نامانە فەرمان بدەن لە نێو ئادەمیزاد ، یا هەتا خوا و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان بدەن لە نێو ئادەمیزاددا .

﴿ فيما اخْتَلَفوا فيهِ ﴾ لەو شتەدا ئادەمیزاد جیاوازن لەوەدا ، گومانیان پەیدا کردووە لەو ڕاستی‌یەدا بەو نامانە هێناویانە ، بەو ڕستانە خوا بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە کار بەدەستان پێویستە لەسسەریان کە هەموو یاسا و بڕیاریان بە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بێ بۆ چارەسەر کردنی هەموو گیر و گرفتیان چ لە نێوان خۆیانا بێ و چ لەگەڵ بێ باوەڕاندا بێ ، نەك بە یاسای دەست کردی خۆیان هەتا ناچار بن هەموو جارێ یاساکە بگۆڕن بە دژی یاسای تری پێشوو ، ئەوەیش بە زۆری ئەبێتە هۆی ناکۆکی و دووبەرەکی و ئاژاوە لە نێوان دانیشتواندا کاتێ بڕیار بە یاسای قورئان نەبێ ، ئاواتیان بە پێچەوانە ئەگەڕێ ، ئەو نامەیە ئەبێتە هۆی گومڕای‌یان چونکە بڕیار بەو نادەن ، ئەو چاکەیە ئەوان بەتەمای بن ئەبێ بە خراپە بۆیان .

﴿ وَ ما اخْتَلَفَ فيهِ اِلاّ الذينَ اُتوهُ ﴾ وە ناکۆکیان نەبۆوە لەو ڕاستیە کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەران (عليهم السلام) مەگەر کەسسانێکی ئەوتۆ ئەو نامانە دراوە بەوان ، هەندێکیان باوەڕ ئەهێنن و هەندێکیان باوەڕ نایەرن و بە درۆی ئەخەنەوە .

﴿ من بَعْدِ ما جاءَتْهُمُ البَيناتُ ﴾ لە دوای ئەوە هات بۆلایان چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا دوای هاتنی ئەو کارە بە کەس نەکراوانە ، ئەوان بیانویان نەبوو لە واز هێنانیان لەوە هاتووە .

﴿ بَغْياً بَينَهُمْ ﴾ جگە لەبەر دڵ پیسی و ستەمکاریان و خۆشی جیهان لایان ، لەبەر ترسی لەناو چوونی پلە و پایە و سەرۆکایەتیتان و پەرە پێدانی دەست درێژیان .

﴿ فَهَدى اللّهُ الذينَ آمَنوا ﴾ دوایی خوا ڕانموویی کەسانێکی ئەوتۆ ئەکات کە باوەڕیان هێنابوو ، یاریدەیان ئەدا لەسەر بیر و باوەڕە ڕاستەکانیان بەو ڕاستیانە هاتوون بۆ پێغەمبەران (عليهم السلام) .

﴿ لما اخْتَلَفوا فيهِ منَ الحَقِ ﴾ ڕانموویان ئەکا بۆ شتێ جیاوازی و ناکۆکیان هەبووە لەوەدا کە ڕاستی و جۆری بە جی هێنانی پەرستن لە نوێژ و شتیی تردا .

﴿ بِإذْنِهِ ﴾ بە هۆی دەستوور و بڕیاری خواوە بە هۆی فەرماندانی خوا و دیاری کردنی ڕاستی .

﴿ وَ اللّهُ يَهْدى مَنْ يَشاءُ الى صِراطٍ مُسْتَقيمْ﴾ وە خوا ڕانموویی کەسی ئەکا ئارەزووی هەبی بۆلای ڕێگەی ڕاست کە ڕێگەی پێغەمبەران (عليهم السلام) و دۆستانی خوایە .

ئەبێ لەبیرمان بێ ناکۆکی نێوان ئادەمیزاد دەستی پێ کردووە لەو کاتەوە کە قابیل هابیلی برای خۆی کوشت ، ئیتر پەرەی سەند و نەبڕاوە هاتا ئێستا ، ئەو ناکۆکیە وە نەبێ پەیوەندی بە خاوەن ئاینەکانەوە هەبێ بە تەنها ، وەك هەنێ لە سەرسەری و هەڵ خلیسکاوان ئەیلێن ، بەڵکو ناکۆکی بێباوەڕان ئەوپەڕی گرتووە لە نێوانیا ، لە جنێودان تێپەڕیوە بۆ جەنگی ناهەموار ، ناکۆکی ناو سەرمایەداران سەری کێشا بۆلای جەنگی ئەتۆم و فڕێدانی بۆمبا بە سەر ژنان ومناڵانی بێ تاوان لەسەرمایەدارێکەوە بۆ سەرمایەدارێ تر چاکترین بەڵگەیە بۆمان چونکە هیچ لایەکیان موسوڵمان نین ، ناکۆکیی ڕوسیا و ئەمریکا ، ئەمریکا و سەرمایەدارانیی تر ، ناکۆکیی ڕوسیا و چین و سۆشیالیستەکانیی تر ، چین و ڤێتنام ، ناکۆکی نێوان دانیشتوانی ئەفەریقا لە نێوان خۆیانا ، بەتایبەتی جنوبی ئەفەریقا لە نێوان ڕەش و سپیدا ، ناکۆکی عەرەبەکان لە نێوان خۆیانا و لەگەڵ دراوسێ موسوڵمانەکانیانا ، هیچیان لەسەر ئاین نییە ، هەر چۆنی بێ

ناکۆکی هۆی زۆرە ، وا ئـەبیٖ جیاوازی و ڕۆشنبیری‌یە ، وا ئـەبیٖ جیاوازی کـەمی و زۆری زیرەکی‌یە ، وایش ئەبیٖ بە گوێرەی سروشت مرۆڤی وا هەیە لای چاکە نـاکۆکی و بیٖ‌ی خۆشە ئەوانە هەمویان چارەسەر ئەکرێن بە ئامۆژگـاری و لـەیـەك گەیشـتن ، بـەلاّم ناکۆکی ڕەگەز پەرستی و زەوی داگیر کردن بە نارەوا و بۆ سوودی تایبـەتی چارەسـەر ناکرێن ، مەگەر بە هێز وتوانای بازوو دەم کووت بکرێن ، جەنگ وناکۆکی ئـەمرۆمان لەبەر ڕەگەز پەرستی و داگیر کردن و سوودی تایبەتی‌یە لـەو هـەموو ڕووبـەرەی زەویـدا، بێگومـان ئاشتی خـوازی لـە ئـادەمیزادەوە بەیـەك جـاری دوورە، هـەتا ئـادەمیزاد لـە دوژمنایەتیەی ئەمرۆ بیٖ‌ی ئاودراون واز نەیەرن وە ئەو ستەم کاری‌یە بلاّو بۆتەوە بنە بـڕی نەکەن ، وە ئەو تیرە ژەهراوی‌یە زۆرداران ئاراستەی هەژارانیان کردووە نەشکێنرێ ئـەو کاتە ئاشتی پەیدا ئەبیٖ لەبەر ئەو ناکۆکی‌یە کـە بـە ئامۆژگـاری چارەسـەر نـاکرێ ، خـوا ئەفەرموێ :

أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾

﴿ اَمْ حَسِبْتُمْ اَنْ تَدْخُلوا الجَنّةَ ﴾ ئایا ئێوە گومانتان بردووە وازتان هێناوە لـە سـامان و داراییتان ، وە توشی ئازار بوون و ناخۆشی دەربەریتان چەشتووە کە ئێوە بچنە بەهەشـتەوە و لەبەر ئەوەی باوەڕتان هێناوە و بەس .

﴿ وَ لَما يأتِكُمْ مَثَلُ الذينَ خَلَوا منْ قَبلِكُمْ ﴾ وە نەیەت بۆلای‌ی ئێوە وێنەی شتێ توشی کەسانێکی ئەوتۆ بووە ڕۆیشتوون لە پێش ئێوەوە بەبێ تاقی کردنەوە ، ئەو کەسانەش پێغەمبەران (عليهم السلام) و دۆستانی‌ی خوان کە توشی چەرمەسەری زۆر بوون .

﴿ مَسَتْهُمُ البَأساءُ وَالضّراءُ ﴾ گەیشتووە بەو کەسانە رابووردوون لە پێش ئێوە سەختی و ناحۆشی و هەژاری ، بیماری‌ی نەخۆشی و برسێتی‌ی و کوشتن .

﴿ وَزُلْزِلوا ﴾ وە ئەو کەسانە لە ترسانا جولانیان تووش بووە و ئەلەرزان بەبۆنەی چەندین ئازار و دلّیان لە تەپە تەپ نەئەکەوت لەبەر گرانی ترس و ئازاریان .

﴿ حَتی يَقولَ الرَسولُ و الذينَ آمَنوا مَعَهُ ﴾ هەتا وایان لێ هات ئەو فروستادەی ئەو کەسانەی باوەریان هێنابوو لەگەلّیان لەتاو ئازاری خۆیان بە ناچاری و بە نائومییدی‌یەوە ووتیان :

﴿ مَتى نَصْرُ اللّه ﴾ چ کاتی دێت یاریدەی خوا بۆمان و زالّمان ئەکات بەسەر دوژمناندا ، لەو کاتەدا داوای یارمەتی‌یان ئەکرد بەپەلە لەخوا نەك لە رێگەی گومانەوە بۆ یاریدەی خوا .

﴿ ألا إنَّ نَصْر اللّهِ قَريب ﴾ بزانن وئاگادار بن بە راستی یاریدەی خوا بۆ باوەرداران زۆر نزیکە ، بێگومان ئەو ئایەتە پیرۆزە هۆشیار ئەکاتەوە هەموو ئەو کەسانەی بڕوایان بە ڕاستی هەیە و ئەیکەن بە یاسا و بۆی ئە پاڕێنەوە لە خوا و بە ئاشکرا بەوان ئەلّی : یاسای خوا کاتی بە چەسپاو دائەنرێ لە نێو ئەو کەسانەدا کە داوا لە خوا ئەکەن نرخی بۆ راستی دابنێن ، یانێ خۆیان وخێزان و سامانی خۆیان بۆ دابنێن و لەو رێگەدا ئازار و ناخۆشی بچێژن و لەسەر ترس و تالّی ئارام بگرن .

بە ڕاستی ئەو کەسانەی لە پێش موسولّمانانەوە بوون لە ڕێگەی ڕاستی‌دا تووشی ئازار و ئەشکەنجەی زۆر بوون ، ئارامیان گرتووە لەسەریان ، بۆ ئەبی‌ی ئێوەی موسولّمان وەك ئەوان نەبن ؟ ئایا ئێوە ئەتانەوی‌ی بچنە بەهەشتەوە بەبێ ئەوەی‌ی نرخەکەی بدەن ، ئەوە

نابی هەتا نرخەکەی نەدەن ، وەك ئەو کەسانە باوەڕ ئــەهێنن و مـل کـەچن و ئـارام گـرن لەسەر ترس و نەمانی سامان و دانانی گیانیان .

يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾

﴿ يَسئلونَكَ ماذا يُنفِقونْ ﴾ پرسیار ئەکەن لە تۆ چ شتێ ببەخشن و بـە چ کەسـێکی بدەن ، ئەو کەسانە کە ئەو پرسیارانیان کـردووە مرۆڤێکـی ناسـراو بـی یـان هـاوەڵێکی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ .

﴿ قُلْ ما اَنفَقْتُمْ منْ خَيرٍ فَلِلْوالِدَيْنِ ﴾ موحەممەد ﴿ﷺ﴾ تۆ لە وەلامدا بلّی : شـتی ئێـوە ئەی بەخشن لە دارایی و دەست گیرۆیی ، دوایی ئێوە بیدەن بە بـاوك و دایـك و باپـیر و نەنکەکانتان .

﴿ وَالأقْرَبينَ وَ اليَتامى وَالَمساكينِ وَ اِبْنِ السَّبيلِ ﴾ وە بیدەن بە خزمەکانتان لــە کـوڕ و کچ و برا و خوشك و مام و خوشکی باوك و دایك و ، بە هەتیوەکان لــە منالــەکانیان و هەژارەکانیان و بیدەن بە هەژاران و بە ڕێبواران و میوانـەکان کـە لـە دارایـی و خـێزانی خۆیان بچڕاون ، و هیچ شتی نیيە بۆ پێویستی خۆی هەتا ئەگاتەوە نیشتیمانی خۆی .

ئەو پرسیارە لەو ئایەتەدا هەر چەندە بە ڕواڵەت پرسیارە لە جۆری بەخشراو بـەلاّم لــە ناوەڕۆکدا پرسیارە بۆ ئەو کەسانە داراییيان ئەدرێتێ ، چونکە بەخشراو ڕوون و ئاشکرایە بەلاّم نازانن بە چ کەسێکی بدەن .

ئەو شتەی لەو ئایەتەدا فەرمانی پێدراوە بدرێ بە باوك و دایك و کوڕ و کــچ و باپـیرو دایکی کە پێویستە بەوانە بدرێ کە هــەژاربن ، نـابی زەکاتیـان بدرێتـێ بـەڵکو بـەخێو

کردنیان پێویستەو فەرزە لەسەر کوڕ و نەوەکانیان ، بەڵام هەتیوانی‌ی هەژار و هەژارانی ترلە زەکات و جگەی زەکات ئەیان درێتێ .

﴿ وَ ما تَفْعَلوا مِنْ خَيرٍ فَإنّ اللّٰهَ بِهِ عَليمٌ ﴾ وە هەر شتێ ئێوە ئەیکەن لە چاکە لەگەڵ ئەوانەی باسکران ، بەڕاستی خوا بەو شتە ئەزانێ و پاداشتی ئەداتەوە .

پاش ئەوەی خوای گەورە باسی بەخشینی دارایی خۆمانی بۆ کردین باسی‌ی گرنگتر لەوەشمان بۆ ئەکا ، وەك دانانی گیانی‌ی خۆمان بۆ بەرزی ئاین ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی جەنگ کردنی پێ نەدرا بوو لەماوەی بونیدا لە مەککە ، دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە فەرمانی پێدرا ، ئەگەر بت پەرستان جەنگیان لەگەڵ کرد وەڵامیان بداتەوە بە جەنگ ، دواتر فەرمانی پێدرا بۆ جەنگ لەگەڵ بت پەرستان بۆ نەهێشتنی بێباوەڕی ، پاش ئەوانە بۆ پەرە پێدانی ئاینی ئیسلام جەنگ پێویست کرا هەتا هەتایە ، وەك ئەفەرموی :

كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ

مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ
أَعْمَٰلُهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ
هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ
هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ
ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾

﴿ كُتِبَ عَلَيكُمُ القِتالُ ﴾ پێویست كراوە لەسەر ئێوەی موسوڵمانان جەنگ كردن لەگەڵ دوژمنان و بێباوەران بۆ پەرە پێدانی ڕاستی و نەهێشتنی ستەم ، نەك لەبەر ئەوەی موسوڵمانان جەنگك فرۆش بن وەك دوژمنان بڵاوی ئەكەنەوە ، نەك بۆ داگیر كردنی زەوی گەلان بە زۆری و بیانەوێ لەسەر مافی گەلانی تر ڕابوێرن ، بەس بۆ دابین كردنی ڕاستی و بەرگری لە خۆیان ، بێگومان ڕاستی هەرچەندە بە گوێرەی بیر وباوەڕە ، بەڵام ڕاوەستانی و مانەوەیی و سەپاندنی بەسەر ئادەمیزاددا ئەو پەڕی پێویستی هەیە بە خۆ ماندوكردنی فراوان وكۆششی نەبڕاوە یەكەم جار بە ئامۆژگاری و فەرمان بە چاكە و ژیری و نەرمی ، دوهەم جار پێویستە بسەپێ بە هێز وبازو ، هەر بیر و باوەڕێ پشت بە هێزی سەپێنەر نەبەستێ بوون و نەبوونی ئەو بیر و باوەڕە یەكسانە بۆیە خوای گەورە پێویستی كرد لەسەر موسوڵمانان بەو ئایەتە و ئایەتیتر وەڵامدانەوەی دەست درێژی بێ باوەڕان بە جەنگ ، لە كاتێكا ئامۆژگاری و فەرمان بە چاكە جێگەی خۆی نەگرت ، زۆر ڕوونە ئەگەر دەسەڵاتێكی سەپێنەر نەبێ یاسا جگە لەوەی باسی بكرێ و بنوسرێ لەسەر كاغەز بە هیچ شتێ دانانرێ .

﴿ وَ هوَ كُرْهٌ لَكُمْ ﴾ وە ئەو جەنگە ناخۆشە گرانە بۆ ئێوە بە گرێرەی سروشت ، ئەو پێ ناخۆش بوونە بۆ فەرمانی خوا نییە ، بەڵكو بە گوێرەی سروشتی ئادەمیزاد و لە ناو چوونی خۆیان و سامانیان لا گران و ناخۆشە .

﴿ وَ عَسى اَنْ تَكْرَهوا شَيْئاً وَهوَ خَيرٌ لَكُمْ ﴾ وە وا ئەبێ ئێوە پێتان ناخۆش بێ شتیو ئەو شتە چاكترە بۆ ئێوە ، بە پێی سروشت ئێوە نەفرەتی لێ ئەكەن و لاتان گرانە ، چاكترە چونكە ئێوە ئەمرۆ سەرئەكەون بەسەر دوژمنانی خۆتانا ، ئاینەكەتان پەرە ئەسەنێ بەو جەنگە ، لە دوا رۆژدا پلەی شەهیدی وەرئەگرن ، بەبەردەوامی بە خۆشی ڕائەبوێرن لە بەهەشتا .

﴿ وَ عَسى اَنْ تُحِبوا شَيْئاً وَ هوَ شَرٌ لَكُمْ ﴾ وە وا ئەبێ ئێوە پێتان خۆشە شتێ لە بەر تەمەڵیتان بە گوێرەی سروشت كە جەنگ بۆ بەرزییە كەچی لاتان گرانە و، ئەو شتە خراپە ئەمرۆ بۆتان ،چونكە لاوازی ئێوەی تێدایە ، دوژمنانتان سەركەوتوو سەربەرز ئەبن ، لە پاشەرۆژدا پاداشتان كەم ئەبی و دوور ئەبن لە پلەی شەهیدی .

﴿ واللّه يَعْلَمُ وَاَنْتُمْ لا تَعْلَمونْ ﴾ وە بەڕاستی خوا ئەزانێ بە سوودی ئێوە ، ئێوە نایزانن ، ئەگەر ئادەمیزاد دەست لە خۆیان بەر نەدەن و جڵەوی ڕابواردنی جیهان بەرەڵاكەن توشی خراپە ئەبن .

ئەو زانایانە مانای قورئانیان كردووە ئەڵێن : هاورێكانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نەفرەتیان لە جەنگ ئەكرد ، چونكە ئادەمیزاد بە گوێرەی سروشت لایان ناخۆشە گیانی خۆیان دانێن، بەلام وەلامی فەرمانی خوایان دایەوە ، هەروەك نەخۆش دەرمان بخوا بۆ چاك بوونەوە لەو نەخۆشییە ، بۆیە حوای گەورە بەو ئایەتە ئاگاداریان ئەكا بەرهەمی پیرۆزی جەنگ و كۆشش هەر بۆ خۆیان ئەگەرێتەوە ، لە لایەكە ترەوە ئەگەر تەماشای مێژووی پاڵەوانانی هاورێكانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بكرێ ، كە بۆ جەنگ و خۆ دانان لە ڕێگەی ئایندا چۆن گاڵتەیان بە ژیان ئەهات و گیانی خۆیان بەخت ئەكرد ، بۆ ئەوەی لەو ڕێگەدا لەناو

بچن، بگرە ئەگەر یەکێکیان بە ساغی دەرچووبا خۆی لە پێش چاو ئەکەوت ، کەواتە بۆمان دەرئەکەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لە جەنگ نەترساون ، بە پێچەوانەی فەرمودەی ئەو زانایانە کە ئەڵێن : هاوڕێکانی پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتیان لە جەنگ کردووە .

پوختەی مانای ئەو ئایەتە بە کورتی ئەمەیە : هاوڕێکانی پێغەمبەر(ﷺ) تەماشایان ئەکرد ڕێژەی خۆیان و چەکی جەنگیان زۆر کەمترە لە بت پەرستان بۆیە ئەترسان ئەگەر هێز بخەنەکار لەوانەیە بنەبڕ ببن ، یاریدەری ئیسلام نەمێنێ ، جاری باوەڕ بە خوا خامۆش ببێ ، کەواتە ئەو ترسەیان بۆ ئیسلام بوو نەك بۆ خۆیان دوایی خوا بۆی ڕوون کردنەوە ئەو جەنگەی داوا ئەکری لەوان و لایان گرانە چاکەی خۆیان و ئیسلامی تێدایە ، بێگومان دانیشتن و تەمەڵیان سەر ئەکێشێ بۆ نەمانی خۆیان و ئیسلام ، ئێوە ئەو ڕاستیانە نازانن و خوا ئەیزانێ ، خوا هیچ شتێکی لێ وون نابێ .

ئەگێرنەوە پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڵای کوڕی جەحشی پورزای خۆی نارد لەگەڵ چەند کەسێ تردا لە هاوڕێکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ڕێگە گرتن لە بت پەرستان لە ساڵی دووەمی کۆچیدا ، بەر لە جەنگی بەدز بە دوو مانگ ، لە کۆتایی مانگی جیمادی دووەمدا ، توشی عەمری کوری عەبدوڵای حەزرەمی بوون لەگەڵ (٣) کەسی تردا لە بت پەرستان کەوتنە جەنگ و عەمریان کوشت و دوو کەسیان لێ گرتن ، کاروانەکەیان گیرا و بردیان ، وایان زانی کۆتایی مانگی جیمادی دوهەمە ، نەك مانگی ڕەجەب کە ئەو ڕووداوە بڵاو بویەوە ، و لای هەموان گرنگ بووو چۆن ئەبێ لە مانگی ڕەجەبدا بکرێ ، بۆیە پرسیاری ئەو جەنگە کرا ، لە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیارکەران بێباوەڕان بن یا موسوڵمانان مەبەستەکە هەر یەکە ، خوا ئەفەرموێ :

﴿ يَسْألونَكَ عَنِ الشَهْرِ الحرامِ ﴾ پرسیار ئەکەن لە تۆ لە مانگی ڕێزداردا ، ئەو مانگەی جەنگ تێیدا قەدەغەیە ، ئەو مانگانە بریتین لە مانگی موحەڕەم وڕەجەب و ذی القعدة و ذی الحجة .

﴿ قِتالٍ فيهِ ﴾ جەنگ کردن لەو مانگە ڕێزدارەدا ، ئایا جەنگ لەودا قەدەغەیە یان نا زانایان هەندێکیان ئەڵێن : ئەو ئایەتە کار پی کردنەکەی گۆڕاوە ، بە ئایەتی ﴿ وَ قاتِلُ المُشْرِكينَ كافَّة ﴾ یانێ ئێوەی باوەڕدار جەنگ بکەن لەگەڵ بت پەرستان ئیتر لە مانگە ڕێزدارەکاندابێ یا لە جگەی ئەواندا ، هەندێ تریان ئەڵێن : فەرماندانی ئەو ئایەتە پایەدارە و قەدەغەیە جەنگ لەواندا .

﴿ قُلْ قِتالٌ فيهِ كَبيرٌ ﴾ موحەمەد ﴿ﷺ﴾ تۆ بڵێ : جەنگ کردن لە مانگە ڕێزدارەکاندا قەدەغەیە گوناهێکی گەورەیە لەو کاتەوە جەنگ قەدەغە بووە هەتا ئەو کاتە قەدەغە هەڵگیرا بە ئایەتی ی ﴿ وَ قاتِلُ المُشْرِكينَ كافَّة ﴾ .

﴿ وَ صَدٌ عَنْ سَبيلِ اللّهِ وَ كُفرٌ بِهِ ﴾ وە گەرانەوەی ئادەمیزاد لە ڕێگە و ئاینی خوا و نەیەڵن دانیشتوان موسوڵمان بن ، بێباوەڕی بەخوا .

﴿ وَ المَسْجِدِ الحَرام ﴾ وە ڕێگە گرتن لە ئادەمیزاد و چوونیان بۆلای ئەو مزگەوتە ڕێزدارەی خانەی خوا و قەدەغە کردنیان لە نوێژ کردن لەوێدا و لە حەج و عەمرە کردن.

﴿ وَ اخراج اَهْلِهِ منه ﴾ وە دەرکردنی ی خاوەنی ئەو مزگەوتە لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و باوەڕداران ، بگرە دەرکردنیان لە شاری ی مەکە .

﴿ اَكْبَرَ عِنْدَ اللّهِ ﴾ گوناهێکی زۆر گەورەترە لای خوا لە جەنگ کردن لە مانگی ڕەجەبدا کە یەکێکە لەو مانگە ڕێزدارانە ، و قەدەغەیە جەنگ لەواندا ، سزاکەیشی توندە ترە .

﴿ وَ الفتْنَةُ اَكْبَرُ مِنَ القَتْلْ ﴾ وە ئەو بت پەرستی ی یەی ئێوەی لەسەرن و سزادانی موسوڵمانان و دەرکردنیان گوناهەکەی گەورەترە لە جەنگ کردن لە ڕەجەبدا و لە کوشتنی عەمری حەزرەمی لە بت پەرستان و بێباوەران پێشەکی دەستیان کرد بە جەنگ و بە دەیان کاری نالەباریان ئەکرد ، بەرامبەر بە موسوڵمانان ئەوانە لای ئەوان خراپ

نی‌یە کەچی ئەگەر موسوڵمانان بۆ بەرگری کردن لە خۆیان و تۆڵـە سـەندنەوە جـەنگیان بکردایە بەتایبەتی ئەگـەر لـە مانگـە ڕێزدارەکـاندا بواییـە جیـهانیان بـە ڕووخـاو دائـەناو بێباوەڕان بۆ ماوەیە دەستیان ئەکرد ببە پڕ و پاگەندە لە دژی موسوڵمانان .

شاگردەکانی ئەو بێباوەرانەی پێشوو هێشتا ماون ، ئەمانیش بە هەزاران گێرە شـێوێنی و توانـج بـۆ موسـوڵمانان بـەکاردێنن و بەلایانـەوەە باشـە ، بـەڵام ئەگـەر موسـوڵمانان بچوکترین وەڵامیان بدەنەوە بە هەزاران پرتە و بۆڵە ئەکەن ، بۆیە خوای گـەورە ڕوونـی کردەوە و فەرموی : ئەو تاوانانە بێباوەران دەربارەی موسوڵمانان ئەیکـەن زۆر گەورەیـە و تاوانیی زۆرترە ، ئەو وەڵامەی موسوڵمانان ئەیدەنەوە هەر گوناه نی‌یە ، هـەر لەبـەر ئەویشە خوا جەنگی بە ڕەوا داناوە لـەگەڵ بێباوەڕاندا لەهەر جێگەیەکدا و لـە چ کاتێکـا بۆ تۆڵە سسەندنەوەی یەکسانی و بلاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام .

﴿ وَلا يَزالونَ يُقاتِلونَكُمْ ﴾ وە بێ باوەڕان وازنایەرن و هەمیشە بە دەسـت و بـە چـەك جەنگتان لـەگەڵ ئەکەن و دوبەرەکی و پڕو پاگەندەتان بۆ بڵاو ئەکەنەوە ، شـەو و ڕۆژ بـۆ لەناو بردنتان ناوەستن ، چونکە دوژمنایەتی ئەوان بنجی داکوتاوە لـە دڵیاندا و ڕیشە کێش نابێ هەتا هەتایە .

﴿ حَتى يَرُدوكُم عَنْ دينكُمْ إنِ اسْتَطاعوا ﴾ هەتا وەرتان گێرن لـە ئاینی خۆتان ئەگـەر ئەوان بتوانن و هێزیان ببێ .

ئاواتی بت پەرستان و بێباوەڕان ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام تۆوی ببڕێ و ناوی نەمێنێ لـە هەموو ئاوەدانی زەویدا ، هەر لـەبەر ئەوەیشە تەنها جـەنگ لـەگـەڵ موسـوڵمانان ئەکـەن ، بەردەوامن لـە جەنگیانا هەر لـە سەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەتا ئێسـتاو کـۆڵ نـادەن لـە هەموو لایەکەوە ئاگری جەنگ هەڵئەگیرسێنن بۆ کز کردن و بێ هـێزی موسـوڵمانان ، ئەگەر بۆیان بکرێ موسوڵمانان قەلاچۆ ئەکەن ، جـەنگی گاورەکـانی بـیزەنتی و جـەنگی خاچ پەرسستەکان و جەنگی تەتارەکان و جەنگی گشتیی یەکەمی سـاڵی (١٩١٧ ز ) و

جەنگی دووەمی گشتی ساڵی ( ١٩٣٩ ز ) و پارچەپارچە کردنی موسوڵمانان و دانانی زایۆنی‌یەکان لەسەر خاکی فەلەستین ، ئەوانە و زۆر ڕووداوی گەورەتر بەڵگەن لەسەر دوژمنایەتی بێباوەڕان بە گشتی لەگەڵ موسوڵماناندا .

ئەگەر موسوڵمانان لایان گران بێ و تەمەڵی بکەن لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوادا ، بێ باوەڕان بە ئاواتی پیسی خۆیان ئەگەن ، ئاواتی‌ی هەمو دوژمنانی ئیسلام دێتە جێ ئەو گیانە پیسەی پەیا پەی پەرە ئەسێنێ لە بێباوەڕانەوە بۆ هەموو کەسێ کە بۆنی ئیسلامی لێوە بێ ، ئیمڕۆیش هەر زیندووە لەلای زۆرترین ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی و خاچ پەرستەکان و زایۆنی‌یەکان و ئاینە کەرەسە پەرستەکان ، چونکە ئیسلام بە گوێرەی مافی مرۆڤایەتی و دادپەروەری بەرەنگاریان ئەکا و بووە بە کۆسپی گەورە لە ڕێگەیاندا بۆ ستەم کردن و گێرە شێوێنی و داوێن پیسی و چەوسانەوەی دانیشتوان ، موسوڵمانان دوژمنی سەرەکی ئەوانن بۆ ئەو مەستەیە هەر ئەوانیشن بتوانن ڕێگەیان لێ بگرن ، بۆیە بێ باوەڕان بۆ دژی موسوڵمانان هەمووشتێکی خراپ کۆی گرتووە لەسەر دڵیان ، لە هەر ڕوویەکەوە بۆیان بلوێ جەنگیان لەگەڵ ئەکەن ، هونەرمەندی بۆگەنی خۆیان بە فێڵزانانە بەکار دێنن بۆ قەڵاچۆی موسوڵمانان بەهەر جۆری بۆیان هەڵسوڕێ بەتایبەتی لە هەوڵدان بۆ ڕواندنی تۆوی دووبەرەکی ، لە نێوانیانا هەتا ببێتە هۆی‌ی هەڵگیرساندنی جەنگ ، هەتا بەو بۆنەوە دوژمنانی خۆیان لەبیر بچێ ، بۆیە پێویستە ئێمەی موسوڵمان ئاگامان لە دوژمنانی خۆمان بێ و بیان ناسین ، ڕەگەز پەرسستی و چینایەتی‌ی پاڵمان پێوە نەنێ هێزدارەکانمان بێهێزەکانمان بکوژن ، فەرمودەی خوامان لە بیر بێ کە بروادارا‌ن برای یەکترن ، با ئێمەیش جەنگیان لەگەڵ بکەین هەر بەو چەکەی ئەوان جەنگی پێ ئەکەن لەگەڵ ئێمە ، ئەگەر بمانەوێ دوژمنایەتی بێباوەڕان بژمێرین بۆ ئێمە تەوا و نابێ .

﴿ وَمَنْ يَرْتَدَد منكم عَنْ دِينِهِ ﴾ وە هەر کەسی‌ی لە موسوڵمانان وەرگەڕێ لە ئاینی‌ی خۆی ، وە بێ باوەڕ ببنەوە .

﴿ فَیَمُتْ وَهوَ کافِرٌ ﴾ وە دوایی ئەو کەسە بمرێ و هەر لەسەر بێباوەڕی بێ ، نەگەرابێتەوە بۆلای ئاینی ئیسلام هەتا مردن ، سامانەکەی ئەدرێ بەگەنجینەی ئیسلام.

﴿ فَاولئِكَ حَبِطَتْ اَعْمالُهُمْ فی الدُنیا و الاخِرةِ ﴾ دوایی ئەو تاقمە وەرگەڕاوانە پوچ ئەبێتەوە هەموو ئەو کردارانە بە لەناو چوونی ئەو سودانەی موسوڵمانان بەتەماین لە دوارۆژدا ، بەلەکیس چوونی پاداشتی کردەوەکانیان ، میراتی وەرناگرن و ژنەکەی لێ جیا ئەگرێتەوە لە جیهاندا و پێویستە بکوژرێ ئەگەر پەشێمان نەبێتەوە .

﴿ وَ أولئِكَ اَصْحابُ النار هُمْ فیها خالِدونْ ﴾ وە ئەو تاقمە دانیشتوو هاوڕێگەی ئاگری دۆزەخن بە وێنەی بێباوەڕانی تر ، ئەوان لە نێو ئاگران بە بەردەوامی بۆیە پێویستە باوەڕداران کاری چاکە بکەن ، خۆیان لەو کار و گفت و گۆیانە بپارێزن ئەبێتە هۆی پوچ بوونەوەی چاکەکانیان بە هۆی وەرگەرانیان لە ئاینی ئیسلام .

کاتێ عەبدولای کوڕی جەحش و تاقمە هەشت نەفەرییەکەی توشی جەنگ بوون لە مانگی ڕەجەبدا وایان زانی کۆتایی مانگی جیمادی دوهەمە ، واقیدی کوڕی عەبدولای سەمی عەمری کوڕی حەزرەمی کوشت و کۆمەڵێ گومانیان وابوو ئەگەر گوناە بار نەبن بەو جەنگە بە ئومێدی پاداشت و چاکە ئەبن ، بۆ نەهێشتنی ئەو گومانە و ئاگادار کردنەوەی ئادەمیزاد کە ئەو کۆمەڵە چونکە کۆچیان کردووە و بەتەمای میهرەبانی خوان پاداشتیان ئەدرێتەوە ، خوا ئەفەرموێ :

﴿ اِنَّ الذینَ امَنوا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە ، ڕاستن لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾کە بریتین لە عەبدولا و تاقمەکەی .

﴿وَالذینَ هاجَروا وَ جاهَدوا فی سَبیلِ اللّهَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ کۆچیان کردووە لە نیشتیمانی خۆیان و ئەو کەسانەی کۆششیان کردووە و خۆیانیان ماندوو کردووە ، جەنگیان کردووە لەگەڵ بێ باوەڕان لە ڕێگەی ئاینیی خوادا بۆ بەرزی ئیسلام .

﴿ اوُلئِكَ یَرجُونَ رَحْمَةَ اللّٰهِ ﴾ ئەو تاقمە ئومێدیان بە میهرەبانی و بەزەیی خوا هەیە لە هەردوو جیهاندا ، کەواتە هەر کارێکیان کردووە پوچەڵ نابێ ، وەك پوچەڵ بوونەوەی

کاری ئەو کەسانەی لە ئاینی ئیسلام وەرگەڕاون ، هەموو بیر و باوەڕێ پەیوەستە بە کۆتایی تەمەنەوە ، ئەویش هەواڵەی زانیاری خوایە .

﴿ وَ اللّهُ غَفورٌ رَحيمْ ﴾ وە خوا لێ بوردنی زۆرە بۆ کارێ بە هەڵە بکرێ ، زۆر میهرەبانە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و خۆیانیان ماندوو کردووە و جەنگیان کردووە بۆ بەرزی ئاین ، وەك عەبدوڵا و تاقمەکەی و هەر کەسێ وەك ئەوان بێ.

ئەمەیشمان لە بیر بێ ئەو کەسەی لە ئاینی ئیسلام وەرگەڕێ، لە پاشا بگەڕێتەوە بۆ ئاینی ئیسلام پێش مردنی ، خوا پەشێمان بونەوەی لێ وەرئەگرێ ، ، لەوە و پاش هەموو پەرستنی لە نوێژ و زەکات و هەموو چاکەکانی تری دروستە بە بێ گومان.

ئەو پەرستنانەی بەر لە وەرگەڕانی کردوویەتی وە پاش گەڕانەوەی بۆلای ئیسلام پێویست نی‌یە بیان گێڕێتەوە لای شافیعی‌یەکان ، بەڵام لای حەنەفی‌ی‌یەکان و مالیکی‌یەکان پێویستە بیان گێڕێتەوە ، زۆربەی موسوڵمانان لایان وایە ئەگەر مرۆڤێ گوناهی کرد زۆر بێ یا کەم ئەو چاکانەی کردویەتی پوچی ناکاتەوە چاکە و گوناه هەریەکەیان بۆخۆیان سەربەخۆن ، ئادەمیزاد بچوکترین چاکە و خراپەی خۆی ئەبینێ سەربەخۆ ، چاکە و خراپەی هەموو کەسێ بەراوورد ئەکرێ ئەگەر چاکەی زۆر تر بوو وای بۆ دا ئەنرێ کە گوناهی نەکردووە ، ئەگەر خراپەی زۆر تر بو وای بۆ دائەنرێ چاکەی نەکردوە ئەگەرچاکە و خراپەی یەکسان بوو ئەوا وەك ئەوە وایە گوناهی نەکردبێ ، بەڵام میهرەبانی و گەورەیی خوا لە هەموو شتێ زۆر ترە بە گوێری خۆی پاداشت و سزای مرۆڤ ئەداتەوە ، ئایەتی (٢١٨) ی پێشوو گەورەترین بەڵگەیە لەسەر لێبووردنی خوا بۆ باوەڕداران و ئەو کەسانەی ئومێدیان بە میهرەبانی خوا هەیە، پاش ئەوەی خوا باسی جەنگی لەگەڵ دوژمنانی بۆ کردین باسی پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆی باوەڕداران ئەکا لەگەڵ پاراستنی هێز و قەوارەی بوونی نەتەوەی باوەڕداران .

با لەبیرمان بێ شەش پرسیار لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کراوە لەم جێگەیەدا :

**یەکەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لەو کەسانەی چاکە و زەکاتیان پیٚ ئەدریٚ .

**دووهەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لەو مانگانەی ڕیٚزدارە و وەلامی ئەو دوو پرسیارە لەمەو بەر ڕوون کرایەوە .

**سیٚهەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لە بارەی ئارەق و قومارەوە .

**چوارەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لە جۆر و چۆنیٚتی بەحشین وئەندازەی .

**پیٚنجەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لە بارەی هەتیوان و چۆنیٚتی مامەلە لەگەلیان .

**شەشەم :** پرسیاری لیٚ کراوە لە بارەی حەیزی ژنانەوە .

لەمەو پاش وەلامی ئەو چوار پرسیارەی دوایی ڕوون ئەکەینەوە ، وەك ئەفەرمویٚ :

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ
وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ
أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾
فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ
خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ
ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾

﴿ يَسْأَلونَكَ عَنِ الخَمْرِ وَ المَيسِرْ ﴾ وە پرسسيار لە تۆ ئەكەن دەربارەی خواردنەوەی مەی و ياری كردن بە قومارۆ .

هەندێ لە گەورە پياوانی هاوڕێكانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وەك عومەری كوڕی خەطاب و مەعاذی كوڕی جەبەل پرسسياريان لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ كرد لە خواردنەوەی مەی كە لابەری ئەقڵە ، لە ياری كردن بە قومار كە هۆی لەناو چوونی دارايی وسسامانە ، لەو كاتەدا مەی خواردنەوە قەدەغە نەكرابوو كە فەرمانی خواردنەوەی مەی و ياری كردن بە قوماريان بۆ ڕوون بكاتەوە ، خوای گەورە ئەم ئايەتەی نارده خوارەوە و فەرمووی :

﴿ قُلْ فيهما اِثْمٌ كَبيرٌ وَ مَنافِعُ لِلْناسِ ﴾ تۆ بڵێ : لە مەيی و قوماردا ، گوناهێكی گەورە هەيە لەم كاتەوە بە دواوە ، چەندين سووديان تێدابوە بەر لەقەدەغە كردنيان بۆ ئادەميزاد سوودی مەی وەك پەرەسەندنی گەرمايی لەش و تواندنەوەی خواردەمەنی ڕێزگرتنی خاوەن فيزەكان لەهەژاران و دەست گوشانی چروك و ڕژدەرەكان و ئازای كردنی ترسنۆكەكان و قازانج وەرگرتن لەكڕين و فرۆشتندا ، بەڵام بەسە كە خوا بفەرموێ لەواندا هەيە گوناهێكی زۆر گەورە ، ئيتر چۆن ئەبێ وازيان لێ نەهێنين ، سوودی ئادەميزاد لە نەكردنياندا بەچاو ئەبينری وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَ اِثْمُهُما اَكْبَرُ مِنْ نفعِهِما ﴾ وە گوناهی‌ی ئارەق وقومار زۆرترە لە سودەكانييان وچاوەڕوانی خراپەی زۆريان لێ ئەكرێ ، ئەبنە هۆی‌ی دوژمنايەتی‌ی لە نێوان ئادەميزاددا ، وەك واز هێنان لە ناوی خوا و نوێژ كردن و نەمان و نەهێشتنی ئەقڵ بە جۆرێ ئەو كەسانەی بەكاريان دێنن ياری بە ميز و پيسايی خۆيان ئەكەن ، ئەبنە هۆی نەمانی سامان بەبێ پاش ماوە و جێگەنشينی سامان بۆيان ، بە شێوەيە توشی خەفەتيان ئەكەن بە بێ بەهانە ئەچن بەگژ هاوڕێكانيانا ، لە دەروونيانا كينە و دڵ پيسسی دروست ئەبێ بۆيان ، ئەيانەوێ تۆڵەيان لێ بكەنەوە .

کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کۆمەڵێ لە موسوڵمانان وازییان لە خواردنەوەی ئارەق هێنا وکۆمەڵێ ئەیان خواردەوە ، هەتا ڕۆژێ عەبدولڕەحمانی‌ی کوڕی‌ی عەوف کۆمەڵێکی بانگ کرد بۆ نان خواردن ، دەستیان کرد بە خواردنەوەی مەی و سەرخۆش بوون ، یەکێکیان بوو بە پێشەوای نوێژ ، ووتی ﴿ اَعْبُدُ ما تَعْبُدونَ ﴾ بەبێ ووشەی ﴿ لا ﴾ یانێ من ئەپەرستم ئەو شتەی ئێوە ئەی پەرستن ، بۆیە ئایەتی‌ی ﴿ وَ لا تَقْرَبوا الصَلاةَ وَ اَنْتُمْ سُکاراً ﴾ لە سورەتی (نیساء ئایەتی ٤٣ ) هاتە خوارەوە .

یانی ئێوەی موسڵمان نزیك مەبنەوە لە نوێژەکانتان و لە کاتێکا ئێوە سەر خۆشبن ، لە پاش هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە مرۆڤی وایان هەبوو دوای نوێژەکانیان مەیان ئەخواردەوە و بە بێ سەر خۆشی . دوایی جارێ عەتبانی کوڕی مالیك میوان داری کۆمەڵکی کرد سەعدی کوڕی وەقاس لە نێویاندا بوو سەری ووشترێکی بۆ برژاندن خواردیانەوە سەر خۆش بوون ، دەستیان کرد بە خۆهەڵکێشان و هۆنراوە خویندنەوە لە دژی یەکتری سەعد دەستی کرد بە توانج کردن لە یاریدەدانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە هونراوەیەك دا بۆیە کەسێ لە یار دەدەرانی پێغەمبەر دانیشتوی مەدینە دووشەویلەی هوشترەکەی کێشا بە سەری سەعدا و شکاندی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ بەو ڕوداوەی زانی ، بۆیە عومەری کوڕی خەتاب ووتی : خوایە بە یەکجاری کارو باری فەرمانی مەی خواردنەوەمان بۆ ڕون بکەرەوە خوای گەورە ئایەتی (٩)ی سورەتی مائیدە ناردە خوارەوە کە فەرمووی : ﴿ انما الخمر والميسر والانصاب والازلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون ﴾ بە ڕاستی مەی و قومارو بتە هەڵواسراوەکان و دارە فرێدراوەکان بۆ بە دەست هێنانی ئاواتی خۆتان هەموویان پیسن و کاری شەیتانن دوایی خۆتان دوور بخەنەوە لەو کارە ، بۆ ئەوەی ڕزگارتان ببێ لە خراپەیان و زیانیان ، نەتەوەی موسلمانان بە گشتی لە سەر ئەوەن هەر لە کاتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەتا ئەم ڕۆکە مەی خواردنەوە لە گوناهە گەورەکانە، هەر کەسێ بە ڕەوای دانێ بە موسلمان دانانرێ و پێویستە بکوژرێ هەر کەسێ بیخواتەوە و بە قەدەغەکراوی دانێ بە گوناهبار دائەنرێ و پیویستە هەشتا داری لێ بدرێ .پێغەمبەر﴿ﷺ﴾

ئەفەرموێ (بێ بەشە لە میهرەبانی خوا ئەو کەسەی درختی میوە بنیژێ بۆ ئەوەی مەی لێ دروست بکا ، بێ بەشە لە میهرەبانی خوا ئەو کەسەی مەی دروست بکا و بیگێرێ بە پەرداخ و ئەو کەسەی ئەی خواتەوە ) .

مەی بر یتیە لەگوشراوی ترێ و مێوژ و خورماو ئەوەی دەر ئەهێنرێ و دروست ئەکرێت لە هەنگوین و گەنمە شامی بە جۆری وایان لێ بکرێ ببنە هۆی سەرخۆش کردنی بخۆرەکە ی، کەم و زۆر لە قەدەغە بونیان یەکسانن ، بەو جۆرەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕونی کردۆتەوە هەر شتێ مرۆڤ سەرخۆش بکا قەدەغەیە ئیتر بەهەرناوێ نا ببرێ تەربێ وەك مەی و ئاوی جۆ ویسکی . شەمپانیا . کۆنیا . فۆدکاو یا وشکێ وەك بەنگ ئەفیۆن وقات و کۆکایین . بەلام ئەو ووشکانە داریان لێ نادرێ بەهشتا دار . بەلك و تەمێ ئەکرێ بەشێ دادوەر بە شیاوی بزانێ .

دکتۆر سەبری قەبانی لە نامەی ( طبيبك) دا ئەلێ : بیرە لە هەمو سەرخۆش کەرەکان زیانی زۆرترە . زیانی مەی نایەنە ژمارە .بەلام باباسی هەندێ لە زیانەکانی بکەین

خۆاردنەوەی مەی زۆرتر ئادەمیزاد لە ناو ئەبا بەنەخۆشی سیلەوە ، بۆ یە هەوالێ دەری هەوالێ لە پاریس لە مانکی مایۆ سالێ ( ١٩٥٦ ) زایینی بلاوی کردەوە: پەی مانگای نەتەوەیی فەرەنسا بلاوی کردۆتەوە : ئەمڕۆ ( ٢٥ ) بیست و پێجی مایو بە هۆی مەیەوە کوژراو زۆرترە لە کوژراوەکانی نەخۆشی سیل لە سالێ پێشودا ( ١٧،٤٠٠) حەڤدە هەزارو چوار سەد کەس بەهۆی مەیەوە مردون . بەلام بەنەخۆشی سیل( ١٢٠٠٠) دووازدە هەزار کەس مردوون ، لە پێنج سالێ پێش و دا (٢٦٠٠٠) بیست و شەش هەزار کەس بە هۆی مەیەوە مردوون .

( الكحول) یانی ئەسپرتۆ زەهرێکی سەرەکیە لە نیو هەمو (مشروبات الروحيه) دا وەك مەی نەعنا و مەیەکانی تر . بە گوێرەی تاقیکردنەوە گەدەی مرۆڤ ٢٠٪ هەتا لە ٨٠٪ ئەسپرتۆ ئەمژێ ،ئەوەی ماوەتەوە ڕیخۆلە باریکەکان ئەی مژن پێسی تەنکی دەم و قورگ و سورێژە هەندێ لە و ئەسپرتۆیە ئەمژن ،زۆر ئاشکرایە خواردنەوەی ئەسپرتۆ هەرکیز خۆشی بە لەش نادا بەلکو زیان بەخش و روخێنەری لە شن . پێویستە بزانین ڕێژەی

ئەسپرتۆ لەو شتانەو ئەندامانەدا ئەبنە هۆی سەرخۆشی یەکجار زۆر . بۆ نمونە ویسکی وکونیاو براندی مەی و ڕۆم یانی مەیی قامیشی شەکرو ئەسپەنت لە ٣٠٪ هەتا لە ٧٥٪ ئەسپرتۆی تێدایە . زیانی ئەسپرتۆ زۆر زۆرە بۆ هەمو ئەندامەکانی لەش .

أ – زیانی ئیسپرتۆ لەسەر جیهازی عەصەبی واتا کۆئەندامی دەماری.

ب– زیانی ئیسپرتۆ لەسەر خانە دەماری بەجۆرێ ئەوکەسانەی دەقیان گرتوە بە خواردنەوەی ئەو شتانەوە ئەوەندە ئیسپرتۆیان تێدایە گیرۆدەی کەم خەویان ئەکا یابنەبڕی ئەکا .

ج– مەی خۆران تووشی گێلی ئەبن دەنگە دەنگ و قاڵەقاڵێ ئەبیستن هەرلەخۆیانەوە بەبێ هۆ تووشی شێتی وا ئەبن ئاگایان لە خۆیان نامێنێ ،خۆیان لەبیر ئەچێ وملەژێر سێبەری ئازاییدا وایان لێ دێ تووشی مرۆڤ کوژی بن ،خەفەت و بێ ئارامی دایان ئەگرێت بەجۆرێ سەرئەکێشێ بۆکوشتنی خۆیان ،وەتووشی فێ و شێتی و ئازاری دەمار و شلە پەتەیی و چاو دەرپەڕین و گرتنی زمان و بێ هۆشی و بێ بیری دەبن ،بەتایبەتی ئەو کەسانەی ئاو جۆ و شبناس و مەی خۆرما ئەخۆنەوە،ئەو نەخۆشیانە دەست پێ ئەکات بەترسان و سەرسوڕان و سەریەشەو ڕشانەوە ،لەپاشا بێ هۆش ئەبن زۆر جاران وایان لێ دێت بەخەیاڵ قالۆنچە و مشك و جرج و شتی تر دێنە پێش چاویان پاش خواردنەوەی ئاوی جۆو مەی خورما وایان لێدێت پەلاماری دانیشتوانی بێ تاوان بدەن،ئەو نەخۆشیانە بنەبڕ نابن هەتا واز لە خواردنەوەی هەموو مەیێ نەبەرن.

د– زیانی مەی لەسەر پەردەی دەماغ کەدەست پێ دەکات بەسەر ئێشەو لێدانی کۆمەڵە دەمارەکان بەتوندی و بێ هۆشبوونی و مردنی ،ئەوانەیش ڕونکراونەتەوە بەپارچە کردنی لەشیان بەهۆی پزیشکی نەشتەربازەوە و دوای مردنی.

ه– زیانی مەی بۆ دەمارەکانی لەش ،کاتێ ئیسپرتۆ لە شادەماری ملەوە دەرچوگرئەستێنێ و ڤیتامین ( B ) کەم ئەبێتەوە کە زۆر پێویستە بۆ دەمارەکان وە مرۆڤ هەست دەکات بە ئازار کە لە دەمارەکانی کەفەڵەوە دەست پێ ئەکات هەتا ئەگاتە دەمارە

کانی دەست و وردەوردە بێ هێز ئەبێ و دەمارەکانی لە کار ئەکەون و توشی حەساسیەت ئەبن یانێ هەستایەتی و خوران .

و- زیانی مەی بۆ هەست کردن مەی خۆر وای لێ دێ هەست بە گەرمی و ساردی و زبری و نەرمی و هەتا دێی ناکا ، چاوی توشی ئاوساوی و سوربونەوە و فرمێسك ڕشتن ئەبێ وە چاوی کەم هێز ئەبێ بۆ بینین بە جۆرێ ڕەنگەکان جوێ ناکاتەوە لە یەکتری وە گوێچکەو چەشەکردنی و بێن کردنی بێ هێز ئەبێ .

ز- زیانی مەی بۆ سوڕی خوێن یانێ بەو جۆرەوی پێویستە نایەلێ خوێن بە شێوەیەکی شیاو بۆ هەموو لەش سوڕی خۆی بڕوا ، چەورری زۆرتر ئەبێ و ئەبێتە هۆی تەنگ بوونەوەی بۆشایی دەمارو وەستانی دڵ و مردنی .

ح - زیانی مەی بۆ سەر دڵ ، هەمووددڵۆپێ لە مەی بەدڵدا تێ ئەپەڕێ و ئەکەوێتە پەلە هەتا دڵۆپەکان زۆرتر بێ دڵ باری گرانتر ئەبێ وە ئەوکەسەی دەقی بە خواردنەوەی بیرەوە گرتبێ دڵی ڕائەکێشێ و گەدەی فراوان و گەورە ئەبێ تووشی هەناسە کورتی ئەبێ دەم و چاوی تێك ئەچێ هەروەها دەست و قاچ و پێستی شین هەڵ ئەگەڕێ پێی توشی ئاوسان ئەبێ بەشەوا میزی زۆر ئەکا گیرۆدەی پاڵ پێوەنانی خوێن ئەبێ وە جگەری وەك دڵی گەورە ئەبێ و ئەکشێ ، لە کۆتایی دا لە بۆشایی سنگ و وورگیا ئاوی زۆر پەیدا ئەبێ و ئەمرێ .

ط- زیانی خواردنەوەی مەی بۆ کۆئەندامی هەناسە دان بەو جۆرەی توشی ئەبێ و باوێشکی زۆر ئەدا یەك لەدووای یەك .

ی- زیانی خواردنەوەی مەی لەسەر لوت ، لوتی ناشرین ئەبێ وە ناوی لوتی مەی خۆر هەستی بۆنکردنی بێ هێز ئەبێ یەکەمین جار مەی خۆر بۆنی مەی ئەکاو لای خۆشە ، لە کۆتایی دا بۆنەکەی ناکاو وە بەس ئەیەوێ بە مەی سەرخۆش ببێ .

ك- زیانی مەی بۆ قورقوڕاگە بەو بۆنەوە توشی دەنگ کەوتن ئەبێ بە تایبەتی پاش سەرخۆش بوون وە بە تەوژمی ئەیەوێ بکۆکێ بۆ بەربوونی دەنگی وای لێ دێ تووشی سیل ئەبێ .

م - زیانی مەی بۆ کۆئەندامی هەرس و توانەوەکە ئەبێتە هۆی فراوانی گەدەو ریخۆڵەکان ووردە ووردە هێزی هەرەس و توانەوە کەم ئەبێتەوە ئێمە ئەکەر بمانەوێ زیانی مەی بنووسین بۆ سەردەم و گەدەو ریخۆڵەی دووانزەگرێ و کۆئەندامی ماسولکەکان و کۆئەندامی میزکردن و کۆئەندامی زازوزێ و کۆئەندامی دەماری و کۆئەندامی چەقی (جهاز عصبی مرکزی ) ، وە کۆئەندامی جوڵانەوەو رۆیشتن و کۆئەندامی چێوەیی ( جهاز عصبی محیط ) وە کۆئەندامی گورچیلە و بۆری ئاوی ناتوانین بیان نووسین بەلام خوێنەواری بەرێز خۆیان ئەتوانن ڕوونیان بکەنەوە بەتایبەتی لە نامەی ( التغذية و المشروبات الروحية ) دانراوی ( دکتور ئەمین رووەییمە) .

بۆ زیانی مەی خواردنەوە مەی بەتەنها ئیسلام هەوڵی نەداوە وە جگەی ئیسلامیس زۆرزۆ لایەنی تر هەوڵی داوە :

بۆنمونە ئەندامێکی سویدی کۆمەڵێکی دروست کرد بۆ قەدەغەکردنی مەی ئەندامەکانی گەیشتنە ( ٦٠٠٠٠٠) شەست هەزار کەس ، وەگەڕان بەنێو فەرەنسەو بەریتانیاو ڕوسیاو چین و یابان لە نزیکەی ساڵی ( ١٩١٥) زایینی بەرانبەر ( ١٣٢٣) کۆچی ، وە کار بەدەستانی ئەو هەرێمانە یاریدەی زۆریان دان وە بەرلەوانیش ( ٤٥) چل و پێنج ملیۆن ئەمەریکایی مەیان لەسەر خۆیان قەدەغەکرد . بەلام بەداخەوە بێ سوود بوو چونکە کاربەدەستان و پیاوەکانیان بەو جۆرەی پێویست بوو یارمەتیان نەدان .

بەکورتی مەی زیان بەخشە بۆ سەر ساغی لەش و بۆ سەر دارایی و سامانی ئادەمیزاد ، وە شارستانیەت توشی ڕوداوی نالەباری ئابوریان ئەکات ... داوێن پیسیو ڕەوشتی خراپ بڵاو ئەبێتەوە ئادومیزاد ئەکابۆدرِونده بۆ کوشتنیەکتری ،یاریدەی تاوان باران و تالان

کەران ئەدا ، بەزەیی و میهرەبانی لەناویانا نامێنێ، مرۆڤ والیٚ ئەکات دزین و دەست بڕین بەکار بهێنێ ، شەرمی نامێنێ دەست لە خەلْکی پان ئەکاتەوە بۆ پارە وکڕینی مەی بەزۆری هێرش ئەبەنە سەر ناموسی کوڕو کچانی بێ تاوان وە ناموسیان ئەڕوشێنن زۆرجاران ناموسی خۆیان ئەفرۆشن بۆپەبداکردنی مەی وە مرۆڤی بێ تاوان ئەکوژن و خوێنی زۆریان ئەڕێژن وە یاسای دەست کردی مرۆڤ جگە لەوەی قەدەغەی بکا یارمەتی مەی خۆران ئەدا ، چونکە سەرخۆشەکان هەزاران مرۆڤیان کوشتووە کەچی یان هەرسزایان نادەن یان کەمتر سزایان ئەدەن کەواتە چارەمان نامێنێ جگە لەوەی پەلاماری یاسای خوای گەورە بدەین وە پێویستە بزانین مەی یان بیرە بەکار نەیەرین بۆ دەرمان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ ( انە لیس بدواء و لکنە داء ) بەڕاستی مەی نابێ بە دەرمان وە بەلْکو دەردە . پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەرلە هەموو کەسێ ئەو فەرمودەیەی ووتووە وە لە دووای ئەویش هەندێ زانایانی تر باسی هەمان مەبەستیان کردووە بۆنمونە دکتور ( مار ) ئەسکوتلاندی ئەلێ مەی پێویستە بۆ هیچ شتێ دانەنرێ و نابێ بەدەرمان وە دکتۆر ( هیچنبوپوم ) لە بەردەم کۆمەلێ پزیشکی بەریتانیادا ووتی : من هیچ نەخۆشێکم نەزانیوە ڕزگاری بووبێ بە هۆی مەیەوە دکتور ( جونسون ) ی ئینگلیزی ئەلێ بێگومان پێویست نییە مەی بەکار بهێنرێت بۆ هیچ دەردێ وە پوچ کردنەوەی واتەی ئەو کەسانەی ئەلێن : مەی هۆی ژیانەو تەن ئەپارێزێ و دەمارەکانی بەهێز ئەکا ئەلێ : ئەوانە چەندین هێزن ناویان ئەبرێ بەناوی چەندین زەهرێکی تر بۆ لەناوبردنی ئادەمیزاد بەتایبەتی مەی کارئەکاتە سەر زاوزێ ی و بنە بڕکردنی تۆوی زاوزێ لە ژن و لە پیاودا وە زۆر جاران منالْەکانیان ناشرین و ناتەواو و گێل و گەوج و لەڕو لاواز و ڕەنگ زەرد و بێ خوێن ئەبن .

پاش ڕوونکردنوەی ز یانی مەی و باسی هەندێ لە زیانەکانی باسی زیانی قومار ئەکەین.

نەتەوەی موسلْمان بە گشتیی لەسرە ئەوەن قومارکردن قەدەغەیە وە خواردنی پارەکەی لە گوناهە گەورەکانە ، وە بە ڕەوا دانانی وەرگێرانە لە ئاینی ئیسلام وە کاربە دەستان ئەو کەسە بکوژن بەڕەوای دابنێن .. قومارکردن جۆری زۆرە هەموویان قەدەغەن وە لە جۆرە کانی دۆمینە ، تاولْە ، نەرد ، قاپێن ، موشێن و گرەو گردن و گوێزێن شێرو

خەت و یانسیب . هەروە ها بەلاّم شەترنج لای شافیعیەکان قەدەغەیە نی‌یە بە مەرجیّ لە سەر پارە نەبیّ جنێو ناخۆشی لیّ پەیدا ئەبیّ و ئەبێتە هۆی نەکردنی نوێژ و و دوواخستنی نوێژ و وازهێنان لە کەسابەت ووتەی خراپ و توانج و نەگرتنە یەکتری ، بەلاّم لای حەنەفیەکان بە هەرجۆریّ بیّ قەدەغەیە ، زیانی قومار زۆر زۆرن باسی هەندێکیان ئەکەین :

١) زیانی بۆ سەر دارایی : وە ئەبێتە هۆی بنەبڕکردنی سامان بە کتوپڕی ، بێگومان ئەبینریّ چەندین ساماندار خۆیی و کۆشك و تەلاری لە دەست دەرچووە بە هۆی قومارەوە ، وە ئێوارە سامانداروو بەیانی هەژار و بیّ پول و بیّ خانوو کزۆلّ و بیّ نرح و سامانەکەی ئەچێتە ژێر دەستی مرۆڤی تر بە بیّ ماندووبوون .

٢) زیانی قومار بۆ سەر کۆمەلاّیەتی : قومارچی بە تەمەلّ وتەوەزەلی چاوەڕوانی سامانە لە ڕێگەیەکی بڕوا پیّ نەکراووە ئەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ئەقلّیان و واز هێنان لە کشت و کالّ و بازرگانی و پیشەسازی کە ئەبنە هۆی پێشکەوتنی گەل و مرۆڤایەتی وە کاتیّ خۆیان بە فیرو ئەدەن بیّ سودی لایان مسۆگەر ئەبیّ بێزارو قێزەون ئەبن بە جۆریّ میزو پیسی ئەکەنە ژێر خۆیان نەوەك بیرە خراپەکەی خۆی لەبیر بچیّ شەو هەتا ڕۆژ بەیانی هەتا ئێوارە دا ئەنیشیّ بۆ ئەو کارە پیسە ، خۆیی و منالّەکانی توشی هەناسە ساردی و بیّ نرخی و بیّ شەرمی ئەبن با تێك چوونی لە گەلّ ژنەکەی سەرباری هەموویان بیّ کەواتە گفتوگۆی نالەباری پیّ ئەلّیّ ، چونکە بە باخەلّی خالّی دێتەوە بۆ لای خێزانەکەی، منالّەکانی لە برسا نا پڕمەی گریان لیّ ئەدەن .

٣) زیانی قومار بۆ سەر ئایین : ئەبێتە هۆی وازهێنان لە نوێژ یا دوواخستنی ، واز هێنان لە یادی خوا و بیرکردنەوە لە فەرمانەکان ئایین بە دەیان جنێو بەیەکتری ئەدەن قومارکردن وەك خواردنەوەی مەی کەباسمان کرد بە ڕەوا دائەنیّ ئەبێتە هۆی وەرگەڕانی لە ئایینی ئیسلام کاربەدەستان پێویستە لەسەربیان بیان کوژن ئەگەر کەسیّ بە قەدوغەی دانیّ و بەکاری بێنیّ پێویستە تەمیّ بکریّ بە بەندکردنی یا بەلێدانی ئەگەر کاربەدەستان بەو پێویستە هەلّ نەسن گوناە بار ئەبن .

پێشووەکانمان سنووری ئاینیان ئەپاراست وە (٤٠) چل دار یان زۆرتریان ئەدا لە مەی خۆر بە و بۆنەوە زیانی مەی و قومار پەرەی ئەسەند زانا ئایینیەکان ریزگیراو گوێ لێ گیراو بوون کاربدەستان بە هێزترین لایەن گری ئەو کارە بەنرخە بوون لە بەر فەرمانی خوا کە فەرمووی:﴿ فهل انتم منتهون ﴾ ئایا ئێوە واز ئەهێنن . بەلاَم شارستانیەتی تازە هات بۆ لامان بەسواری و بە پیادە بوون بە هاویەشمان لە خێزان و داراییمان . پەلاماری نارەوایان داین وەرێزی ئایین نەما و دوژمنانی ئایینمان لە هەمولایەکەوە چەقیان داکوتاو ئایینیان پرش و خامۆش و وووردو خاش کرد بەلاَم بابزانری شارستانیەت بێ زانین و زانستی گومراییە زانین و زانستی ناتەواوو نەگبەتیە زانین و زانستی نەزۆکی بێ سوود بۆ کۆمەڵ خراپترو نەگبەتی ترە لە گێل و گەوجی نەخوێنەوار ی کەواتە ئێمە بە ناو موسڵمانین پێس و کاوڵی ئاینمان گرتووە مەژگەو کاکڵەی ئایینمان وەرنەگرتووە رەوشتی خراپی خاچ پەرستان و زاوێنیمان بەهەردوو دەست گرتووە وازمان لە زانین و و زانیاری هێناوە ئەوەی بە نرخ و و بەسوودە بەخشیومانە بە وان وە خراپەکانی ئەوانمان کردووە بە سەرمایە بۆ خۆمان هاوار بۆ ئەو کەسانە وازیان لە ئایین و زانست هێناوە بۆئێمە هەرئەبێ فێری مەی خواردن و قومار ببین بەلاَم لە هەموو روویەکی تری بەسوود نەزان و گێل و تەوەزەل بین .

پاش ئەوی خوای گەورە باسی قوماری کرد کە جۆرێك بووو لە دەست گیرۆیی هەژاران بەرلە هاتنی ئایینی ئیسلام بێ باوەران خۆیانیان پێوە هەڵئەکێشا ئەو کەسەی نەی کردیایە بە رژدیان دائەنا هەروەك مەی خۆر و قومارچی‌یەکانی ئێستا کە قونابی ئازیزی بت پەرستان و بێ باوەرانی سەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ، دووایی خوای گەورە باسی جۆرە بەخشین و دەست گرۆیی ترمان بۆدەکات بۆ هەژران کە چاك و رەوا بێ ئەفەرموێ ﴿ و یسألونك ماذا یُنفقون ﴾ وە پرسیار لە تۆ دەکەن چ شتێ ببەخشن و چۆنی بدەن بە هەژاران.

﴿ قُلْ العفو ﴾ تۆ لە وەلآمدا بلێ : ببەخشن ئەوەی بۆتان ئەلویَ ولاتان ئاسانەو ماندوتان ناکات ئەوندە ببەخشن بۆ بەخێو کردنی خۆیان و خێزانەکانیان پێویست بێ وە خۆتان بێ دارایی و هەژار مەکەن . ئەگێرنەوە جارێ مرۆڤێ هێلکەیەکی زێری هێنا یە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) ووتی : ئەمەم لێ وەربگرە و بیدە بە هەژاران پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێرا وە چەند جارێ دووبارەی کردەوە .پێغەمبەر(ﷺ) بەناخۆشیەوە فەرمووی : ئێوە هەموو دارایی خۆتان ئەبەخشن لە پاشادا ئەنیشن و دەست لە ئادەمیزاد پان ئەکەنەوە وە بە ڕاستی چاکە کردن نابێ مەگەر دووایی ئەوەی پێویست نەبێ و هەژارتان نەکا.

خوای گەورە قەدەغەی کردووە بەخشین و دەست گیرۆیی بە جۆرێکی نادیاری و شپرزەیی وەك قوماری بێ باوەران بەشی هەژارانیان لێ ئەدا سامانداریان خۆیانیان پێوە هەڵنەکێشا خوا فەرمانی پێدان پێویستەلەسەر ئادەمیزاد ئەوەی لە خۆیان ماوەتەوە بیدەن بە هەژاران بە جۆرێکی زانراو و ڕوون و ڕێك و پێك بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ کذلك یبین الله لکم الآیات ﴾ بەوێنەی ئەوەی بۆی ڕوون کردنەوە ئەندازەی بەخشین بۆی ڕوون کردنەوە فەرمانەکانی دەربارەی مەی و قومار خوا بۆتانی ڕوون ئەکاتەووە ئەو کارانەی ئێوە پرسیار ئەکەن لە واندا و بە چ جۆرێ دارایی خۆتان ببەخشن و سوودی ئێوەی تێدا بێ .

﴿ لعلکم تتفکرون فی الدنیا و الأخرة ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە لە کارەکانی جیهان ئەوەی چاکە بیکەن وە ئەوەی خراپە نەیکەن وە بیر بکەنەوە لە کاروباری پاشەڕۆژو چ شتێ سوودی بۆ پاشەڕۆژ هەیە بیکەن .

یانێ بەتەنها دڵتان بە جیهان خۆش نەبێ و دووارۆژتان لەبیر نەچێ وە بە تەنها بیر لە پاشەڕۆژ مەکەنەوە و واز لە جیهان بهێنن بیر لە هەردوو جیهان بکەنەوەی پێویستە بزانن ئێوە کەوتونەتە ڕێگە لە جیهانەوە بۆ دووا ڕۆژ ئەو شتەی ئەمرۆ ئەی چێنن پاشەڕۆژ ئەی دوورنەوە ئیش بۆ هەردوولایان بکەن .

﴿ و يسألونك عن اليتامى ﴾ وە پرسیار لە تۆ ئەکەن لە هەتیوان و چۆنیەتی ژیان لە گەڵیان .هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەمەیە :

کاتێ خوا فەرمووی بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ دارایی هەتیوان بخۆن بە ستەم بەڕاستی ئاگر ئەخۆن و ئەیکەنە ورگیان دووای ئەوە سەر پەرشتی کەری دارایی هەتیوان وازیان هێنا لە تێکەڵاوی هەتیوان کە ئیشیان بۆ نەکەن نەوەك تووشی سامان خواردنی هەتیوان ببن و بەری ئەو هەڕەشەیە بکەون بەو بۆنەوە هەندێ لە موسڵمان پرسیاریان کرد بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستەی هەتیوان بەو بۆنەوە تووشی زیان بوون و سوودەکانیان لە کیس چوو ژیانیان تووشی ناخۆشی بوو لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا خوا فەرمووی :

﴿ قُلْ اصلاح لهم خير ﴾ تۆ بەوان بڵێ : چاکە کردن بۆ هەتیوان و بوژانەوەی دارایی ئەوان و چاودێری کردنی هەتیوان و پاراستنی دارایی ئەوان بە بێ کرێ چاکتر و گەورەتر ە لە دوورکەوتنەوەی ئەوان و تێکەڵاوی ئەوان قەدەغە نیە ، واز لە سەرپەرشتی سامانیان مەیەرن ئەگەر بتانەوێ بیان بوژێننەوە وە پەروەردەیان بکەن و کارو سامانیان هەڵسوڕێنن ئێوە بە تێکەڵاوی ئەوان بە و جۆرە تووشی چاکەو پاداشت ئەبن لای خوا خواردنی سامانی هەتیوان و چەوسانەوەیان بەستەم و خراپ قەدەغەیە .

ئەگێڕنەوە کۆمەڵێ موسڵمان خواردەمەنی و دارایی هەتیوانیان بە جۆرێ دا ئەنا وە لە سەر ژێرە خەرو پێ خەفی ئەوان دا ئەنیشتن وە بە هیچ جۆرێ تێکەڵاویان نەئەکردن بۆیە خوای گەورە فەرمووی :

﴿ وان تخالطوهم فأخوانكم ﴾ وە ئەگەر تێکەڵاوی هەتیوان بکەن لە خواردەمەنی و خزمەت کردنیان و دانیشتن لە گەڵیان دووایی ئەوان برای ئێوەن وە مافی برایەتی ئەوەیە تێکەڵاویان بکەن ئەوشتانەی بۆ ئەوانی ئەکڕن و ئەوان ئەی خۆن و ئەی پۆشن لە دارایی هەتیوان وەری گرنەوە .

﴿ والله يعلم المفسد من المصلح ﴾ وە خوا ئەزانێ بە کەسێکی ئەو تۆ خراپە بکا لەگەڵ هەتیوان و بۆ سودی خۆی دارایی ئەوان بەکاربهێنێ لە و کەسەی ئەوتۆ چاکە بکا لە گەڵیان وە ئەزانی بە نیازی ئێوە لە تێکەڵاو کردنیان و بە خواردنی دارایی ئەوان بە ناڕەوایی ، وە خوا پاداشتی ئێوە ئەداتە وە بە گوێرەی نیازی خۆتان .

﴿ و لو شاء الله لأعنتكم ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە تەنگ بە ئێوە هەڵ چنێ و ئازارتان بدا بە ڕاستی خوا لە ئێوەی داوا ئەکرد شتێ ئازاری ئێوە بدایە قەدەغەی ئەکرد لە سەرتان تێکەڵاوی هەتیوان ئیتر بۆ ئێوە تێکەڵاوی ئەوان ناکەن .

﴿ ان الله عزيز حكيم ﴾ بەڕاستی خوا زۆر بە دەسەڵاتە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دا دا ئەنێ .

ئەوەی شایانی باسێ مەرج نی‌یە زۆر بە وردی بۆی دا چین لە یەکسانی خواردەمەنی هەتیوان و زیان بردنە سەر لە گەڵیان و لە گەڵ خێزانەکان دا بە گوێرەی دام و نەریتی ئەوان و ئێوە بە یەکەوە بخۆن و بخۆنەوە زیانی نی‌یە هەریەکەیان بە گوێرەی داب و نەریتی ئەوان و ئێوە بە یەکەوە بخۆن و بپۆشن ، وە خوای گەورە بە گوێرەی باوونەریت چاوپۆشی لە ئادەمیزاد ئەکا لە خواردن و خواردنەوەیە نەتوانرێ بەیەکسانی هەڵسوڕێ سەرپەرشتی کەری هەتیوان ئەتوانن لە دارایی هەتیوان بخۆن و بخۆنەوە بەو مەرجەی هەژاربن بە گوێرەی باوونەریت نەك خاوەن سامان خوا ئەفەرموێ لە سورەتی ( النساء) دا ﴿ و منْ كان غنياً فليستعفف و من كان فقيرا فليأكل بالمعروف ﴾ یانێ هەرکەسێ ساماندارە و هەیەتی ، دووایی با خۆی بپارێزێ لە خواردنی دارایی هەتیوان و هەرکەسێ هەژارە دووایی بخوا لە دارایی ئەوان بە گوێرەی باو نەریت کات و شوێن .

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ سەری ئەلغەنەوەی نارد بۆ مەکە بۆ ئەوە چەند کەسێ لە موسڵمانان بهێنێتە دەروە دووایی عوناق هات بۆلای کەژنێ بوو بەرلە ئیسلام بونی خۆشی ئەویست بە مەرد سدی ووت : بەتەنها بە یەکەوە دا نیشین ، ووتی: ئیسلام ئەوکارەی لەمن قەدەغە

ئەوکارەی لەمن قەدەغە کرد ، وەعناق ووتی : ئایا بۆ مارەم ناکەیت ؟ ووتی ئـەبێ پرسـێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بکەم . دووایی بەو بۆنەوە خوا فەرمووی :

وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾

﴿ و لا تنكحوا المشركات حتى يؤمن ﴾ وەئێوە مه خوازن ژنـانی بـت پەرسـت هـەتا ئەوە ژنانە باوەڕ نەهێنن بەئاینی ئیسلام .

﴿ ولأمة مؤمنة خير من مشركة﴾ وەبەڕاستی کارەکەرێکی باوەڕ دار باشـترە لـەژنێکی ئازاد.

هەندێ لەزانایان ئەڵێن :ئـەو ئایەتـە هاتوەتـە خـوارەوە دەربـارەی عـەبدوڵای کـوڕی ڕەواحە کەکارەکەرێکی ڕەشی هەبوو لـەگەڵیا تێك چووئەویش شـەقازلێکی لـێدا ،دوایـی پەشیمان بوویەوە ،هاتە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە ،ووتـی :ئـازادی ئەکەم وئەیکەم بەژنی خۆم ،وەکردیشی هەندێ کەس تا نەیان لـێدا ووتیـان :کارەکـەرێکی خۆی خواستوە .

﴿ ولو اعجبتكم ﴾وەبائەو ژنە بت پەرستە دڵی پێوەی بردبێ وئێوەش خۆشتان بوێت ، ئێوەی فریودابێ بەهۆی جوانی خۆیەوە و دارایی زۆری وپلەو پایەی بەرزی وباوك وهۆزەكەی .

﴿ ولاتنكحوا المشركين حتى يؤمنوا ﴾وەئێوە مارە مەبڕن لەپیاوانی بت پەرست ژنەباوەڕدارەكان هەتا ئەو بت پەرستانە باوەڕ بەخوا و بەپێغەمبەر ئەهێنن .

﴿ولعبد مؤمن خير من مشرك ولو اعجبكم ﴾وەبەڕاستی بەندەیەكی باوەڕدار چاكترە لەپیاوێكی بت پەرست بائەوە پیاوە دڵی ئێوەی بردبێ وە فریوی ئێوەی دابێ سامان و جوانی و پلەو پایەی .

﴿اولئك يدعون الى النار﴾ ئەو ژنەبت پەرستان و ئەو پیاوە بت پرستانە بانگی ئێوە دەكەن بۆلای بێ باوەڕی كەكردەوەی دایشتوانی ئاگرن بەهۆی ژنو ژن خوازی خزمایەتیەوە .

﴿والله يدعوا الى الجنة والمغفرة ﴾وەخوا داوا لە ئادەمیزاد ئەكا بۆلای بەهەشت بۆلای لێخۆش بوون .

﴿ بأذنه ﴾ وە ئەو داوا كردنە بە هۆی دەستورو فەرمانی خوایە وە ئامۆژگاری كردنیان لێرەدا دوو داواكاریان هەیە : ( ١ ) داواكاری بت پەرستان بۆ كارێ كە ئەبێتە هۆی چوون بۆ نێو ئاگرو بێ بەزەیی خوا . ( ٢ ) داواكاری خوای گەورە بۆ بە جێ هێنانی كارێ ئەبێتە هۆی چوون بۆ بەهەشت و لەو بابەتەی دوو هەمە مارەكردنی ژنانی موسڵمان لە پیاوانی موسڵمان مارەبڕینی ژنانی موسڵمان لە و باوەڕەدان بێگومان هەرباوەڕداران وەڵامی داوای خوای گەورە بدەنەوە بگەن بەو شانازیە كە چوونە ناو بەهەشتەوە بە ڕانومایی و یاریدەرانی خوا .

﴿ و يبين اياته للناس ﴾ وە خوا ڕوونی ئەكاتەوە و بەبەڵگە وە فەرمانەكانی خۆی بۆ ئامادەمیزاد كامەیان چاكە و كامەیان خراپە بۆی دیاری كردوون .

﴿ لعلهم يتذكرون ﴾ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ئامۆژگاری وەرگـرن ، هـەموو فەرمانـەكانی خوا بە جێ بهێنن وە سەربكەون بەسەر ئەو شتانە دا خوا داوایان لێ ئەكا كە چوونیانـە بـۆ ناوبەهەشت و بۆلای لێ خۆشبوونی خوا لەوان .

ئەو كارانەی ئێمە ئەیان بینین لە م رۆژەدا لە كوڕان و كچانی ئەم سـەردەمە چاكـترنین لەبێ باوەران و بت پەرستان بە بۆنەی گاڵتـە كردنیـان بـە ئـایین و ئەیانـەوێ خۆیـان لـە سنووری ئایین دەركەن وە بە هۆی پەروەردە كردنی منالەكانیان و نەوەكانیان لەسەر بەبێ بازووەەری و بێ رەوشتی ئیـتر نـازانین چـۆن ژنیـان لێ مـارە بكـرێ ، بـەلام ئەگـەر بـە ڕەواڵەت باوەڕیان نەهێنا بە ئایینی ئیسلام وە ك بێ باوەڕان مامەڵەیانەلەگەڵ ئەكرێ ئەگـەر ڕستەی شایەتمانیان هێنا بە دەم دا ئەو باوەڕە ئەیانپارێزێت لە كوشتن و داراییان ئەپارێزرێت بە ڕەوا دا ئەنرێ ژن و ژنخوازیان و میرات پێ دانیان ئیتر با ئەو باوەڕە هێنانە بـە لاسـایی كردنەوەی باوك و دایكیـان بێـت وە لـە ناوەرۆكیشـدا لاواز بێـت چونكـە ئـەو كارانـە پەیوەندیان بە دەربڕینی باوەڕە بە زبان . لێرەدا كە باسـی ژن خواسـتن و ژن بـە شـوودان كرا وا چاكە بە گشتی باسی چۆنیەتی ژن خواستن و ژن مارەبرین بكـەین لەسـەر ڕێگـەی پێشەواامان شافیعی ڕوكنەكانی ژن مارەبرین (٥) پێنج شتن ، ئەگەر ئەو شتانە نەیەنە جێگە مارەبرین پوچە و دروست نی‌یە :

١) ( الصيغه ) كە بریتی یە لە ( الايجاب ) یانێ پێویست كردن و بەرووەوا دانـان ژن مارەبڕین لە لایـەن ژن مارەكـە رەوە بـە یـەكێ لـە م دوو رسـتەیە : ( انكحتـك ) وە یـا (زوجتك فلانه) یانێ لە تۆم مارە كرد وە یا كـردم بـە هـاو جووتـی تـۆ فـلان كـەس وە (القبول ) لەلایەن ژن خوازەوە كەبلێ ( قبلت نكاحها او تزويجها ) یانێ وەرم گرت لـە تۆ بۆ خۆم مارەبڕین و هاوسەری ئەو ژنە ، وە مەرجە ئیجاب و قبوڵ بەیەكەوە بنووسـین و بە كتوپڕی بە بێ دووا كەوتن ئیتر بە هـەرزمانێ بـێ كـوردی یـا عـەرەبی زیـانی نی‌یـە و دروستە .

٢) ( الولی ) خاوەن و بەرێوەبەری ژن ، باوكیێ ئایا، باپیر، برای بێ یا برازا مام یـا ئامۆزا ئەوانە ژن مارەبڕینیان دروستە . بەو مەرجەی ژن مارە بڕین منالٚ وشێت و گوناهبـار

نەبن ئەو کەسانە ناتوانن ژن مارە ببرن بە کردنی گەناهێکی گەورە یا بەسێ گوناهی بچوك بە گوناهبار دا ئەنرێ وە هەروەها ژن ناتوانێ خۆی مارە ببڕێ وە ئەو کەسەی ژن مارە ئەبڕی ئەگەر نیازی دا بە ستبو بۆ کردنی جەج یا عەمرە ناتوانێ ژن مارە ببڕێ .

باوك و باپیر ئەتوانن کچی خۆیان گەورە بن یا منالّ مارەیان ببڕن بەبێ بەلێن وەرگرتنیان بە و مەرجەی گوناهبار نەبن یا دوژمنایەتی لە نێوان ئەوان و کچەکانیان نەبێ وە لە هاوسەری مارەببرن ، بەلاّم ئەگەر کچەکانیان بێوەژن بن بەبێ بەلێن بۆیان نیە مارەیان ببڕن و پێویستە بالّغ بن وە جگە لە باوك و باپیر بەبێ بەلێن ناتوانن ژن مارە ببڕن کچ بن یا بێوە ژن .

ئەگەر ژن کەسێکی نەبوو مارەی ببڕێ یا مارە بڕەکەی لە دەرەوەی نیشتمان بون بە ماوەی ( ١٦ ) سشانزە کاتژمێر کار بە دەستان ئەتوانن ئەو ژنە مارە ببڕن ، بەلاّم لە پیاوێکی هاوسەری خۆیان .

٣) ( الزوج ) پیاو مەرجە لە پیاودا بۆ ئەی‌وەی مارە بڕینی ژنی بۆ دروست بێ بە ویستی خۆی ژنی بۆ مارە ببڕن نەك بە تەوزمی و ناسراو بێ لای ژن بۆیشی ڕوون بێ ئەو ژنەی بۆ دروستە وە نیازی نەبەستی بە حەج و عەمرە .

٤) ( الزوجة ) ژن مەرجە پیاوەکەی بۆ ڕەوا بێ و ناسراو بێ لای بە حەج و عەمرە نیازی نەبەستبێ وە شایەتەکان بیناسن ژنی کەسی تر و لە عیدەی کەسی تردا نەبێ .

٥) (الشاهدان ) یانێ ئەو دوو کەسەی ئاگاداری مارەبڕینی ژنبن بە و مەرجەی بەندەو گوناهبارو گێل و ژن و بێ باوەڕ و کوێرو کەڕ نەبن . ژن مارەبڕ ناکری بە شایەت هەرچەندە کەسێ تر جێگەی بگرێتەوە بۆ مارە بڕینی ژنەکە .

٦) کاتێ ژنەکە منالّ بوو یا گەورە کچ بوو بەلێنی ئەدا بۆ مارە کردنی یا ژنەکە بێوەژن بوو یا ژن مارەبڕ جگەی باوك و باپیربو پێویستە ژن و ژن خواز و ژن بە شوودەر هاوسەری یەکبن وە هاوسەری بە مانەی خوارەوە دێتە جێ :

ژن و پیاو هیچ کامیان شێت و گوڵ و بەڵەکاوی نەبن پیشەی خۆیـان و باوکیـان وەك یەك وابن وە لە یەك نەتەوەو یەك ڕەگەز بن وە هیچ کام لــە ژن و و ژن خـوازو باوکیـان گوناهبارنەبن ، بەڵام ئەگەر بالّغ بن بۆیان هەیە واز لەو هاوســەری ئـەوان بـهێنن و مـارە بڕینەوە پوچ بکەنەوە .

٧) بەو جۆرەی باسمان کرد کە پێویستە ژن و ژن خواز هاوســەری یـەکبن وە ژن بـە شوو دەرو شایەنتەکان گوناهبار نەبن ئەوانەیش بە گوێرەی فەرموودەی پێشەوا شـافیعی وە ئەوەیش لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر گرانەبێتە دی وە بۆ ئەوەی مارە بڕینەکە دروســتبێ وە بە گوێرەی ڕێگەی شافیعی بێ پێویستە تەقلید و لاسایی و زانایانی دووای پێشەوا شــافیعی بکری بە م جۆرەی خوارەوە :

ا / هەموو یەکی لە ژن و ژن خواز و ژن بە شــوودەرو شایەتەکان بلێــن : بڕوامـان هەیە بە فەرموودەی زانایانی دووای پێشەوا شــافیعی وەك بـەڕێزان عـیزەدین و سـبوکی و ئەزرەعی و نەوەوی و ئیبنوسەلاّح کە فەرموویانە ئەو کەسانە با گوناهبار بن مارە بڕینەکــە دروستە .

ب / بڕوامان بە فەرموودەی زانایانی دووای پێشەوا شــافیعی هەیـە وە فەرموودەیـەکی پێشەوا شافیعی‌یە فەرموویانە شایەتەکانی ژن مارەبڕین با گوناهبار بن مارە بڕینەکە دروستە.

ج / بڕوامان بە فەرموودەی زانایانی دووای پێشەوا شافیعی هەیە ، وەك بـەڕێزان ئیمـام الحرمین و ئیبنوسەلاح فەرموویانە ژن و ژن خواز با گوناهباربن هاوسەری یەکن.

٨ ) ئەو کەسانەی ژن مارە ئەبڕن بە گوێرەی ئەم ڕیــزەی خـوارەوەن یـەك لــە دووای یەك: یەکەمجار باوك ، ئەگەر باوك نەبوو باپیر دووای ئەوان برای بــاوك و دایکـی ، بـرای باوکی ، برازای باوك و مــامی بـاوك و دایـك و مـامی بـاوکی ئـامۆزای بـاوك و دایکـی ئامۆزای باوکی ئەگەر ئەو کەسانە نەبوون وە با لە دەرەوەی نیشــتمان بـوون بـۆ مـاوەی دوری ( ١٦ ) شازدەکات ژێر کار بەدەستان و داد وەران بۆیان هەیە ژن مارە ببڕن .

٩ ) ئەو ژنانە مارەکردنیان قەدەغەیە ئەمانەن : دایك و باوك و دایكی هەتا بەرەو ژوور بڕوا پورو پوری باوك و پوری دایك ، کچ و کچی کوڕو کچی براو کچی خوشك خوشکی باوك و دایك و دایكی شیری ، نەنکی شیری خوشك و کچی برای خوشکی شیری ، خوشکی باوك و خوشکی دایکی شیری ، ژنی کوڕو ژنی کوڕی کوڕ هەتا بەرەو خواربێ ، ژنی باوك و ژنی باوکی باوك و هەتا بەرەو ژوور بڕوات ، دایکی ژن ، کچی ژنێ کچەکەی بەدەست گیرابێ ئەگەرۆ پیاوێ بە نەزانین چووە لای ژنێکی قەدەغەکراو دایك و کچی ئەو ژنە قەدەغە ئەبن لە سەر ئەو پیاوە هەروەها ئەو ژنەیش قەدەغە یە لە سەر باوك و کوڕی ئەو پیاوە .

١٠ ) دووژن ئەگەر یەکێکیان بە پیاو دانرێ قەدەغە بن لەسەر یەکتری ئەو دووژنە قەدەغەیە کۆبکرێنەوە لە ژێر مارەبڕینیان بۆ پیاوی بە یەکەوە وەك خوشکی باوك و خوشکی دایك لەگەڵ کچی براو کچی خوشك وە کۆبوونەوەی دووو خوشك لە یەك کات دا ئیتر ئەو ژنانە شیری بن یان پشتی بن .

١١ ) وە زۆرتر لە چوار ژن قەدەغەیە وە ئەگەر پیاوبێ ژنەکەی خۆی تەڵاق دا سێ بە سێ ئەو ژنە ی لەسەری قەدەغە ئەبێ هەتا پاش عیدە شو ئەکا بە پیاوێ تر و بچێتە لای و ئەویشس تەڵاقی بدا و عیدەی بڕوا ئەو کاتە ئەگەر مێردە پێشووەکە ی ویستی مارەی بکا پێویستە سەر لە نوێ بە تازەیی مارە بکرێتەوە بۆی .

١٢ ) هەموو بێ باوەڕان قەدەغەن لە سەر باوەڕداران جگە لە جوولەکە و گاورە خاوەن نامەکان بەو مەرجەی لە نەوەی ئیسرائیل بوون پێویستە نەبووبن بە گاور یان جوولەکە دووای پوچ بوونەوەی ئایینەکەیان وە ئەگەر لە نەوەئیسرائیل نەبوون پێویستە بوبن بە گاورو یا بە جولەکە بەر لە پوچبونەوەی ئایینی جولەیکەو گاور وە ژنی موسڵمان بە هیچ جۆرێ نابێ شوبکا بە بێ باوەڕان وە ژنانی بێ باوەڕان جگە لە جوولەکە و گاور بەو جۆرەی باسکران قەدەغەن لە سەر باوەرداران .

١٣ ) ژن و پیاو هەردوولایان یا یەکێکیان لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕان وە ماوەی عیدەیان موسڵمان نەبوونەوە مارەبڕینەکە پوچ ئەبێتەوە وە کاربەدەستان پێویستە لە سەریان لە یەك جیایان بکەنەوە .

١٤) مارەیی پێویستە بۆ ژنان هەرچەندە لە کاتی مارەبڕینیان ناوی مـارەیی نـەبری لـە پاشان خۆیان دیاری ئەکەن و بۆی دا دەنێن وەك مارەیی خوشك و خزمانی ژنەکە .

جوولـەکەکان و ئاگر پەرستان بە هیچ جـۆرێ نزیکـی ژنـانی حـەیزدار نەئەکـەوتن وە گاوەرەکان ئەچوونە لایان وە عەرەبەکان نان و ئاویان لـەگەڵ ژنانی حـەیزدار نـە ئـەخوارد لـەسەر یەك ژێرە خەرو لـە یەك خانوودا لـەگەڵیان کۆ نەئەبوونەوە بە وێنەی جولـەکـەکان و ئاگر پەرستان بۆ ڕوونرکدنەوەی ئەو مەبەستە هاوڕێکانی پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾ پرسیاریسـان لـە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کرد لـەبەر ئەوەی باسی ژنان کرا وە حەیزیش پەیوەندی بـە ژنانـەوە هەیـە خوای گەورە فەرمووی :

وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾

نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾

﴿ و يسألونك عن المحيض ﴾ وە پرسیار لە تۆ ئەکەن لە حـەیزی ژنـان و لـە جێگـەی حەیز کەواتە ووشەی ( المحيض) یا مصدری میمیە یا ئیسمی مەکانە .

﴿ قُلْ هو اذى ﴾ تۆ بڵێ : حەیز پیسو قێزەونە سروشتی ئادەمیوزاد بێزی لێ دەکاتـەوە وە ئەبێتە هۆی ئازارو نەخۆشی ئەو پیاوانە لە حەیزدا ئەچنە لای ژنەکانیان .

﴿ فاعتزلوا النساء فی المحيض ﴾ دووایی ئێوە کەنارگیربن بۆ ژنەکان لە کاتی حەیزدا و ژن و مێردیان لە گەڵ مەکەن بەڵام جگە لە چونەلایان وەك ماچ و دەست لێ دانیان گوناه نی‌یە .

﴿ ولا تقربوهن حتى يطهرن ﴾ وە ئێوە نزیکی ژنانی حەیزدار مەکەونەوە و مەچنە لایان هەتا پاك ئەبنەوە لە حـەیز و پـاش نـەمانی خوێـن و خۆشـۆردنیان و لـەش پیسـی خۆیـان دەرئەکـەن بـەلای پێشـەوایان شـافیعی و مالیکیـەوە بـەڵام لای پێشـەوا حەنـەفی دووای ڕۆیشتنی زۆرترینی ڕۆژانی حەیز کە بریتی یە لە ( ١٠ ) دە ڕۆژ و دووای نـەمانی خوێـن دروست چوونە لایان بەر لە خۆشۆردن و پاك کردنەوەی لەشی لە حەیز .

لێرەدا وا چاکە لەسەرلا ڕێگەی پێشەوا شافیعی باسی ئەو خوێنانە بکەین پەیدا ئەبن لـە ژناندا بە شێوەیەکی کورت ئەو خوێنانەی ژنان ( ٣) سێ جۆرە خوێنن .

١) خوێنی حەیز : ئەو خوێنەیە لە ژن دێتە خوار بەو مەرجەی تەمەنی ( ٩) نۆ ساڵ یـا زۆرتر بێ وە لە تەندروستی دا بێ بە گوێـرەی بـاوی ژنـان و بـێ هـۆی نەخۆشـی و بـێ منالبون کەمترین ماوەی حەیز شەو ڕۆژێکـە وە زۆرتریـن مـاوەی حـەیز ( ١٥ ڕۆژ و ) ( ١٥ ) پازدە شەوە ، ماوزەیەکی دیاری کراو بۆ نێوان دوو حـەیز نی‌یـە بـە زۆری مـاوەی حەیز شەش یا حەوت ڕۆژە وە خوێنی حەیز زۆر ڕەش و گەرم و ئازار دارە بە زۆری .

بە هۆی حەیزەوە ( ٩) نۆ شت قەدەغەن نوێژکردن ، ڕۆژووگرتن ، خوێندنی قورئـان، هەڵگرتنی قورئان ، چونە نێو مزگەوت و ترسی پیس بوونی ، گـەڕان بـە دەوری خانـەی

خوادا چونەلای ژنان ، خۆشی وەرگرتن بە نێوان ناوك و ئەژنۆی ژنی حەیزدار وەك ژن و مێردی ، تەلاقدانی ژنی حەیزدارو بە و مەرجانەی لە باسی تەلاقدا دێن .

پێویستە ژنی حەیزدار رۆژانی حەیزی مانگی رەمەزان بەسەر بگرێتەوە بەلاّم گەڕانەوەی نوێژ پێویست نیيە ، پێویستە دووای نەمانی خوێن و لەش پیسی دەركردن بێت .

٢) خوێنی پاش منالّبوون ئەو خوێنەی لە دووای منالّبوون پەیدا ئەبێ كەمترین ماوەی خوێنی پاش منالّبوون لە ژنان دا كەمترین ماوەی دیاری نەكراوە ، زۆرترین ماوەی خوێنی پاش منالّبوون ( ٦٠ ) شەست ڕۆژە بە زۆری ماوەكەی ( ٤٠ ) چل رۆژە ئەو نۆ (٩) شتانە لە كاتی حەیزدا قەدەغە كراون لەكاتی خوێنی پاش منالّبوون قەدەغەن ، خوسێنی حەیزو خوێنی پاش منالّ كۆتایی پێ هات ژنان ئەتوانن رۆژو بگرن و تەلاق بدرێن بەلاّم ئەو حەوتەكانی تر هەر قەدەغەن هەتا لەش پیسی خۆیان دەرنەكەن.

٣) ( الأستحاضة ) ئەو خوێنەیە لە ژنا ندا پەیدتا ئەبێ لە جگەی رۆژانی حەیزو خوێنی پاش منالّبون بە هۆی نەخۆشبونەوە پەیدا ئەبێ وە ئەو ( ٩) نۆ شتانە بە هۆی حەیزو خوێنی پاش منالّەوە قەدەغەبوون لەم خوێنەدا قەدەغەنین و لەش پیس ناكەن بەلاّم ژنان پێویستە لە سەریان بۆ هەموو نوێژێ خویان بە پاكی بشۆرن وە لۆكە بە خۆیانا هەلّواسن لە كاتی نوێژ و پێویستە دەست نوێژ بشۆن وە بە گورجی نوێژەكەیان بكەن هەروەك پیاوێ میزی بۆ ڕانەگیرێ .

﴿ فاذا تطهرن ﴾ دووایی كاتێ ژنان پاكبونەوە وە خۆیان شۆرد و لەش پیسی خۆیانیان دەركرد .

﴿ فأتوهن من حيث أمركم الله ﴾ دوایی ئێوە بچنە لای ژنان لەجێگەیەكەوە خوا فەرمانی پێداوە لەپێشەوە نەك لەشوێنی ترەوە ، ئەو كەسەی بچێتە لای ژنی خۆی لەحەیزدا گوناهبار ئەبێ ، پێویستە لەسەری بەگورجی پەشیمان ببێتەوە ، هەروەها قەدەغەیە ژنەكەی خۆی بۆ شل بكا ، واچاكە دینارێ یا نیو دینار بدا بەهەژاران وەك بریتی . ئەوەی

شایانی باسیێ هەموو پزیشکانی سەر زەوی پێك هاتوون لەسەر ئەوەی چوونە لای ژنان لەکاتی حەیزدازیانێکی زۆر گەورەی هەیە بۆ ئەندامی زاوزێ و برینداری ئەکا بەهۆی میکرۆبی حەیزەوە ، سەرئەکێشێ بۆ بنەبڕکردنی منال بوون .

﴿ إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ئەوێ ئەو کەسانەی بەزۆری پەشیمان ئەبنەوە لەگوناهی چونە لای ژنان لەحەیزدا ، بەڕاستی خوا خۆشی ئەوێ ئەو کەسانەی پاکن لەکردنی کاری قێزەون ، ناچنە لای ژنەکانی خۆیان لەکاتی حەیزدا و لەشوێنێکەوە خوا فەرمانی پێ نەداوە و پاکە گوناه نیە .

جولەکەکان ئەیان ووت : ئەگەر کەسێ بچێتە لای ژنەکەی لەپێشەوە و لەلای پشتەوە ئەو ژنە ئاوس بێ و منالی ببێ ئەو منالە خێل ئەبێ ، ئەوەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمەر لە وەلامدا خوای گەورە فەرموی :

﴿ نساؤكم حرث لكم ﴾ ژنەکانی ئێوە جێگەی کشتوکال و چێنانی تۆوی ئێوەن .. خوای گەورە پاش ئەوەی باسی چونە لای ژنانی کرد لەحەیزدا ، ڕونی کردەوە بۆمان چونە لای ژنان تەنها بۆ ئەوە نیە ئارەزوی پیاوەتی خۆتانی پێ ببەنە سەر ، بەلکو بۆ مەبەستێکی تری زۆر گەورەترە کە ئەویش بریتیە لەزاوزێ کردن و منال بوون .

خوا ژنی وەك زەوی دروست کردووە ، هەر وەك زەوی تۆوی تێ ئەکرێ و ئەڕوێ ، دانەوێلەی لێ هەلئەگیرێ ، ژنیش بۆ ئەوەیە تۆوی پیاوی تێ بکرێ و ئاوس ببێ و منالی ببێ ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ فأتوا حرثكم أنى شئتم ﴾ دوایی ئێوە بچنە لای جێگەی کشتوکالتان کە ئەو جێگەیە تۆوی تێدا ئەڕوێ و ئەبێتە هۆی گەشە کردنی ، بەهەر چۆنێ ئارەزوتان بێ ، بەشەو یابەڕۆژ ، لەپشتەوە بێ بۆ پێشەوە یا لەپێشەوە بێ ، بەپێوە بێ یا بەدانیشتنەوە ، لەسەر پشت ڕاکشێ یا لەسەر دەم ، بەو مەرجەی لەجێگەی کشتوکالەوە بێ کە ئەو شوێنەیە خوا فەرمانی پێداوە بچنە لایان و جێگەی سەوز بوونی کشتوکالەکە لەژناندا

جێگەی تۆوی پیاوانە ، بێگومان ئەویش بریتیی لە پێشەوە . خـوا فەرمویـەتی : ﴿ فـأتوهن من حيث أمركم الله ﴾ کە مانای لێدایەوە بە ﴿ نساؤكم حرث لكم ﴾ .

پێشەوەی ژنان وەك زەوی‌یە ، تـۆوی پیـاو وەك دانەوێڵـەی چێـنراوە ، منـاڵیش وەك گیایە.کەواتە گوێ مەگرن بۆ واتەویتەی تاقمێ لەشـیعەکان و کـەمیان کـە بـەنارەوایی و بەبوختان ئەیدەنە پاڵ هەندێ لەزانایانی جگەی خۆیان کە ئـەڵێن : ڕەوایـە چونـە لای ژن لەپشتەوە ، ئەو ووتەیە جگە لەوەی ئەو تۆوە بەبێ بـەر و بەرهـەم و ئـەنجام بـڕوا ئەبێتـە هۆی کەم نرخی ژنان و ئازاردانیان ، دژی فەرمودەی خوایـە ئەفـەرموێ : ئێمـە لـەنێوان پیاوان و ژنـاندا خۆشەویسـتیمان دروسـت کـردووە ، ئەفـەرموی : ژنـەکانتان جێگـەی کشتوکاڵن .بەڵام تاقمێکی تر لەشیعەکان ئەڵێن : بەستنەوەی چونـە لای ژنـان بەجێگـەی کشتوکاڵەوە دژی چونە لای ژن لەپشتەوە کەشایستەی ڕوانی مناڵ نیـە ، هـۆی ئـازار و قێزە و نەخۆشی و گوناهە بۆ پیاوان و ژنان ، زۆرترە لە چونە لای ژنان لەکاتی حـەیزدا . پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ : بی بەشە لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا ئەو کەسەی بچێتە لای ژن لەپشتەوە .

﴿ وقدموا لأنفسكم ﴾ وە ئێوە پێش بخەن بۆ خۆتان چاکە و هیـوای منـاڵ و توێشـوی پاشەڕۆژ و مەبەستی پاداشت ، خۆتان بپارێزن لەداوێن پیسی و کارە قەدەغە کراوەکـان ، مەبەستان لابردنی ئارەزوی پیـاوەتی نـەبێ لەچونـە لای ژنانتـان بـەڵکو زاوزێ کـردن و زۆرکردنی نەژادی ئادەمیزاد بێ .

﴿ وأتقـوا الله ﴾ وە ئێـوە لـەخوا بترسـن لەنـەکردنی فەرمانـەکانی و کـارە قەدەغـە کراوەکان، وەك چونە لای ژنەکانتان لەپشتەوە کەجێگەی کشتوکاڵ نیە .

﴿ وأعلموا أنكم ملاقوهُ ﴾ وەئێوە بەڕاستی بزانن ئێوە بەخزمەت خوا ئەگـەن پاداشـتی چاکە وەرئەگرن و تۆڵەی خراپە وەرئـەگرن ، بـەچاوی خۆتـان ئـەبینن لـەڕۆژی دواییـدا کردەوەکانی خۆتان ، بۆلای خوایش ئەچن .

﴿ وبشر المؤمنين ﴾ وەتۆ مژدە بدە بەباوەڕداران بەبەهەشت و بەرێزگرتنیان لەڕۆژی دواییدا .

خوای گەورە باسی ژن هێنان و ژن بەشوودانی بۆ کردین لەگەڵ باسی حەیزدا ، لەمەودوا باسی سوێند خواردن لەهەندێ کارا ئەکا و باسی تەڵاق دان و جۆنیەتی تەڵاقمان بۆ ئەکا کە هەمویان کارێکی کۆمەڵایەتین و پەیوەندی دارن بەژن و مێردەوە ، ئەگێڕنەوە ئەبوبەکر سوێندی خوارد دەست گیرۆیی مەستەح نەکا چونکە بوختانی کردوە بەعایشەدا ، هەروەها ئەگێڕنەوە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە سوێندی خوارد ناچمە لای بەشیری مێردی خوشکم ، گفتوگۆی لەگەڵ ناکەم ، ئەو خوشکەم ئاشت ناکەمەوە لەگەڵی ، ئەیوت سوێندم خواردوە ، بۆ ئەو کارە خوا ئەفەرموێ :

وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَـٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَـٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾

﴿ ولا تجعلوا الله عرضة لأيمانكم ﴾ وە ئێوە مەگێڕن خوا بەئامادە و نیشانە و هۆ بۆ سوێنەکانتان .

﴿ أن تبروا وتتقوا وتصلحوا بين الناس ﴾ کە ئێوە چاکە بکەن لەگەڵ خزم و دۆستەکانتان کە ئێوە خۆتان بپارێزن لە سەردان و هامەشۆی خزمەکانتان ، چاکە کردن و ئاشتەوایەتیتان لەنێوان ئادەمیزادا ، یانی سوێندەکانتان بینە کۆسپ لەبەردەمتان بۆ چاکە و نزیك بوونەوەتان و ئاشتەوانیتان لەگەڵ ئادەمیزادا بەتایبەتی خزمەکانتان .

﴿ والله سميع عليم ﴾ وە خوا هەموو گفتوگۆیەك و سوێندەکانتان ئەبیسێ ، ئەزانێ بەوەی لەدڵتانایە و بەنیازەکانتان ئەزانێ .

﴿ لايؤاخذكم الله باللغو في أيمانكم ﴾ خوا سزای ئێوە نادا بەهۆی شتێ بەبێ مەبەست و بە بێ هودە لەسوێندەکانتانا ، هەرچەندە واچاکە سوێندی بێ هودە و بێ سوود بەکار نەیەرن ،سوێندی بێ هودە لای پێشەوا حەنەفی ئەوەیە مرۆڤ سوێند بخوا و بە گومانی خۆی وابزانێ ڕاست ئەکا کەچی لەناوەڕکدا درۆبێ .. بەلای پێشەوا شافیعی سوێندی بێ سوود و بێ هودە ئەوەیە بەبێ هۆشی و بێ مەبەست بەسەر زار و زمانی کەسێکا بێت و بلێ : نەبەخوا ، هیچ نیازێکی نەبێ ، ئەو ڕووداوە بەزۆری لەکاتی کار و ئیشی ئادەمیزادا ئەبینرێ ، بەهەر جۆرێ مانای ئەو ڕستەیە بکری سوێندی بێ هودە لای هەردوو پێشەوا پێویستی بەبریتی نیە (الكفارة) .

﴿ ولكن يؤاخذكم بما كسبت قلوبكم ﴾ وە بەڵام خوا ئەتان گرێ و سزاتان ئەدا بەشتێ دڵی ئێوە کردبێتی و مەبەستی بوبێ بیکا ، وەك ئەوەی سوێند بخۆن چاکە ئەکەن یا خراپە ئەکەن لەوکاتەدا کارەکەتان کرد و یان نەتان کرد ، سوێندەکانتان کەوت پێویستە بریتی بۆ بدەن ، یا ئێوەسوێند بخۆن ئەو کارەتان کردوە بیش زانن نەتان کردووە، یا ئەو کارەمان نەکردوە کەچی بزانن کردوتانە ئەو سوێندەتان کەوتووە ، پێویستە برریتی بۆ بدەن .

لەسورەتی ( المائدة ) دا و لەئایەتی (٨٩) دا بەدرێژی باسی چۆنێتی بریتیمان بۆ ئەکا خوای گەورە یارمەتیمان بدا .

﴿ والله غفور حليم ﴾ وە خوا بەزۆری لەبەندەکانی خۆش ئەبێ بەتایبەتی لەسوێندی بێ هودە و بێ مەبەست ، خوا زۆر لەسەر خۆیە و پەلە ناکا سزای ئەو کەسانە بدا سوێند بەگشت دڵیان بخۆن ، سوێندەکەیان ئەخەن.

**بۆزانین** : دروست نیە سوێند بەجگەی خوا ، وەك ببێژرێ بەخانەی خوا ، بەپێغەمەر بەسەری باوکم و بەگۆڕی دایکم و بەسەری فلان پیاو خوا ، ئەو سوێندانە دانە بەسترێن و بریتی لەسەریان نیە و خراپە سوێندیان پێ بخورێ .

بت پەرستان بەر لەهاتنی ئایینی ئیسلام هەرکاتێ داوای شتێکیان بکردایە لە ژنەکانیان و نەیاندایە بەوان سوێندی ئەخوارد نزیکت ناکەمەوە بۆ ماوەی ساڵێ یازۆر تر ، ئەو ژنەی واز لێ ئەهێنا بەجۆرێ نەبێوەژن بونە خاوەن مێرد ئەو ژنە هەژارە توشی زیان و تەنگەچەڵەمە و شتی تر ئەبو . موسڵمانانیش لەسەر ئەو کارە مابونەوە ، بۆیە خوای گەورە بۆ لابردنی ئەو شتە و گەشە کردنی داد پەروەری ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە :

﴿ للذين يؤلون من نسائهم تربص أربعة أشهر ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە سوێند ئەخۆن لەژنەکانیان کەنەچنە لایان چاوەڕوان کردنیان چوار مانگ بۆ چونە لای ژنەکانیان .

﴿ فأن فاءوا فإن الله غفور رحيم ﴾ دوایی ئەگە پیاوەکان گەڕانەوە لەسوێندەکانیان و سوێندەکانیان شکاند بەچونە لای ژنەکانیان لەماوەی چوار مانگدا ، دوایی بەڕاستی خوا لێ خۆشبونی زۆرە بۆ گوناهباران بەتایبەتی ئەو کەسانە سوێندەکانیان بشکێنن ئەچنە لای ژنەکانیان ، زۆر میهرەبان و خاوەن بەزەییەکە بەڕەوای دانا وە سوێندە کانیان بشکێنن و بچنە لای ژنەکانیان و بریتی سوێندەکانیان بدەن بەر لەڕۆیشتنی چوار مانگ بریتی دانەکەی . ئەگەر پیاوێ نەی توانی بچێتە لای ژنەکەی بەدەم بەڵێنی گەڕانەوەیدا .

**تێبینی** : ئەگەر پیاوەکە خۆی ژنەکەی تەڵاق نەدا تەڵاقێکی ژنەکەی ئەکەوێ پیاوەکە ناتوانێ ژنەکە بگێڕێتەوە بۆلای خۆی لای پێشەوا حەنەفی ، چونکە ئەو تەڵاقە ( بائینەیە ) . بەڵام لای پێشەوا شافیعی ژنەکە بۆی هەیە داوابکا لەمێردەکەی یا بیگێڕێتەوە و بچێتە

لای یا بەرەلای بکا ، ئەگەر تەلاقی نەدا ژنەکە بڕواتە لای قازی ، فەرمانبەران تەنگ بەمێردەکەی هەڵچنن و بۆ ئەوە یاژنەکەی بەرەڵا بکا یا بیگێڕینە ، ئەگەر سەر پێچی کرد قازی تەلاقێکی ژنەکەی بدا ، پیاوەکە بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی بەمەرجێ دوای تەلاقدانی قازی تەلاقێ یا دوو تەلاقی مابێ ، واتە تەلاقدانی قازی ( رجعیه) . خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ وإن عزموا الطلاق فإن الله سميع عليم ﴾ دوایی ئەگەر بڕیاری تەواوی تەلاقدانیان کرد و تەلاقی ژنەکەی دا ، دوایی بەڕاستی خوا ئەبیسێ هەموو شتێ بەتایبەتی بەرەڵا کردنی ژن ، ئەزانێ بەهاوردن و بردنی ووتو ویژ لەنێوانیانا .

ئەزانێ چ شتێ لەدڵیاندایە لەچاك و لەخراپ بەتایبەتی سوێند خۆر چ شتێ لەدڵیدایە. ئەو دوو وشەیە هەڕەشەیە لە سەر بەردەوام بوون لەسەر نەگەڕانەوەی سوێند خۆران ، لەبیرمان نەچێ سوێندێ پێویستە بریتی بۆ بدرێ بەخوا و بەسیفاتی خوا بێ .

بەگوێرەی ڕێگەی پێشەوا شافیعی باسی سوێند خواردنی مێرد ئەکەین بۆ نەچونی لای ژنەکەی بەکورتی : ڕوکنەکانی سوێند خواردن ( الأيلاء ) شەش شتن :

١- سوێند پێ خوراو : مەرجە سوێند پێ خوراو پێویستە بەناوی خوا یا سیفەتەکانی خوا بێ. یانێ بەژنەکەی بڵێ : بەخوا یا بەنامەی خوا دروست نابم لەگەڵتا .

٢- سوێند لەسەر خوراو : کەبریتی‌یە لە چونە لای ژن . ئەگەر مێرد بەژنەکەی ووت: جگەی چونەلات ڕابواردن و ماچ و دەستبازیت لەگەڵ ناکەم ، سوێند خواردن لەسەر ئەوانە پێ ناوترێ (الأيلاء ) یانی سوێند خواردن .

٣- ماوەی چونە لای ژن : پێویستە ئەو ماوەیە تێپەڕبکا لەچوا مانگ . واتە بلێ بەخوا هەرگیز یا زۆر تر لەچوار مانگ نایەمەلات .

٤- ( الصيغه ) یانێ ڕستەیەکی وا چونە لای ژن بگەیەنێ ، وەك بلێ : بەخوا نایەمە لات لەگەڵت دروست نابم .

٥- سوێندخۆر: پێویستە مێردی ژنبێ، لەوانە بی چوونە ی ژنی لێی بوەشێتەوە منالْ و شێت و زۆر لێ کراوانە بێ و شەرم گەی نەبڕابی و شلەیە پەتەنەبێ.

٦- ژن: مەرجە ئەو ژنە لەوانەبێ شایانی چونە لابێ منالْ نەبێ، چونەلای لە تواناادا بێ بۆشایی ژنەکە بە گۆشت بابە ئێسك نەگیرابێ.

ئەو پیاوە سوێند خۆرە وازی لێی ئەهێنرێ بۆ ماوەی چوارمانگ، پاش چوار مانگ ئەگەر پیاوەکە نەچوە لای ژنەکەی بەبێ بیانو، ژنەکە داوای لێی بکا بگەڕێتەوە بۆ چونە لای، ئەگەر نەچوەلای داوا لە قازی بکا بۆچوونە لای با بەرەلاکردنی و تەنگە تاوی بکا، ئەگەر ئەو شتانەی نەکرد قازی مۆڵەتی شەوو ڕۆژێکی ئەدا، دووایی تەلاقێکی ژنەکەی ئەدا تەلاقەکەیشی (رجعیە) یانێ مێرد ئەتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە بە مەرجێ تەلاقێ یا دوو تەلاقی مابێ. ئەگەر پیاوەکە سوێندی بەخوایا بەسیفەتەکانی خوای خوارد بوو چوەلای ژنەکەی پێویستە بریتی بۆ سوێندەکەی بدا. بە ئارەزووی خۆی یەکێ لەم سێ شتانە هەڵبژێری: ئازادکردنی بەندەیێکی موسڵمانی خاوەن توانا بۆ کارکردن. یا بەخشینی (٦٧٩) شەش سەدو حەفتاو نۆ گرام گەنم یا برنج یاخورمایا خواردەمەنی تر بۆ ژەمێ خواردنی هەژاران بدرێ بە (١٠) کەس ، یا ڕۆژو گرتنی سێ ڕۆژ، ئەو باسی سوێند خواردنە لە نامە دەستوریەکاندا بە درێژی باسی کراوە، ئەتوانرێ تەماشایان بکرێ یا پرسیار لە زاناکان بکرێ.

لەبەر ئەوەی سوێند خواردن بۆ چونەلای ژن سوێندەو تەلاقیشی تێدایە خوای گەورە پاش باسەکەی بە ڕوون کراوەیی باسی تەلاقی ژنانمان بۆ ئەکا بە هەموو جۆرەکانیەوە ئەسمای کچی زیدی کوڕی ئەلسەکەن لە یاریدەرانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ تەلاقدرا لەوکاتەدا تەلاقدرا عیدەی نەئەژمارد ، بۆیە خوای گەورە فەرمووی:

وَٱلْمُطَلَّقَـٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَـٰثَةَ قُرُوٓءٍۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَـٰحًاۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾

﴿ وَالْمُطَلَّقاتُ يَتَرَبَّصنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ ﴾ وە ژنە تەڵاقدراوەکان چاوەڕوان بکەن بە هۆی خۆیانەوە (٣) سێ قورء، دووایی ئەو ژنە ئەتوانێ شوبکا، بەمەرجێ ئەو ژنانە مێردەکانیان چوبنە لایان، وە تەمەنیان لە (٩) نۆساڵ کەمتر نەبێ، ئاوسیش نەبێ لە شۆردنی حەیز نەکەوتبن، وە ئەو ژنانە کۆیلە نەبن.

(قرء) لای پێشەوا حەنەفی بەمانا حەیزەکە واتە لای ئەو پێویستە ئەو ژنە تەڵاق دراوەکان پاش تەڵاقدانیان سێ حەیز بشۆرن ئەنجا ئەتوانن شوێی تر بکەن. بەڵام لای پێشەوا شافیعی (قرء) بە مانا پاکێتیە کەواتە ژنی بەرەڵاکراو پێویستە (٣) سێ پاکی ببینێ، بە ڕوونی لای پێشەوا شافیعی لە بارەی ئەو سێ پاکیە باس ئەکەین: ئەو ژنانە ئەگەر لە کاتی پاکیدا بەرەڵاکران پێویستە بۆکۆتایی پێ هاتنی عبدەکەیان لە (٣٢) سی و دوو ڕۆژ دوچرکە کەمتر نەبێ، بۆ ئەو ژنانە لە حەیزدا بەرەڵاکرابن پێویستە بۆکۆتایی پێ هاتنی عبدەکەیان لە (٤٧) چل و حەوت ڕۆژو دووچرکە کەمتر نەبێ.

﴿ وَلایَحَلُ لَهُنَّ أنْ یَکْتُمْنَ ما خَلَقَ اللهُ فِي أرْحامِهِنَّ ﴾ وە ڕەوا نیە بۆ ژنان کە بشارنەوە شتێ خوا دروستی کردووە لە منالّ دانیان، وەك منالّ یا حەیز بۆ ئەوەی پەلە بکەن بۆکۆتایی عیدەکانیان و پوچ کردنەوەی گەڕانەوەیان بۆلای مێردەکانیان. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە ئەوە بوو ئیسماعیل کوڕی عەبدولّای غەفاری ژنەکەی خۆی بەرەلّاکرد لەسەردەمی پێغەمبەردا ﴿ ﷺ ﴾ نەیزانێ ژنەکەی ئاوسە لە دوایدا بۆی دەرکەوت و گێڕایەوە بۆلای خۆی، دووایی ژنەکەی خۆیی و منالّەکەی مردن. ئەو ژنە ڕوداویی ئاوسی خۆی پەنهان دابوو.

﴿ إنْ کُنّ یؤْمِنَّ باللهِ وَالْیومْ الآخِرِ ﴾ ئەگەر ئەو ژنانە بڕوایان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەو ڕستەیە هەڕەشەیەکی یەکجار توندە بۆ قەدەغەکردنی شاردنەوەی فەرمانەکانی خوا، بە تایبەتی شاردنەوەی ژنان ئەو شتەی لە منالّدانیایایە، پێویستە لەسەری بە دانیشتوانی ڕابگەیەنێ.

لێرەدا کە باسی بەرەلّاکردنی ژنمان بۆکرا پێویستە باسی تەلّاق دەرو تەلّاقدراوو هەموو بەشەکانی تەلّاق بکەین. تەلّاق یانێ بچڕاندنی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، بۆ ئەوەی تەلّاقدان جێگەی خۆی بگرێ پێویستە ئەمانەی خوارەوەی تێدابێ و تەلّاقدەر ئەم مەرجانەی تێدابێ:

١- بالّغبێ تەمەنی لە پازدە سالّ کەمترنەبێ، یا ئاویی مرۆڤایەتی لێ پەیدا ببێ.

٢- زۆر لێ کراو نەبێ، ئەو کەسەی هەڕەشەی کوشتن یان هەڕەشەی لێدانی سەخت و برینی ئەندامێکی و تالّان کردنی دارایی بکرێ، بۆتەلّاقدانی ژنەکەی تەلّاقی ناکەوێ.

٣- پێویستە تەلّاقدەر ژیربێ، شێت و بێ هۆشوو خەوتوو بێ ئاگا لە خۆنەبێ ئەگەر ئەوانەی تێدابوو تەلّاقی ناکەوێ. بەلّام سەرخۆشی دەستان قەست تەلّاقی ژنەکەی بدا لای شافعیەکان تەلّاقی ئەکەوێ.

ژنی تەلّاقدراو پێویستە بەم جۆرەی خوارەوەبێ:

ژن و مێردی لە نێوانیانا مابێتەوە ئیتر مێردەکەی چوبێتەلای یانە. ژنێ مێردەکەی بە دەستی نەگرتبێ ئەگەر ئەو ژنە تەڵاق بدرێ تەڵاقەکەی ئەکەوێ بەبائینە واتە تەڵاقی تری پێوە نالکێ، ئەگەر تەڵاقێ یا دوو تەڵاقی مابێتەوە مێردەکەی ئەتوانێ سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە، هەروەك ئەو ژنە ئەتوانێ شوبکا بەیەکێ تر بەبێ چاوەڕوون کردنی عیدە.

وە ئەگەر ژنەکە بە دەست گیرابوو بەبێ پارە مێردەکەی تەڵاقی داو تەڵاقی بە تواوی نەکەوتبوو مێردەکەی ئەتوانێ ئەو ژنە بگێڕێتەوە بۆلای خۆی. بەو جۆرەی بڵێ: ژنەکە من تۆم گێڕایەوە بۆلای خۆم. وە ئەگەر ژنێ هەر سێ تەڵاقی کەوتبو پێویستە ئەو ژنە پاش عیدە شوبکا بە پیاوێی ترو ئەو پیاوە بچێتەلای و دووایی تەڵاقی بدا، ئەو کاتە مێردە پێشوەکەی ئەتوانێ پاش عیدە سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە. وە ئەگەر پیاوێی ژنەکەی خۆی لەسەرپارە تەڵاقداو ژنەکە کتوپڕ قبوڵی کردوە یا یەك تەڵاقی داو نەی گێڕایەوە بۆلای خۆی هەتا عیدەی بەسەرچوو لەم دوو جۆرەدا سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە بەو مەرجەی ژمارەی تەڵاقی مابێتەوە یەك یا دوو تەڵاق. بەشەکانی تەڵاق:

١- ﴿ الطلاق الرجعي ﴾ ئەو تەڵاقەیە بەبێ پارە تەڵاقێ یا دوو تەڵاقی ژن بدرێ، عیدەی بەسەر نەچوبێ، مێردەکەی ئەتوانێ لەو جۆرانەدا ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی بەبێ مارە بڕینی تازە.

٢- ﴿ الطلاق البائن ﴾ ئەو تەڵاقەیە ژن و مێر لەیەك بچڕابن، ئەو تەڵاقە دوو جۆرە:

أ- بائینەی بچوك : ئەو تەڵاقەیە کەوتبێ لەسەر پارە ، یا بەبێ پارە کەوتبێ و عیدەی کۆتایی هاتبێ ، ژمارەی تەڵاق مابێتەوە، ئەو ژنە قەدەغەیە لەسەر مێردەکەی هەتا سەر لەنوێ مارەی نەبڕێتەوە.

ب- بائینەی گەورە : ئەوەیە ژن بەیەکجار یا سێ جار تەڵاق بدرێ لەو کاتەدا وەك باسکرا پێویستە مێردێ تر بکا ، پاش تەڵاق و عیدە مێردە پێشوەکەی ڕەوایە مارەی بکاتەوە .

٣- ﴿ الطلاق المنجز ﴾ ئەو تەلاقەیە بۆ کەوتنەکەی بەهیچ شتێك و بەهیچ کاتێکەوە نەبەسترابێ ، بەو جۆرە مێرد بەژن بلێ : تەلاقت یا تەلاقی کەوتبێ ، یا تۆم یا ئەوم تەلاقدا.

٤- ﴿ الطلاق المعلق ﴾ ئەو تەلاقەیە بەشتێکەوە یا بەکاتێکەوە بەسترابێ ، وەك مێرد بلێ : ئەگەر چویتە دەرەوە یا چوی بۆ بازاڕ ، یا بەیانی سەری مانگ تەلاقت یا تەلاقی کەوتبێ هەتا ئەو شتە یا ئەو کاتە نەیەتە دی تەلاقەکە ناکەوێ .

٥- ﴿ الطلاق السنّي ﴾ ئەو تەلاقەیە لەسەر ڕێگەی پێغەمبەر بێ ﴿ﷺ﴾ وەك ئەو تەلاقەی لەکاتی پاکی ژندا یا لەپاکیەکا مێردەکەی نەچوبێتە لای تەلاق درابێ لەو کاتانەدا ژن توشی درێژی عیدە نابێ .

٦- ﴿ الطلاق البدعي ﴾ ئەو تەلاقەیە بەگوێرەی ڕێگەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەبێ ، وەك ژن تەلاق بدرێ لەکاتی حەیزدا یا لەو پاکیەدا تەلاق بدرێ مێردەکەی چوبێتەلای ، یا تەلاقی درابێ سێبەسێ ، ئەو تەلاقانە چاك نین یا قەدەغەن ، چونکە ئەبنە هۆی درێژ بونەوەی عیدە یا پەشیمان بونەوەی بێ ئەنجام و بێ سود .

﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذلك ﴾ وەمێردەکانیان شایان ترن بۆ گەڕانەوەی ژنەکانیان لەکاتی چاوەڕوان کردندا لە شو کردنیان بەیەکێ تر لەکاتی عیدەدابێ گەڕانەوەیان .

﴿ إن أرادوا إصلاحاً ﴾ ئەگەر مێردەکانیان بیانەوێ بیانگێڕنەوە بۆ چاك کردنی ژنەکانیان و دۆستایەتی نێوانیان بەخۆشی بژین بەیەکەوە . نەك بەمەبەستی ئازاردانی ژنان و زیان پێ گەیاندنیان . وەك لەسەرەتای ئیسلامدا ژنیان بەڕەجعی تەلاق ئەدا ، کەمێ بەر لەکۆتایی پێهاتنی عیدە ئەیان گەڕاندنەوە بۆ لای خۆیان دووبارە تەلاقیان ئەدایەوە و ئەیان گێڕایەوە هەروەهەمەبەستیان ئازاردانی ژنان بوو نەك چاك کردنیان .

﴿ ولهنَّ مثل الذي عليهنَّ ﴾ وەبۆ ژنان هەیە بەسەر پیاوانەوە لەمافا وێنەی ئەو مافەی ئەوتۆ پیاوان هەیانە بەسەر ژنانەوە.

﴿ بالمعروف ﴾ بەگوێرەی جۆری یاسا لای خراپ نەبێ ، بەگوێرەی باوی ناسراوی جێگە بێ هەتا بەژیانێکی خۆش و هاوڕێتی شیرین بژین بەیەکەوە . مافی مێرد بەسەر ژنەوە ئەوەیە گوێڕایەڵی پیاو بێ و ئاگای لەناموسی خۆی و پیاو بێ بازنەی داوێن پاکی بپارێزێ ، ڕەوشتی خۆی نەڕوشێنێ و نەیخاتە ژێر پێ ، مافی ژن بەسەر مێردەوە ، ئەوەیە بەڕێز و نرخەوە تەماشای بکا ئەو شتەی ئاین دیاری کردووە پێی ببەخشێ .

﴿ وللرجال عليهن درجة ﴾ وە بۆ پیاوان هەیە بەسەر ژنانەوە پلە و پایەی بەرز و زۆرتر بەسەر ژنانەوە ، وەك پێویستە پیاو مارەیی بدا بەژن و بەخێوی بکا ، پیاو دوو ئەندازەی ژن ئەبا لەمیراتا ، تەلاق دان وگەڕانەوەی ژنان بە دەست پیاوانە ، بوون بەپێغەمەر و کاربەدەستی تەواو بۆئادەمیزاد بۆ پیاوانە .

﴿ والله عزيز حكيم ﴾ وەخوا زۆربەتوانایە بەسەر بونەوەراندا ، هیچ کەسێ بۆی نیە خراپەی لێ بگرێ ،تۆڵە لەو کەسانە ئەکاتەوە بێ فەرمانی ئەکەن ، بەتایبەتی ئەو پیاوانەی ئازاری ژنان ئەدەن ، زۆر زانایە بەگوێرەی زانین کاری خۆی ئەکا بۆ هەموو بونەوەران ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و ئەو شتەی ئەیکا چاکەی ئادەمیزادی تێدایە.

ئیسلام بۆ سەربەستی ژنان پێش هەموو ئاین و دەستور و یاسایە کەوتوە بە ( ١٤٢٠ ) هەزار و چوارسەدو بیست ساڵ لەمەوبەر . ژنان بەر لەئیسلام وەك کالا و ئاژەڵ تەماشا ئەکران ، ئەکڕرانو ئەفرۆشران ، زیندە بەچاڵ ئەکران ، بەم نزیکانە لەئەوروپا و ئەمەریکاهەر بەو شێوەیە بوون . هەرچەندە ئیسلام لەهەندێ شت پیاو و ژن وەك یەك دانەنراون ئەوەیش جیاوازی‌یەکی کەمە و سرروشتیە بۆ سودی ئادەمیزاد کەواتە لەئەقڵ و دادپەروەریەوە دوورە ژن و پیاو یەکسان بن لەهەموو ڕویێکەوە چۆن ئەبێ ئەو کەسانە خۆیان ماندوو ئەکەن بەمۆدێلی کراس و تەنورە و پێلاوی تازە بابەتەوە ، خۆیان هەڵئەکێشن بەچاککردنی قژ و سوور کردنی لێو و نینۆك و هەڵگرتنی برۆ و خۆڕوت کردنەوە وخۆپیشاندانیان بەپیاوانی بێگانە وەك ئەو کەسانە بن هەست بەلێپرساوی بکەن

بۆ ژیانی ژنان و منالاّن و باری گرانی بەردەوام هەڵگرن لەبەر خۆیان و ئەوان و هەموو ئادەمیزاد ، هەرچۆنێ بێ ئاینی ئیسلام بیرو باوەڕی خۆی ڕون ئەکاتەوە ژن و پیاو لەم شتانەی خوارەوەدا جیاوازن :

١. خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە .
٢. قەدەغەیە بۆ ژن لەگەڵ مێردی خۆی نەخەوێ ، چونە دەرەوەی‌نیشتمان بەبێ پرسی مێردەکەی ، دەرچون لەخانوی پیاو بەبێ ئاگاداری مێرد قەدەغەن .
٣. تەلاّق دان و گەڕاندنەوەی ژنان بۆ لای پیاوان دوای تەلاّق کەوتنی بەدەستی پیاوانە نەك ژنان .
٤. نوێژی هەینی پێویست نیە لەسەر ژنان .
٥. کاربەدەستی گشتی و دادوەری بۆ ژنان نابێ . بەلاّم لای پێشەوا حەنەفی بۆ کاروباری دارایی و مافی ئادەمیزاددروستە ژنان کاریان بدرێتە دەست ، نەك بۆ کاروباری خوایی وەك دادوەری سنوور ( الحدود ) وەسەرۆکایەتی گشتی.
٦. بۆ ژنان قەدەغەیە پێشەوایی ژنان بۆ نوێژی پیاوان .
٧. لەجگەی دارایی دا شایەتی دانی ژنان قەدەغەیە . بەلاّم شایەتی ژنان بۆ منالّبون و حەیزی ژنان و هوەموو کارێ پەیوەندی بەژنانەوە هەبێ دروستە بەژمارەی چوار ژن یا دوو ژن و پیاوێ ، وەك شایەتی دووژن و پیاوێ دروستە بۆ دارایی .
٨. لەمیراتا پیاوان دوو بەش و ژنان یەك بەشیان هەیە .
٩. پێویستە ژنان هەموو ئەندامی خۆیان دەرنەخەن بۆپیاوانی بێگانە جگەی دەست و ڕوومەت لەکاتی پێویستدا .
١٠. جەنگ کردن بۆ بەرژەوەندی ئاینی ئیسلام پێویست نەکراوە لەسەر ژنان ، هەروەها پیتاك لەسەر ژنانی بێباوەڕ پێویست نەکراوە بیدەن بەموسولّمانان ، لەکاتی جەنگدا ناکوژرێن مەگەر جەنگ بکەن .

هەروەها لەهەندێ شتی تردا ژن و پیاو یەکسان نین لەو ئایەتەی پێشوودا خوای گەورە باسی ( الرجعة ) یانی گەڕانەوەی مێردژنەکەی بۆلای خۆی پاش تەلاّق دانی بۆ

کردین کەواتە بەکورتی باسی گەڕانەوەی ژنان بکەین ، بابزانین ڕوکنـەکانی گەڕانـەوەی ژنان (٣) سێ شتن :

١- { الصبقه } ئەو ڕستەیە گەڕانەوە بەو پێك دێ ، وەك ئەوەی پیاو بلێ بـەژن تـۆم هێناوە بۆ لای خۆم ، تۆم گێڕایەوە بۆ ماوەی سالێ . هەروەها واچاکـە دوو پیـاو ئاگـای لەو گەڕانەوە هەبێ ، چونە لای ژنانی تەلاق دراو بەرەجعی و ڕابواردن لـە گەلّیا قەدەغەن هەتا بەهۆی ئەو ڕستانەوە نەی گێڕنەوە ، ئەو کەسەی بچێتە لای ئەو ژنـە بـەڕەوای دانـێ پێویستە بەند بکرێ یا تەمێ بکرێ بەلێدانێکی کەم .

٢- { المرتجع } یانێ ئەو کەسەی ژن ئەگێڕێتەوە بـۆ لای خـۆی : مەرجـە ئـەو پیـاوە شایانی ئەوەبێ قبولّی مارە بڕینی ژن بکا بۆ خۆی ، بـەئارەزوی خـۆی بـێ نـەك زۆری لێ بکرێ بۆ گەڕانەوەی ژن ، سەرخۆشی دەستیان قەست نەبێ ، بەندەو گێـل نـەبێ ، نیـازی بەحەج و عەمرە نەبەستبێ ، ئەو کەسەی سەرپەرشـتی شـێتی بەدەسـتە وەك بـاوك و باپـیر ئەتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای مێردەکەی ، هەروەها کە قبولّی مارە بڕینی بۆ کردووە.

٣- ژنی گەڕاوە : پێویستە ژنی ئەو پیاوە بێ ، مێردەکـەی چوبێتـە لای ،ناسـراوبێ ، شایانی مارە بڕینبێ ، وەرنەگەڕابێ لەئاینی ئیسـلام ، بـەخۆڕایی تـەلاق درابـێ ، ژمـارەی تەلاقی سێ‌بەسێ تەواو نەبوو بێ .

بۆ کۆتایی عیدە بەحەیز ژن سوێند ئەدرێ بەمەرجێ تەواو بونەکەی بسـەلمێنرێ ، هـەر کاتێ ژن ووتی : عیدەم تەواو بووە بەمنالّبوون بۆ وەرگرتنی ئەو داوایە پێویسـتە منالّەکـە پەیدا بوبێ لەپاش شەش مانگ و دوو چرکەبە مەرجێ منالّی تەواوی گیان بەبەراکراو بێ ، بۆ منالّی وێنەی کێشراوبێ پێویستە پاش (١٢٠) سەدو بیست ڕۆژ و دووچرکە بێ ، بـۆ گۆشت پارە (٨٠) هەشتا ڕۆژ و دوو چرکە ، بۆ ژنی لـەپاکیدا تـەلاق درابـێ داواکـەی ئەسەلمێنرێ بلێ : عیدەم بەحەیز تەواو بـووە (٣٢) سـی و دوو ڕۆژ و دوو چرکـە تـەواو

کردبێ . لە حەیزدا تەلاّق درابێ پێویستە (٤٧) چل و حەوت ڕۆژ و دوو چرکەی تەواو کردبێ . بۆ باسی گەڕانەوەی ژن بەشی کراوەیی تەماشای نامە یاساییەکان بکەن .

مێرد بەر لەئاینی ئیسلام ئەیتوانی ژنی خۆی تەق بدا بەگوێرەی ویستی خۆی با سەد جاریش بوایە ، هەر بەژنی ئەمایەوە ، چونکە بەر لەتەواو بوونی عیدەی ژن ژنەکەی ئەگێڕایەوە بۆ لای خۆی ، دوایی تەلاّقی ئەداو ئەی گێڕایەوە ، هەروەها هەتا پیاوێ بەژنەکەی خۆی ووت :نەئەهێلّم تەلاّقت بکەوێ ، نەئەت کەمەوە بەژنی خۆم بەیەکجاری، بۆ ئەو ڕوداوە ژنەکە چووە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕوداوەکەی گێڕایەوە بۆی ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دەنگی نەکرد هەتا خوا گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە و فەرموی:

ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

﴿ الطلاق مرتان ﴾ تەڵاق بەگوێرەی دەستور گەڕانەوەی ژن لەودابێ : دوو جارە، تەڵاق بەر لەئاینی ئیسلام ژمارەکانی دیاری نەکرابوو ، ژن ئەگەر تەڵاقی بکەوتایە مێرد مافی ئەوەی هەبوو ژنی تەڵاق دراو بگێڕێتەوە بۆلای خۆی بەر لەتەواو بونی عیدە ، بەئارەزوی خۆی تەڵاقی ژنی ئەدا چەندین جار و ئەی گێڕایەوە بۆ لای خۆی بێگومان ئەو کارە ئەوپەڕی زیانی ژنانی تێدا بوو .

﴿ فإمساك بمعروف ﴾ دوایی مێرد ژنە تەڵاق دراوەکە بهێڵێتەوە بەگەڕانەوەی بۆی خۆی دووجار پێش تەڵاقدانی سێهەم جار ، بەخۆشی بژین بەیەکەوە .

﴿ أو تسريح بأحسان ﴾ یابەرەڵای بکا بەشێوەیەکی شیرین ومافی خۆی بداتێ بەتەواوی وازی لێ بهێنێ هەتا عیدە ئەڕوا ، دوایی ئەگەر ژنی تەڵاق دراو کە ویستی ئەتوانێ مێردی تر بکا ، بۆ مێردە پێشوەکەی نیە و قەدەغەیە هەتا مێردی ترنەکاو عیدە بڕوا کەواتە ئەو ڕستەیە بەتەلاقی سێهەم دائەنرێ.

بەجۆرێ تر مانای ئەو ڕستانە کراوە ﴿ فأمساك بمعروف ﴾ دوایی ژنەکە بگێڕێتەوە بۆلای خۆی و بەخۆشی بژین بەیەکەوە ﴿ أو تسريح بأحسان ﴾ ، یاواز لێ بهێنێ دوای ئەو دوو تەڵاقە هەتا عیدە ئەڕوا ، پێویستە لەسەر مێرد هەر مافێکی ژنەکە لەلایەتی بیداتەوە ، پاش پچڕانیان لەیەکتری توانجی خراپ نەگرێتە ئەو ژنە ، ڕێگەی پێ نەگرێ ئەگەر ویستی مێردێ تر بکا .

﴿ ولا يحل لكم أن تأخذوا مما أتيتموهنَّ شيئاً ﴾ وەڕەوا نیە بۆ ئێوەی پیاوان کەئێوە وەربگرنەوە شتێ ئێوە بەخشیوتانە بەژنان هیچ شتێ لەمارەیی و جگەی مارەیی .

هۆی پەیوەندی ئەم ڕستەیە بەڕستەی پێشەوە ئەمەیە : کەخوا فەرمانی داوە بەبەرەڵاکردنی ژنان بەچاکی بۆ مانی ڕون ئەکاتەوە لەچاکە کردنە لەگەڵ ژنان ئەو مارەیی و پێخەف و پۆشاکە دراوە بەژنان لەوانی وەرنەگرنەوە دوای تەڵاق دانیان . ئەوەیش لەوەوە هاتووە سابیتی کوڕی قەیس ژنەکەی داوای تەڵاقدانی لێکرد ، سابیت ووتی : ئەو

باخچەیە کردو مەبەمارەی بۆت بۆم بگێڕەوە هەتا تـەڵاقت بـدەم ، بۆیـە ئـەو ئایاتـە هاتـە خوارەوە ، فەرموی : هەرچیتان داوە بەژنان ڕەوا نیە داوای بکەنەوە لـەکاتی تەڵاقداندا .

﴿ إلاّ أن يخافا ألاّ يقيما حدود الله ﴾ مەگەرکە ژن و مێرد بترسـن کەڕانـە سنورەکانی خوا بەگوێرەی فەرمودەی خوا و بەچاکی بەیەکەوە نەژین .

﴿ فان خفتم ألاّ يقيما حدود الله ﴾ دوایـی ئەگـەر ئێـوەی کاربەدەسـت و دادوەران ئەترسان کەژن و مێرد ڕاناگرن سنورەکانی خوا هەتا بژین بەیەکەوە بەخۆشی و ڕێز گرتـن لـەیەکتری.

﴿ فلا جناح عليهما فيما أفتدت به ﴾ دوایی هیچ گوناهێ لـەسەر ژن و مێرد نیە لـەشتێ ژن خۆی ڕزگار بکا بەو شتە لـەمارەیی و جگـەی مـارەیی ، بـۆ مـێرد ڕەوایـە ئـەو شـتە وەربگرێ وەك ئەو ڕوداوەی نێوان سابیت و ژنەکەی .

﴿ تلك حدود الله ﴾ ئەو فەرمانانەی باسکران لـەنیکاح کردنی ژنان و سوێند خواردن بۆ نەچونە لای ژنان و تەڵاقدان و ڕزگار کردنـی ژن خـۆی بەهـەر شـتێ بـێ سـنور و یاسای خوان .

﴿ فلا تعتدوها ﴾ دوایی ئێوە لامەدەن لـەو سنورانە و دژیان مەوەسـتن نەبـەکردەوە و، نەبەگفتوگۆ .

﴿ وَمَن يتعدَّ حدود الله فأولئك هم الظالمون ﴾ وەهەرکەسـێ تێپـەڕبکا لـە سـنورەکانی خوا و بەجێگەی خۆیانیان نەگەیەنێ بەگوێرەی یاسا ، دوایـی ئـەو کەسـانە هـەر ئەوانـەن ستەمیان لـەخۆیان کردووە ، خۆیانیان خستۆتە بەر سزای خوا .

لـەو ئایەتەدا خوا باسی تەڵاقی سێبەسێ و تەڵاقدانی ژنی کرد بەپارە و ڕزگـار کردنـی خۆی ، تەڵاقدانی ژن بەپارە پێی ئەوترێ : {الخلع} یانی دارنینی ژن و مێرد لـەیەکتری.وەیا (الأفتداء) یانێ ڕزگارکردنی ژن خۆی بە پارە، بۆیە پێویسـتە بـە کورتـی باسـی چۆنیـەتی هەردوولایان بکەین:

١- باسی تەڵاقدانی ژن سێ بە سێ: ئەگەر مێرد بە ژنی خۆی ووت: سێبەسێ تەڵاقت کەوتبێ. یا لەیەك جێگەدا بە ژنەکەی ووت: تەڵاقتکەوتبێ. تەڵاقت کەوتبێ. تەڵاقت کەوتبێ. ئایا بەو ڕستانە سێ تەڵاق ئەکەوێ یا یەك تەڵاق. زانایان لێرەدا ئەکرێن بە چوار بەشەوە:

**یەکەمیان:** هەندێ لە زانایان ئەڵێن: بەو ڕستانە تەڵاق ناکەوێ. نەسێ تەڵاق، نەیەك تەڵاق، چونکە ئەڵێن: تەڵاق بەو شێوەیە پاش پێغەمبەر پەیدابووە، یانێ (بدعە) هەموو بیدعەیە فرێ ئەورێ و کاری پێ ناکرێ. ئەو ڕێگەیە بۆچوونی ڕافزیەکانە پێویستە ئیشی پێ نەکرێ و پوچەڵبێ، چونکە سێ بە سێ تازە پەیدا نەبووە هەتا گوێی لێی نەگیرێ. بەڵکو هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە کاری پی کراوە، وەك پێشەوا شافعی و ئەبو سەورو ئەحمەدو کۆمەڵی لە زاهیریەکان ئەڵێن: بێگومان تەڵاقی سێبەسێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کاری پێ کردووە، فەرمانی داوە بە کەوتنی. یانێ (سنة) نەك (بدعة) بەڵگەیان ئەم فەرمودانەی خوارەوەیە، وەك ئەفەرموێ ﴿ فأنْ طَلَقها فَلا تَحّلُ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتّی تَنْکِحَ زَوْجاً غَیْرَهُ ﴾ فەرموی ﴿ وَإِنْ طَلَقْتُموهُنّ مِنْ قبل أنْ تَمَسُوهُنّ ﴾ فەرموی ﴿ وَلا جُناحَ عَلَيْكُمْ إن طَلَقْتُم النّساءَ مالَمْ تَمسوهُنّ ﴾ فەرمووی ﴿ وَلِلْمُطَلّقاتِ مَتاعٌ بالْمَعْروفِ ﴾ وە فەرمووی ﴿یاأیُها الذِینَ امنوا إنْ نَکَحْتُمْ الْمُؤمِناتِ ثُمَ طَلَقتموهُنَ مِنْ قَبْلِ أنْ تَمَسُوهُنَ ﴾ لەو هەموو ئایەتانەدا خوای گەورە باسی تەلاقدانی ژنانی کردووە بە بلاّویی، وەباسی جیاوازی نێوان تەڵاقی سێبەسێ بەیەك ڕستە یا یەك یەك بەسێ جاری نەکردووە بۆیێمە دروست نیە ئەو شتەی خوا فەرمانی پێ نەدابێ بیکەین لە کۆکردنەوەی تەڵاق بەیەك ڕستە یابچڕانیان لەیەکتری بەیەك تەلاق یا زۆرتر. بەلام فەرمودەو کردەوەی پێغەمبەر مانا و مەبەستی ئەو ئایەتانەی بۆ ڕوون کردوینەتەوەو وەك پێشەوا موسلیم و بوخاری ئەڵێن: بەبێ گومان عومەیری ئەلعەجلانی ژنەکەی خۆی تەلاقدا سێبەسێ لەسەردەمی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ ئەگەر قەدەغە بوایە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بێ دەنگ نەئەبوو. کەواتە تەڵاقی سێبەسێ پاش

پێغەمبەر پەیدا نەبووە، دووبارە پێشەوا بوخاری لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوەو، ئەویش لە عایشەوە: پیاوێ ژنەکەی خۆی تەڵاقدا سێبەسێ، شوی کرد بە پیاوێ تر، پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئایا ڕەوایە بۆمێردە پێشوەکەی؟ فەرمووی هەتا نەچێتە لای و خۆشی لە یەکتری نەچێژن ئەگەر تەڵاقی ئەو پیاوە سێبەسێ نەکەوتبایە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەو فەرموودانەی نەئەفەرموو، هەر بە وێنەی ئەو بەڵگانەی پێشوو چەند فەرمودەیە تری پێغەمبەر هەن کە بەڵگەی بێگومانن لەسەر پەیدابوونی تەڵاقی سێبەسێ و کەوتنیان. تەماشای﴿ زاد المیعاد ﴾ بکەن بۆ ئەو مەبەستە.

**دووهەم:** هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: تەڵاقی سێبەسێ یەك تەڵاقی ڕەجعی پێ ئەکەوێ. کەواتە مێرد بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی بە مەرجێ ژمارەی تەڵاق تەواو نەبوبێ. ئەم ڕێگەیە لە ئیبنوعەباس و ئیبن ئیسحاقەوەو لە تاووس و عەکرەمەوە ئەی گێڕنەوە، ئیبنو تەیمیە پەیڕەویی ئەوانی کردوە، دوانزە ئیمامیەکان کاری پێ ئەکەن. هەروەها یاسای دادگاکانی زوربەی زۆری ڕژێمەکانی موسڵمانەکان سەپاندو یانە بەسەر دانیشتوانی خۆیانا، سزای ئەو کەسانە ئەدەن لە دژی ئەو یاسایە بڕۆن بە پێچەوانەی ئاینی ئیسلام کە هەموو کەس ئەتوانێ ڕێگەیە بۆخۆی دانێ لە ڕێگەی موسوڵمانان بە مەرجێ دژی بنچینە و بەڵگەی بێگومانی دەستوری ئایین نەبێ.

**سێهەم:** هەندێ لە زانایانی تر ئەڵێن: تەڵاقی سێبەسێ بۆژنێ مێردەکەی نەچوبێتە لای سێبەسێ تەڵاقی ئەکەوێ. ئەگەر ژنەکە بە دەست گیرابێ یەك تەڵاقی ئەکەوێ بە بیری من ئەگەر مێرد سێجار تەلاق دووپات بکاتەوە کەوتنی یەك تەلاق جێگەی بڕوایە ئەگەر مەبەستی بەهێزکردنی ڕستەی پێشوبێ. ئەگینا سێ تەڵاقی ئەکەوێ، ئەگەر بەیەك جار سێ تەڵاق کۆبکاتەوە کەوتنی سێ تەلاق جێگەی باوەڕی منە.

**چوارەم:** بەلای زوربەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ وە بەلای زانایانی دووایی ئەوان هەروەها بەلای هەر چوار پێشەوایان مالیك و شافیعی و حەنەفی و ئەحمەد ژن هەرسێ

تەڵاقی ئەکەوێ لە کاتێکا مێرد بە ژنی خۆی بڵێ: هەرسێ تەڵاقت کەوتبێ،یا سێ‌جار تەڵاق دووپات بکاتەوە بمەرجێ ئەو سێ جارە پەیوەندیان بە یەکەوە نەبێ، ئەگەر دووجاری دوایی دووپات کردنەوەی جاری یەکەمبێ یەك تەڵاق ئەکەوێ. بەڵگەی ئەو زانایانە بۆ کەوتنی هەرسێ تەڵاقەکە ئەمانەی خوارەوەن جگە لە ئایەتەکانی قورئان بەو جۆرەی باسمان کرد.

١- دارە قوتنی لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە تەڵاقێکی ژنەکەی خۆی دابوو، ژنەکە لە حەیزدا بوو لە دووا پێداویستی دوو تەڵاقەکەی تری بدالەو حەیزەدا، ئەو ڕووداوە گەیشتە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی: ئەی کوڕی عومەر خوا بەوجۆرە فەرمانی پێ نەداوی، ئەوەی ڕاستی بێ ڕێگەی منت وون کردووە، پێویستە لەهەر پاکییەکدا تەڵاقێکی بدەی، فەرمانی پێ‌دام گەڕانمەوە بۆلای خۆم، لە کۆتاییدا بە پێغەمبەرم ووت: ئەگەر من سێ‌بەسێ تەڵاقی بدەم و بڵێم: سێ‌بەسێ تەڵاقت کەوتبێ ئەتوانم بیگێڕمەوە، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی: نە ئەو ژنە بە یەکجاری لەتۆ جوێ ئەبێتەوە، گوناهباریش ئەبێ.

٢- نسائی ئەگێڕێتەوە لە مەحمودی کوڕی لەبید: پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئاگادارکرا لە پیاوێ ژنەکەی خۆی تەلاق دابوو بەسێ تەڵاقە، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەتوڕەییەوە هەڵسا و فەرموی : ئێوە گاڵتە بەنامەی‌خوا ئەکەن و من هێشتا ماوم لەناوتانا،لەو ڕوداوەدا پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمانی بەگەڕانەوەی ژنەکەی نەدا ، هەر وەك فەرمانی دا عەبدوڵای کوڕی عومەر بۆ گەڕانەوەی ژنەکەی کەوا بۆ سێ بەسێ تەڵاق ئەکەوێ . ئەو دوو فەرمودانەی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ باسکران بەڵگەی بێگومانن لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێ‌بەسێ بەیەکجار ، بەڵام مێردەکانیان گوناهبار ئەبن .

٣- ئەبو داود لەسونەتی خۆیا ، شافیعی لە ئومدا ئەگێڕنەوە کەڕەکانەی کوڕی عەبدویەزید ژنەکەی خۆی سوهەیمەی ئەلمزە نیەی تەڵاق دا بەیەکجاری {البتـە}

هاتەخزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و وتی : بەڕاستی سوهەیمەی ژنی خۆمم تەڵاق دا بەیەکجاری، سوێندم بەخوا یەك تەڵاقم مەبەست بووە ن پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی : تو خوا یەك تەڵاقت مەبەستبووە ، ڕەکانە ووتی یەك تـەڵاقم مەبەستبوە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ژنەکەی دایەوە ، لەپاشا لەسەردەمی عومەر دا تەڵاقی تری دا ، لەکاتی عوسمان دا تەلاقەکەی تری دا، ئەو فەرمودەی پێغەمەرە بەڵگەی بێگومانە لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێبەسێ بەیەك جار، ئەگینا ڕووداوی ڕەکانە بەبێ سوود دەرئەچێ کە سوێندی خوارد یەك تەڵاقم مەبەست بووە ، داواکردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەڕەکانە سوێند بخوا یەك تەڵاقم مەبەست بووە بەڵگەیە لەسەر ئەوە تەڵاقی سێبەسێ بەیەك جار ئەکەوێ . هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتـە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر کەوتنی تەڵاقی سێبەسێ بەیەك ڕستە.

٤- بەزۆری هاوەڵانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ وەك ئیبنو عەباس، ئیبنو مەسعود ، عوسمان و عەلی ، عایشـە ، عـەبدوڵای کـوڕی عومـەر ، ئەبوهورەیـرە، ئەنەسـی کـوڕی مـالیك و ئەلموغەیرەی کوڕی شوعبە لەسەر ئەوەن تەڵاق بەووشەی سێبەسێ تەڵاقت کەوتنی هەمو سێ تەڵاقەکە ئەکەوێ بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- موجاهید ئەگێڕێتەوە ئەڵێ : لای ئیبنـو عـەباس بـوم پیاوێ هـات بۆلای ووتـی: بەڕاستی ژنەکەی خۆمم تەڵاقدا وەسێبەسێ ، ئیبنو عەباس بێدەنگ بوو هەتا وام گومان برد ژنەکەی ئەداتەوە ، لەپاشا ووتی : یەکێ لـەئێوە سـواری گێلی خـۆی ئـەبێ لەدوایدا دێت و ئەڵێ کوڕی عەباس ، فەرموی خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ ومن یتق الله یجعل له مخرجاً ﴾ ئەو کەسەی لەخوا بترسێ ڕێگەی دەرچوونی بـۆ دروست ئـەکا . تـۆ لەخوا نەترسـاوی ، منیش ڕێگـەم بۆنادۆزرێتـەوە ، گونـاهی پەروەردەکـەری خۆتـت کردووە ، ژنەکەت لەتۆ جیا بۆتەوە ن یانی فڕی پێوەنەماوە .

ب- هەروەها ئەگێڕێتەوە پیاوێ لای عوسمانی کوڕی عەففان ووتـی : ژنەکـەمم تـەڵاق داوە بە سـەد جار عوسمـان فـەرموی : بەسێ تـەڵاق ژنەکـەت لێ قەدەغـە ئـەبێ (٩٧) دوژمنایەتیە .

جـ- ئەگێڕنەوە پیاوێ چووە لای ئیبنو مەسعود ووتی : بەڕاستی ژنەکەی خۆمم تـەلاق دا بەهەشت تەلاق ، فەرموی: چیان پێ وتوی؟ ووتی : پێم بێژراوە ئـەو ژنـە لـەتۆ جـوێ بوەتەوە ، فەرموی : وەك ئەوەوایە پێت بێژراوە .

د- ئەگێڕنەوە پیاوێ چووە لای عەلی کوڕی ئەبوتالیب ووتی : ژنەکەمم تەلاق داوە بەهەزار تەلاق ، عەلی فەرموی : ئەوژنەت لێجوێ بوەتەوە بەسێ تەلاق .

ئەوانەی باسکران و زۆرتریش لەوانە پڕبەپڕ هاوار ئەکەن کـە هـاوەڵانی پێغەمـەر پێـك هاتوون لـەسەر ئەوەی تەلاق بەووشەی هەر سێ تەلاق سێ تەلاق ئەکەوێ . ئەوەی ڕاستی بێ ناکۆکی لەو ڕوەوە لەهاوەڵانی پێغەمەرەوە نەزانراوە ، هەروەها لەهیچ کامیانەوە دژی ئەوانەی پێشوو پەیدا نەبووە .

ئەو کەسانەی ئەڵێن : تەلاقی سێبەسێ بەیەکجار ، یا بەسـی جـار لـە لەیـەك جێگـەدا تـەلاقێکی ڕەجعـی ئەکـەوێ بەڵگـەیان ئەمانـەی خوارەوەیـە و وەڵامیشـیان ئەدرێتـــەوە یەکەیەکە:

١- فەرمودەی خوای گەورە ﴿ الطلاق مرتان فأمساك بمعروف أو تسريح بأحســان ﴾ هۆی بەڵگەیشیان ئەمەیە کە خوای گەورە تەلاقی لەم ئایەتەدا دەست پێکردووە بەهاوملی جارێك لەپاش جارێ نەك بەیەك جار کەواتە بۆمانی ڕوون ئەکاتـەوە تـەلاقێ مـێرد بتوانـێ ژنی خۆی بگێڕێتەوە دوو تەلاقە بەو مەرجەی لەدوای یەکبن ، ئەوەیش مانای وایە بەیـەك ووشە و بەیەك جار یەك تەلاقی ڕەجعی ئەکەوێ و وەڵامی ئەو بەڵگەیانە دراوەتەوە بەوەی ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کۆکردنەوەی دووتەلاق دروسـتە بەووشـەیەکی تەنـها ، ووشەی ﴿ مرّتان ﴾ بەمانای { أثنتان } یە، یانی تەلاقێ گەڕانەوەی تێدا بـێ دوو تـەلاقن . بەوێنەی فەرمودەی خوا ﴿ نؤتها أجرها مرتين ﴾ یانی ئێمە ئەبەخشین بەو ژنە پاداشتەکەی بەدوو پاداشت ، قورئانی پیرۆز هەندێکی مانای ئەوی تری ئـەکا ، ئەگـەر مانـای ئەوانـە ئەوەی ئەوانیش بگرێتەوە هیچ ڕێگەیە نیە بۆ دیاری کردنی هیـچ لایـەکیان نـەك ئـەوەی

تریان . کەواتە ئەو شتەی بکرێ بەبەلگە فەرموودەی پێغەمەرە ، فەموودەی ئەو ئەوە ئەگەیەنێ بەیەك جار سێ تەلاق ئەکەوێ وەك باسکرا .

٢- بەلگەیە تریان ئەمەیە ئیبنو عەباس فەرمویەتی : تەلاق لەسەردەمی پێغەمەردا و لەکاتی‌ئەبوبەکردا و ، دووساڵ لەسەرەمی عومەردا تەلاقی سێ‌بەسێ یەك تەلاق بوو لەدوایی دا عومەر ووتی : ئادەمیزاد پەلەئەکەن لەو شتانەدا پێویستە لەسەر خۆ و هێدی بن لەوانەدا ، ئەگەر ئێمە ئەوەی ئەوان بڕەوێنین بۆ ئەوەی سێ تەلاقیان بکەوێ چاکترە لەوەی یەك تەلاقیان بکەوێ ، عومەرفەرمانەکەی ڕەواند وسەپاندی بەسەریانا بۆ کەوتنی تەلاقی سێ‌بەسێ ، یانی بەلای ئەوانەوە ئادەمیزاد لەوەو بەر تەلاقی ژنەکانیان ئەدا سێ‌بەسێ بەیەك تەلاق دائەنرا ، لەسەردەمی پێغەمەر و سەردەمی ئەبوبەکر و بەشێ لەسەردەمی عومەردا ، لەدواییدا عومەر ئەو تەلاقەی بەکۆششێ خۆی کردی بەسێ تەلاق . ئەلێن : چونکە عومەربۆی دەرکەوت گاڵتە و یاری بەتەلاق ئەکەن ، تەلاقی ژن بەسێ تەلاقە بەیەك جار پەرەی سەند ، بۆیەعومەر بۆ سوودی گشتی و تەمێ کردنیان فەرماتی دا بەکەوتنی هەرسێ تەلاقەکە بەدژی ئەوانەی پێشەوەی خۆی . ئەلێن هاوەلانی پێغەمەریش ئەوکارەیان بەپەسەند زانی ، بەلام بۆ ئەوەی ئەو کارە بگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی خوی و سەردەمی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ سەر لەنوێ دوای عومەر بڕیاردرا ئەو فێلە بنەبڕ بکرێ ، تەلاقی سێ بەسێ هەر یەك تەلاق بکەوێ نەك سێ تەلاق .

وەلامی ئەو بڕیارەیشیان دراوەتەوە بەوەی چۆن ئەچێتە ئەقلەوە تەلاقی سێ‌بەسێ بەگوێرەی فەرمانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ وەڕواژنی ئەبوبەکر و ماوەیەکیش لە سەردەمی عومەردا یەك تەلاقبێ کەچی عومەر و هاوەلانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەپێچەوانەی فەرمانی ئەو کەسانەی پێشو بلێن : سێ تەلاقی پێ ئەکەوێ ؟ ئەو کەسانەی ئەو جۆرە پروپاگەندانە بۆ سوودی خۆیان بلاو ئەکەنەوە ، زۆرریش لەڕاستیەوە دوورە چونکە لەوەو بەر بەفەرمودەکانی پێغەمەر و هاوەلەکانیمان بۆمان ڕوون کردنەوە تەلاقی سێ بەسێ هەر سێ

تەلاقی پێ ئەکەوێ ، کەواتە چۆن ئەبێ کۆششی عومەر دژی فەرمودەی پێغەمەر بێ ﴿ﷺ﴾ کەوا بوو پێویستە مانای ئەو ڕووداوە بەجۆرێ بکرێ لەگەڵ فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و واتای ئیبنو عەباس ڕێك بکەوێ ، فەرمودەی عومەریش دژی فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نەبێ ، مانای ڕوداوی عومەر بەم شێوەیە بکرێ :

یانی ئەو تەلاقەی لەسەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و ئەبوبەکردا باو بوە کەیەك تەلاقی پێ بکەوێ بە یەك تەلاق ، پیاوان ژنیخۆیانیان تەلاق بدایە ئەیان ووت : تەلاقت کەوتێ ، سێ جار ئەیان ووتەوە ، موسوڵمانان لەو سەردەمەدا مەبەستیان دووپات کردنەوەی تەلاقی پێشوو بوو ، نەك تەلاقی تری سەربەخۆ ، بڕوایشیان پێ ئەکرا لە مەبەستەکەیاندا، چونکە دڵێکی پاك و سروشتێکی بێگەردیان بوو. بەڵام عومەر و هاوەڵانی تری پێغەمەر بینیان سروشتی ئادەمیزاد گۆڕاوە ، زۆرربەشیان مەبەستیان تەلاقی سەربەخۆیە لەووتنی ڕستەکاندا ، نەك دووپات کردنەوەی ووشەی یەکەم ، بۆیە داوای مرۆڤەکانی وەرنەئەگرت کە مەبەستیان دووبارەکردنوەیە ، مەگەر لەیەکێکەوە کە ئەقڵی بەجیاوازی ئەنجامی مەبەستی تەلاقی سەربەخۆ و تەلاقی دووبارە و دووپات کردنەوە بشکێ ، ئەو کارەیش بیر و بۆچون ووردەکاری عومەرە کەبەچاکی لەدانیشتوان تێگەیشتووە ، بۆیە بەتێکڕایی هاوەڵانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بڕیاریاندا پشتی ئەو بڕیارەی عومەریان گرت .

بەوانەی پێشوو بۆمان دەرکەوت ئەوەی جێگەی بڕوابێو ڕاستبێ کۆکردنەوەی تەلاقی سێ بەسێ لەیەك ڕستەدا هەرسێ تەلاقەکەی پێ ئەکەوێ .

کەواتە ئەو یاسایانەی ئێستا کاریان پێ ئەکرێ ، بڕیار ئەدەن لەسەر کەوتنی یەك تەلاق دەرچوونە لەبیروڕای زۆبەی یاساناسانی ئیسلام لەهاوەڵانی پێغەمەر و پاش ئەوان ڕێگەی هەر چوار پێشەواکان . کاربەدەستان لەلاسایی کردنەوەی دوازدە ئیمامیەکان بۆ کەوتنی تەلاق ئەو کاتە دوو بەرەکی بو ئێستا کردیان بەسێ بەرەکی بگرە زۆرتریش ، بەیاسای کەوتنی یەك تەلاق هەزاران دوکانی جادوگەری پەیدا بروە بەو بەڵگەیە پول و

پارەی زۆر لەدانیشتوان ئەکێشنەوە بۆ ئەوەی ڕوکەشی یاسا بەسەر خۆیانا دابڕن ، ژن وخاوەن ژن فریو بدەن بۆ گەڕانەوەی ژنەکانیان ، وە پەلاماری دادگای کاربەدەستان نادەن بۆئەوەی تووشی بی ئابڕووی نەبن، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەترەوە دانیشتوان بە جۆری ترهەندێ جادوگەران ئەیانەخەڵەتێنن بە بوچ کردنەوەی مارە بڕینە پێشوەکە بەرتیلیان لێ وەرئەگرن، ژنەکەیان سەر لەنوێ بۆمارە ئەبڕنەوە هەندێکیش ژنەکانیان بۆجاش ئەکەن.

وە ژمارەیەکی کەم لە موسڵمانانی ڕاستی، واز لەو ژنە تەڵاقدراوانە دێنن، بێ ئەوەی بڕوبیانوو دروست بکەن و ئازاری ژنان بدەن. کەواتە ئەوەی شایانی سودی گشتی بێ ئەوەیە پەیڕەویی فەرمانی پێغەمبەرو هاوەڵانی بکەین کە کەوتنی هەرسێ تەڵاقە بە وتنی ڕستەی: سی بەسێ تەڵاقت کەوتبێ ئەکەوێ.

خوای گەوە فەرمانی داوە ژمارەی تەڵاقی پیاو بەسەر ژنەوە سێ تەڵاقبێ، هەرچەندە دوورستە بەیەك جاری سێ تەڵاقی ژن بدرێ. بەڵام وا چاکە هەریەك تەڵاق بدرێ، وە بەلای زۆرترینی زانایانەوە بەیەك جار تەڵاقی سێبەسێ قەدەغەیە هەرچەندە تەڵاقەکان ئەکەون، وە پێویستە دادگاکان و زانایان ڕێگە بگرن لە تەڵاقی سێبەسێ. وە خوای گەورە تەڵاقی بەیەك تەڵاق دانەناوە لەبەر سودی ئادەمیزاد چونکە وائەبی مرۆڤ ناچار ئەبێ تەڵاقێکی ژنەکەی بدا، لە پاشا هۆش ئەکاتەوە کە نالەباری کردوە، وە توشی گیروگرفتی زۆربووە، پەشیمان ئەبێتەوە، ئەگەر یەك تەڵاق بوایە کار لە کار ئەترازا، بۆیە خوای بە میهرەبان تەڵاقی کردووە بە سێ تەڵاق، هەتا پاش یەك تەڵاق بیا دووجار ئەگەر بە خۆڕایی بوو بەر لە کۆتایی هاتنی عیدە ژنەکەی جارێ یا دووجار بگێڕێتەوە بۆلای خۆی، وەپاش عیدە جارێ یا دووجار بەر لە کەوتنی سێ تەڵاق ژنەکەی سەر لەنوێ مارە ببڕێتەوە بە مارەیێکی تازەوەو دوای بەڵێن وەرگرتن لە ژنەکە. پاش ئەو گەڕانەوەیە بۆ لای مێرد ژن ومێرد خۆیان ماندو بکەن و ئارام بگرن بۆئەوە بە چاکی بەیەکەوە بژین. بە پێچەوانەوە

بۆیان دەرکەوت جوێ بوونەوەیان چاکترەو ڕەواترە بۆ ڕزگار بوونیان لەو تەنگ و چەڵەمەیە، خوای گەورە ڕەوای کردووە تەڵاقی سێهەم بدرێ، هەتا ژن ومێرد هەریەکەیان هاوەڵێ تری شیاو بۆخۆیان بدۆزنەوەو بە خۆشی بژین بەیەکەوە بۆ جارێ ترخێزانی تری تازەی بەختیار پێك بهێنن. کەواتە بۆمان دەرکەوت دانانی ژمارەی تەڵاق بەسێ تەڵاق، وە تەڵاق دانیان بەسێ جار ئەوپەڕی میهرەبانی خوایە لەگەڵ ئادەمیزاد وە دووبارە باسی تەڵاق دانی ژن بە پارەو بەشتی تر ئەکەین بەم جۆرەی دووایی: تەڵاق دانی ژن بەپارەو شتی تر پێی ئەوترێ (الخلع) واتە داڕنینی پەیوەندی نێوان ژن ومێرد بە پارەو بە ڕستەیە مانای بچڕانی ئەو پەیوەندیە بگەیەنێ.

و ڕوکەنەکانی خولع پێنچ شتن:

١- (الصیفه) یانێ ئەو ڕستەیە خولعی پێ پەیدا ئەبێ، ئەوەیە مێرد بە ژنەکەی خۆی بڵێ:

﴿ خالعتك أوقادیتك أو طلقتك أو بارئتك بمأة دینار ﴾ یانێ من تۆم داڕنییا پەیوەندی تۆم بەخشی یا تۆم ڕزگارکرد یا تۆم بەرەڵاکرد بەسەد دینار. ژنەکەیش کوتوپڕ بڵێ: قبوڵم کرد، بەم ڕستانە تەڵاق ئەکەوێ بەسە دینار. وە ئەگەر ئەو ڕستانە ناوی پارەی تێدا نەبرا. بەڵام لە دڵی مێردا هەبوو بە پارە بێ تەڵاقەکە ئەکەوێ بە ئەندازەی مارەیی هاوسەری ئەو ژنە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەگەر خولع بە ووشەی تەڵاق نەبوو ژمارە تەڵاق کەم ناکا.

٢- (الزوج) مێرد مەرجە ئەو مێردەی ژن تەڵاق ئەدا بە پارە تەڵاقدانی دروستبێ مناڵ و شێت و زۆر لێی کراونەبێ، گێل و بەندە خولع کردنیان دروستە. بەڵام ئەبێ کاربەدەستەکانیان پارە کە وەرئەگرن.

٣- (العوض) پارەو شتی تر، هەر شتێ بکرێ بە مارەیی دروستە خولع لەسەر بکرێ، ئیتر زۆربێ یا کەم، قەرزبێ یا حازر، لەبەر چاوبێ یانە وەك فێرکردنی قورئان، تەڵاق دان بە ئارەق ئەکەوێ بە ئەندازەی مارەیی هاوێنەی ژن.

٤- ئەو ژنەی تەلاق ئەدرێ بە پارە پێویستە پەیوەندی بەو پیاوەوە مابێتەوە کەواتە ژنی تەلاقدراو بە ڕەجعی و عیدەی تەواونەبۆبێ خولع دروستە.

٥- (الملتزم) ئەو کەسەی خولع ئەگرێتە گەردنی خۆی وەك ژن یا مرۆڤێ تر، مەرجە کوتو پڕ ژن یا ئەو مرۆڤە بلێ: قبولم کرد، شێت و منالْ و گێل نەبن، بە کورتی مێرد بلێ بە ژن تۆم خولع کرد یان تۆم تەلاق دا، وەیا بەو مرۆڤە بلێ: ژنەکەی خۆمم خولع کرد یا تەلاقم دا بەسەد دینار ئەوانیش بەبێ دواکەوتن بلێن: قبولم کرد، لەو کاتەدا ژنەکەی تەلاقی ئەکەوێ مێردەکەی پارە وەرگرێ یانە وە لە پاش عیدە ئەتوانی مێردێ تری تازە بکات قەرزای پارەی مێردەکەیە، ئەگەر تەلاقی سێبەسێ نەکەوتبوو ئەتوانرێ جارێك یان دووجار لە مێردە پێشوەکەی مارە بکرێتەوە بە مارەیی تازەی ترەوە.

**تێبینی:** ئەگەر کەسێك تەلاقی خوارد، ووتی، سێبەسێ تەلاقی ژنەکەم کەوتبێ ناچم بۆ مالی خەزورم. یا ئەو خانووە ناکرم، وە، سوێندخۆر ویستی ئەو کارانە بکا. بۆ ڕزگارکردن لە نەکەوتنی سێبەسێ بە ژنەکەی خۆی بلێ: تەلاقێکت کەوتبێ بە چواردینار ژنەکەیش کوتوپڕ بلێ: قبولم کرد، لە پاشا بچێ بۆ مالی خەزوری یا خانوەکە بکرێ لە دوواییدا سەر لەنوێ ژنەکەی مارە ببڕێتەوە بە مارەیی تری تازە، دوو تەلاقی ئەمێنێتەوە وە ئەیشتوانێ نەچێتە مالی خەزوری و یا خانوەکە نەکرێ. ژنەکە مارە بکاتەوە واچاکە ئاورێ بۆ پێشەوە بدەینەوە کە باسی تەلاقی سێبەسێمان کرد بە یەك ڕستە:

١- ئەوەی ڕاستی بێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا بە کەوتنی تەلاقی عومەری ئەلعەجلانی سێبەسێ بەیەك ڕستە.

٢- فاتیمەی کچی قەیس مێردەکەی تەلاقی دا سێبەسێ بەیەك ڕستە، پێغەمەر جێگەی حەسانەوەیی و خواردەمەنی بۆفاتیمە لەسەر مێردەکەی بۆدیاری کرد. تەفسیری (أضواء البیان) بەرگی یەکەم. لەوانەوە بۆمان دەرئەکەوێ ئەگەر تەلاقەکەی ڕەجعی بوایە جێگەو خواردنی بۆ پێویست نەئەکرد. کەواتە ئەوەی لە عومەری کوڕی خەتابەوە وەرگیراوە بەو جۆرە نەبوە مانای کراوە.

بەڵکو بەر لە عومەر وەکو باسمان کرد لەمەو پێش ئەگەر ژنیان تەڵاق بدایە ئەیان ووت: تەڵاقت کەوتبێ. تەڵاقت کەوتبێ. بەسێ‌جار، زۆرجاران مەبەستیان دووبارە کردنەوەی ڕستەی تەڵاقبووە. نەك تەڵاقی سەربەخۆ، بۆیە بڕیاردرا بە کەوتنی سێ تەڵاق، بۆ ئەوەی چاکتر لەمەبەست تێ بگەین تەماشای تەفسیری (أضواء البیان) بکرێ لە بەرگی یەکەمدا.

تەمیمەی کچی عەبدو ڕەحمانی کوڕی عەوف مێردەکەی تەڵاقی دا سێ‌بەسێ مێردێ تری کرد، لە دووا پێداویستی لەگەڵ مێردە پێشوەکەی ئاشتی بکاتەوە پێش ئەوەی مێردی دووهەمی چوبێتە لای پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی: نابێ هەتا نەچێتە لای خۆشی لەیەك نەچێژن، بۆ ئەو مەبەستە خوا فەرمووی:

﴿ فَإِنْ طَلَّقَها فَلا تَحِلُ لَهُ مِنْ بَعْدُ ﴾ دووایی ئەگەرمێرد پاش تەڵاقی دووهەم تەڵاقی سێەمی ژنەکەی حۆی دا، دووایی ئەو ژنە ڕەوا نابێ بۆمێردی پێشووی لە پاش تەڵاق دانی سێەم.

﴿ حَتّی تَنکِحَ زَوْجاً غَیْرَهُ ﴾ هەتا شووبکا بە مێردێ جگەی مێردە پێشوەکەی، مێردی دووهەم بچێتە لایی و خۆشی لەیەك بچێژن.

﴿ فَإِنْ طَلَّقَها فَلا جُناحَ علیهما أنْ یَتَراجَعا ﴾ دووایی ئەگەر مێردی دووهەم چوەلای ئەو ژنەو تەڵاقی دا بە ئارەزوی خۆی بەبێ مەرجێکی پێشەکی بۆ تەڵاقدانی، دووایی گوناە لەسەر مێردی پێشوو ژنە تەلاقدراوەکەی نیە کە بگەڕێنەوە بۆلای یەکتری بە مارە بڕینێکی تازە، پاش بەسەرچوونی عیدەی مێردی دووهەم.

ئەو جۆرە کارە بە کورتی پێ‌ی ئەوترێ (جاش) ئایا دروستە یا نا؟. لای پێشەوا شافعی ئەگەر ئەو ژنە نەمارە بکرێ لە مێردێ بەو مەرجەی تەڵاقی بداتەوە بۆمێردی پێشووی، ئەو مارە بڕینە پوچەو قەدەغەیە بۆ هەردوولایان، ئەگەر مارە بکرێ لە پیاوێ تر بەبێ مەرج و تەڵاقی داو عیدەی بەسەرچوو بۆ مێردی پێشووی دروستە جارێ تر مارەی بکاتەوە هەرچەندە چاك وایە نەکرێ. بەلای پێشەوایان مالیك و ئەحمەد ئەگەر ئەو مارە بڕینە بەو

مەبەستەبوو لە ناوەڕۆکدا قەدەغەیە و پوچەڵە وەهەر نابێ بکرێ، وەئەگەر کرا پێویستە جوبێ بکرێنەوە. وەبەلای پێشەو حەنەفی ئەو مارە بڕینە دروستە بەومەرجەو بەو مەبەستەوە، مێردە پێشوەکەی ئەتوانێ سەرلەنوێ مارە بکاتەوە. ئەو مەرجەو ئەو مەبەستە پوچە.

﴿ إنْ ظَنّا أنْ يُقيما حُدُود اللهِ ﴾ ئەگەر ئەو ژن و مێردە ئەیان زانی، وەیا گومانی بەهێزیان هەبوو کە ڕائەگرن سنورەکانی خوا دووای گەڕانەوەیان بۆلای یەکتری، مافی یەکتری جێ بەجێ ئەکەن بە گوێرەی فەرمانی خوا.

﴿ وَتِلْكَ حُدُود اللهِ يبينُها لِقَومٍ يَعْلَمُونَ ﴾ وە ئەو قەدەغە کراوانە ئەو فەرمانە ڕوایانە سنورەکانی خوان ڕونی کردونەتەوە بۆ کۆمەڵێ بزانن و بیربکەنەوە لە پاشەڕۆژی خۆیان و بزانن سودی ئەو سنورانە چ شتێکنن هەتا بە گوێرەی زانیاری خۆیان هەڵسن و دانیشن. بە تایبەتی تەڵاقدانی ژن و خولع کردنی، شوکردنی بە مێردی ترو چونەوەی بۆلای مێردە پێشوەکەی بەو جۆرەی ڕوون کراوەتەوە.

پێش ئایینی ئیسلام پیاوان ژنەکانی خۆیان تەڵاق ئەدا، بۆ ئەوەی ئازاریان بدەن کەمێ بەر لەکۆتایی هاتنی عیدەی ژنەکانیان ئەگێڕانەوە بۆلای خۆیان، وە دووبارە تەڵاقیان ئەدانەوە، هەروەك جاری پێشوو ئەیان گێڕانەوە بۆلای خۆیان ئیتر بەو جۆرە بۆ چەند جارێ ئەو کارەیان ئەکرد. بۆ لابردنی ئەو ئازارە ئایەتەکانی (٢٣١) و (٣٢٣) هاتە خوارەوە. لێرەدا لەوانەیە پرسیار بکرێ جیاوازی لە نێوان فەرمانی ئەو دو ئایەتە و ئایەتەکان (٢٢٩ – ٢٣٠) ئەبێ چ شتێ بێ؟ لە وەڵامدا ئەبێژرێ: دوو ئایەتەکانی (٢٢٩ – ٢٣٠) بۆمان ڕوون ئەکەنەوە پێویستە لەسەر مێردەکان لە ماوەی عیدەدا دوو شت بکەن: یا ژنەکە بگێڕنەوە بۆلای خۆیان و مەبەستیان وابێ بە خۆشی بژین بەیەکەوە، یا تەڵاقی سێهەمی بدەن و هەموو مافی خۆی بدەنێ وازیان لێ بێنن بۆخۆیان چ شتێ ئەکەن با بیکەن. بەڵام ئایتەکانی (٢٣١ – ٢٣٢) بۆمان ڕوون ئەکەنەوە فەرمان مان پێ ئەدەن

بەر لە تەواو بوونی عیدە با ژنەکان بگێڕنەوە بۆلای خۆمان لە عیدەداو بەس، یا تەلاقی بدەین و بەس، نەك هەتا هەتایە بۆچەند جارێ تەلاقی بدەین و بگێڕینەوە بە مەبەستی ئازاردانیان، بۆیە خوای گەورە فەرموی:

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾
وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾

﴿ وَإذا طَلَّقْتُمْ النِساءَ فَبَلَغنَ أجَلَهُنَ ﴾ وەهەر کاتێ ئێوە ژنەکانتان تەلاقدا بە تەلاقی ڕەجعی، دووایی ئەو ژنانە نزیك بوونەوە لە کۆتایی عیدەکانیان.

﴿ فَأَمْسِكُوهُنّ بِمَعْروفٍ ﴾ دوایی ئێوە ژنەکانتان بگێڕنەوە بۆلای خۆتان بەجۆری یاسا پەسەندی ئەکات کەبەخۆشی و خۆشەویستی بژین بەیەکەوە ، بەر لە کۆتایی عیدە بیان گێڕنەوە .

﴿ أو تَسرحوهنَّ بمعروفٍ ﴾ وەیا بەرەڵایان بکەن و وازیان لێ بهێنن هەتا عیدەیان تەواو ئەبێ بەو جۆرەی یاساپەسەندی بکات کەنەبێ بەهۆی درێژە پێدانی عیدەکانیان وەهەموو مافی خۆیانیان بدەنێ .

﴿ ولا تمسکوهن ضراراً لتعدوا ﴾ وەمەیان گێڕنەوە بۆلای خۆتان بەمەبەستی ئازاردانیان لەبەر تۆڵە لێ سەندنیان ، بەڵکومەبەستان جێبەجێ کردنی مافی ژنان و یارمەتی دانی یەکتری بێ ،مەیان گێڕنەوە لەبەرئەوەی دەست درێژی بکەنە سەریان و ستەمیان لێ بکەن، زۆریان لێ بکەن لەسەر ئەوەی بەدارایی خۆیان ڕزگار بکەن ، یا لەڕوودابمێنن بۆ ئەو مەبەستە .

﴿ ومن یفعل ذلك فقد ظلم نفسه ﴾ وەهەرکەسێ ئەو شتە بکا و ژنەکەی بگێڕێتەوە بەمەبەستی ستەم لێکردن و درێژەدان بە عیدەکەی ، دوایی بەڕاستی ئەوکەسە ستەمی لەخۆی کردوە نەك لەو ژنە بەتەنها و بێ دادی کردووە و خۆی خستۆتە بەر سزای خوا . کەواتە پێویستە گوێ بگرن لەفەرمانی خواو بەچاکی وەری بگرن .

﴿ ولا تتخذوا آیات الله هزواً ﴾ وەئێوە وەرمەگرن فەرمانەکانی خوا بەگاڵتەپێکردن ، سستی لەواندا بکەن ، بەتایبەتی گاڵتە کردنتان بەمافی ڕەوای ژنان لەگەڕانەوەیان بە مەبەستی خراپ و ئازار دانیان .

﴿ واذکروا نعمة الله علیکم ﴾ وەئێوە بیری چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ، وەك ناردنی ئیسلام و پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەتایبەتی ڕوون کردنەوەی یاسای ژن و ژن خوازی ، چونکە لەکاتی پێشودا ژنەکانیان تەڵاق بدایە بۆیان نەبو بیان گێڕنەوە بەڵام بۆ موسوڵمانان دروستە ، بۆ ئەوان ڕەوا نەبوو ئەگەر ژنیان تەڵاق بدایە ژنی تر بخوازن هەتا ئەو ژنە زیندوو بوایە . بەڵام بۆ ئێوە دروستە .

﴿ وما أنزل عليكم من الكتاب والحكمة ﴾ وەیادی شتێ بکەنەوە خـوا ناردویـەتی بـۆ سەر ئێوە لەو نامەیە کە قورئانە کـە لـەودا بۆتـان ڕوون کراوەتـەوە بـەختیاری هـەردوو جیهان هەنگاوی کوێرانە نانێن ، لەزانستیە بەسودەکان و لـەفەرمودەکانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ کەماناى نامەی خـوا ڕوون ئەکەنـەوە ، بـەڕونی فـەرمانی خـوا لەجێگـەی خۆیـا دائـەنێ بەجۆری شیاوی ئەو جێگەیەبێ .

﴿ یعظکم بـه ﴾ خوا ئامۆژگاری ئێوە ئەکا بـەهۆی قورئانـەوە و ئـەتان ترسێنێ کـە قەدەغەیە ئازاردانانی ژنان و گالتەکردن بەفەرمانەکانی خوا ، سوپاسی چاکەی خوا بکـەن کە بەخشیویەتی بە ئێوە .

﴿ وأتقوا الله وأعلموا أن الله بکل شيء علیم ﴾ وەئێـوە خۆتـان بپـارێزن لـەخوا کـە بەهەموو فەرمانە پێویستەکانی هەلسن و ڕایان بگرن ، بەڕاستی خوا بەهەموو شتێ ئـەزانێ کامەیان سوود بەخشە و کامەیان خاوەنی زیانە بۆتان .

﴿ وإذاطلقتم النساء فبلغن أجلهُن ﴾ وەهـەر کاتـێ ئێـوە ژنـەکانتان تـەلاقدا ، دوایـی گەیشتن بەکۆتایی ماوەی عیدەکانیان . مەبەست لەم ئایەتە کۆتـایی عیدەیـە بەتـەواوی ، مەبەست لەئایەتی پێشوو نزیك بوونەوەیە لەکۆتایی پێ هاتنی عیدە .کەواتە هەریەکەیان بـۆ مەبەستێ هاتۆتە خوارەوە ، هەریەکەیان هۆیەکی تایبەتی بەخۆیان هەیە .

﴿ فلا تعضلوهُنَّ أنْ ینکحن أزواجَهُنَّ ﴾ دوایی ئێوە باوەڕدار قەدەغەمەکەن لەژنان ئێوە نەیەلن کەئەوان شو بکەنەوە بەمێردە پێشوەکانیان دوایی کۆتاییی پێ هاتنی عیدەکـەیان ، یا شوبکەن بەیەکێ تر بەگوێرەی ئاواتی خۆیان .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیـە : عـەبدوڵای کـوڕی عاسـیم ژنەکـەی خـۆی تەلاقدا ، وازی لێهێنا هەتا عیدە تەواو بوو ، لـەدواییدا پەشـیمان بویـەوە ، سـەر لـەنوێ خوازبێنی کردەوە ، هەردوولایان یەکتریان خۆش ئەویست ، مەعقەلی برای ژنەکە سوێندی

خوارد کەنایەڵم مارەت بکاتەوە ، چونکە تەڵاقت ئەدا و دووبارە ئەتخوازێتەوە . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بانگی کردو ئەو ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە ، ئەویش وازی هێنا و بریتی بۆ سوێندەکەی خۆی دا . کەواتە ئەو ئایەتە لەگەڵ ئەو کەسانەیەتی ژن مارە ئەبڕن .

هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ئەو ئایەتە لەگەڵ ئەو کەسانەیەتی ژنەکانیان تەڵاق ئەدەن و نایەڵن پاش عیدە شوبکەن بەیەکێ تر ، بۆیە ئەو ئایەتە کەهاتە خوارەوە فەرمانی پێدان نابێ ژنەکانتان قەدەغە بکەن کە شوو بکەن بەیەکێ تر پاش عیدە بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەو ئایەتە لەگەڵ هەموو باوەڕدارانێتی ، نەك بەتەنها مێردەکانیان ، یا ژن مارەبڕان . کەواتە ئەو ئایەتە مانای بەم جۆرەیە : هەرکاتێ ئێوە ژنەکانتان تەڵاق دا ، ویستی پاش عیدە مار بڕێتەوە قەدەغەیان مەکەن شوو بکەنەوە بەمێردە پێشوەکانیان ، یا بەپیاوێ تر .

﴿ إذا تراضوا بينهم بالمعروف ﴾ هەرکاتێ ژن و پیاو لەنێوان خۆیانا پێك هاتن و پەسەندیان کرد بەشێوەیەکی وا یاسا پەسەندی بکا و بەچاکی بزانێ ، بەمارەبڕینی تازە و بەمارەیەکی تازە و بەخۆشی گوزەرانی بەیەکەوە .

﴿ ذلك يوعظ به من كان منكم يؤمن بالله واليوم الآخر ﴾ ئەو قەدەغە کردنە کە ڕێگە لە ژنان ئەگرن بەئارەزوی خۆیان مێرد بکەن ئامۆژگاری پێ ئەکرێ کەسێ باوەڕ بەخواو بەرۆژی دوایی ئەهێنێ لەئێوە ،هەر ئەوان ئامۆژگاریوەرئەگرن ، نەك ئەو کەسەی باوەڕەکەی پروپوچ و دەست کردە .

﴿ ذلكم أزكى لكم وأطهر ﴾ ئەو ئامۆژگاریوەرگرتنە کەئازاری ژنان نەدرێ چاکترە بۆ ئێوە بەتایبەتی چونەوەی ژنان بۆ لای مێردە پێشوەکانیان چاکترە و ئەیان ناسن لەوەی مێردێ تر بکەن کەنایان ناسن ، پاکترەو لە گوناهەو دوورترە بۆ ژنان لەقەدەغە کردنیان لەشوکردن ، چونکە دڵنیا ئەبن لەگومان بردن بۆیان و ناکەونە بەر خەشمی خوا .

﴿ والله يعلم و أنتم لا تعلمون ﴾ وەخوا ئەزانێ بەو شتەی لەدڵی ژن و مێردایە کە ئارەزویان وایە بۆلای یەکتری بچنەوە ، بەسودی هەموان ئەزانێ ، ئێوە نایزانن کەواتە ئێوە پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا بکەن ، وەخۆتان لەقەدەغە کراوەکان بپارێزن .

پێشەوا شافیعی ئەڵێ : ئەو ئایەتە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کەژن ناتوانێ مارەی خۆی ببڕێ سەربەخۆ ، چونکە ئەگەر بتوانێ چۆن خوا قەدەغە ئەکا لەپیاوان کە ڕێگە لە ژنان نەگرن بۆ شوکردن ؟ قەدەغەکردنەکەی بەبێ هودە دەرئەچێ .

پاش ئەوەی خوای گەورە باسی تەلاقدانی کرد باسی بەخێو کردنی منالان و شیر پێدانیان و بەرگ و خواردەمەنی ئەوانمان بۆ ئەکاوئەفەرموێ :

وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾

﴿ والوالدات يرضعن اولادهنَّ ﴾ وەدایکان تەلاق درابن یا تەلاق نەدرابن پێویستە لەسەریان شیر بدەن بەمناڵەکانی خۆیان ، ئیتر ئەو مناڵە بەر لەتەلاقدانی دایکیان لەدایك بووبن یا لەدواییدا ، چونکە پەروەردە کردنی دایکیان بەسوود ترە بۆیان ، خاوەن بەزەیی ترن لەیەکێ تر .

﴿ حولين كاملين ﴾ دووساڵی تەواو کەئەکاتە (٢٤) بیست و چوار مانگ ، ئەگەر منداڵەکان باوکەکانیان خاوەنی دارایی بوون ، یا منداڵەکان خۆیان دارایی دار بوون ، جگە لە دایکەکانیان ژنی تر هەبوو شیریان بدەنێ ، منداڵەکان مەمکەیان ئەمژین هەرچەندە لەو کاتەدا پێویست نیە لەسەردایکیان شیریان بدەنێ ، بەڵام واچاکەهەر شیریان بدەنێ ، ئەگینا پێویستە لەسەر دایکیان هەر خۆیان شیریان بدەنێ لەو کاتەدا کە خاوەنی دارایی نین.

﴿ لمن أراد أن يتم الرضاعة ﴾ ئەو بڕیارەیش بۆ ئەو کەسەیە بیەوێ ماوەی شیردانەکە تەواو بکا ، ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ماوەی شیرپێدان دوو ساڵە ، لەپاش دووساڵ نرخێ بۆ شیردان بەمناڵ دانانرێ لەهیچ ڕوێکەوە ، درو ستە لەدووساڵ کەمتر بێ . لێرەدا خوای گەروە ڕاستەوخۆ لەگەڵ دایکانێتی ، چونکە شیری دایك بۆ مناڵ خۆشترە، مەمکەکانیشی شیاو ترە بۆ مناڵ لە شیری تر و لەژنی بێگانە ، لامان ڕوونە مناڵ پارچەیەکە لەدایکی خۆی ، هەروەك پزیشکان لەکۆنّ و تازەدا ڕونیان کردۆتەوە کەبەڕاستی خوای خاوەن میهرەبان ئەو شیرەی بۆ ئەسازێنێ لە یەکەم کاتی جوڵانی مناڵ لەمنداڵدانا بەشێوەیەکی شیاو بۆی.کەواتە پێویستە لەسەر دایکان شیر بدەن بەمناڵەکانیان لەبەر گەشە کردنیان و خۆشیان .

﴿ وعلى المولود له ﴾ وەپێویستە لەسەر ئەو کەسەی مناڵەکە بۆ ئەو لەدایك بووە کە بەو ڕستەیە بۆمان دەرئەکەوێ مناڵ ڕاستەوخۆ هی باوکە ، بۆیە پێویستە لەسەری پەروەردەی مناڵ بکا بەدارایی خۆی .

﴿ رزقهن وكسوتهن ﴾ خواردەمەنی ژنانی شیر دەر و بەرگ و پۆشاکیانن لەجیاتی کرێکەیان ، کەواتە ئەو ڕستەیە بەڵگەیە بۆ شافیعیەکان کە دروستە دایکی مناڵ بەکرێ بگیرێ بۆ شیردان بەمناڵ ، ئەو ژنە تەلاق درا بێ یان نە ؟ ئەگەر شیردەر بەژنیەتی باوکی مناڵ مابێتەوە بەخێوکردنی لەبەر ئەوەیە ژنیەتی ، ئەگەر تەلاق درابێ لەبەر ئەوەیە کرێ ئەدرێ بەشیردەری منداڵەکەی .

﴿ بالمعروف ﴾ بەجۆرێ یاسای ئیسلام پەسەندی بکا ، مام ناوەندی و داد پەروەرانە بێ لەباوی کات و شوێن دەرنەچێ .

﴿ لا تکلف نفس الا وسعها ﴾ ئازارو کاری گران ، ناخرێتە سەر هیچ کەسێ مەگەر بەگوێرەی توانای خۆی و گونجاو بێ بۆ ئەو کەسە ، خاوەن دارایی بەگوێرەی دارایی خۆی ، هەژار بەگوێرەی هەژاری خۆی ، مام ناوەندی بەگوێرەی دارایی خۆیان هەمویان کرێی خواردن و خواردنەوە و پێ خۆر و بەرگیان لەسەر دائەنرێ بۆ ژنانی شیردەر .

﴿ لاتُضار والدةٌ بِوَلَدِها ﴾ پێویستە دایك ئازار نەگەیەنێ بەمناڵە شیر خۆرەکەی خۆی، لەخۆی جوێ نەکاتەوە ، بیداتەوە بەسەر باوکیا و شیری نەداتێ کەواتە بەو جۆرە مانای ئەو ڕستەیە کرا ووشەی ﴿ لاتضار ﴾ بینا فاعیلە .

بەجۆرێ تر مانای ئەو ڕستەیە ئەکرێ : دایك پێویستە ئازاری پێ نەگەیەنرێ ، بەهۆی مناڵەکەیەوە ، یانی زۆری لێ نەکرێ بۆ شیر پێدانی مناڵەکەی ، پێویستە مناڵەکەی لێ نەسەنرێتەوە ، ئەگەر دایکی ویستی شیری بداتێ ، ئەگەر مناڵەکە لای باوکی بێ نیشانی نەدرێ ، یا ئەوەندەی ئازوخە نەدرێتێ کەبەشی بکا، کەواتە ووشەی ﴿ لاتضار ﴾ بۆ بینا مفعولە .

﴿ وَلا مَولودٌ لهُ بِوَلَدِهِ ﴾ وەهیچ باوکێ نابێ ئازاری مناڵەکەی خۆی بدا لەماوەی شیر خواردندا کە لەدایکەکەی بسەنێتەوە ، بەم جۆرەیش مانا ئەکرێ : نابێ باوکی مناڵ تووشی ئازار بێ بەهۆی مناڵەکەوە ، یانی داوای ئازوخەی زۆری لێ بکرێ و شتی تری وا لەتوانایا نەبێ .

﴿ وعلي الوارث مثل ذلك ﴾ وەپێویستە لەسەر میرات بەری باوك وێنەی ئەوەی لەسەر باوك بووە لەئازوخە و پۆشاك بۆ دایکە شیردەرەکە و بۆ بەخێو کردنی مناڵەکەشی، ئازاری شیردەر و مناڵ نەدرێ . کەواتە میرات بەر جێگەی باوك ئەگرێتەوە بۆ مافی مناڵ لەهەموو ڕوێکەوە ، ئەگەر ئەو میراتبەرە کەلەپور بەربێ و خاوەن دارایی بێ پێویستە لەسەری کرێی شیردانەکە بدا ، لەسەر مناڵەکەیە ئەگەر دارایی هەبێ ، ئەگەر هیچ لایەکیان داراییان نەبوو پێویستە زۆر بکرێ لەدایك بدا بەمناڵەکە شیری خۆی .

بەلای پێشەوایان شافیعی ومالیك ئازوخەی منالْ و بەخێوكردنی لەسەر باوك و باپیر و منالەكەیە ، كەواتە منالەكەیش یەكێكە لەمیراتبەر ، بۆیە لەكاتی هەژاری ئەواندا پێویستە دایك بەخۆڕایی شیر بدا بەو منالە هەژارە .

بەلای ئەو دوو پێشەوایەوە میرات لیٚ گیراو بریتیە لەباوك و بەس . بەلاّم ئەوەی لەمانای ئەو ڕستەوەوە دەرئەكەویٚ هەموو میراتبەرەكان ئەگریٚتەوە جگە لەدایك ئیتر میراتبەری باوكبن ، یامیراتبەری منالەكە بن لەكاتی مردنی منالەكەدا . واتە چۆن میراتیان لیٚئەگرن پێویستە منالەكەیش بەخێو بكەن .

﴿ فَإنْ أرادَا فِصالاً ﴾ دوایی ئەگەر باوك و ژن ویستیان منالەكە جوی بكەنەوە، لەشیری ببڕنەوە بەر لە كۆتایی دوو سالەكە، بۆیان دەركەوت پێویستی بەشیر خواردن نیە وە زیانی پیٚ ناگا. هەروەها ئەو ڕستەیە باوك میراتبەر ئەگریٚتەوە لەگەلْ دایكی منالاٚ.

﴿ عَنْ تَراضٍ مِنْهُما وتشاور جُناحَ عَلَيْهِما ﴾ لەڕووی خۆشبوونی هەردوولایانەوە. نەك یەكێكیان بە تەنها لە باوك و لە دایك، لەڕووی ڕاویژكردنیان لەگەلْ یەكتری لە بارەی بڕینەوەی منالەكە لەشیر، پێك هاتن كەبڕینەوەی لە شیر خاوەنی سوودە، دوایی هیچ گوناهیٚ لەسەریان نیە لەو ڕێگەیەوە،چونكە كەم جار وائەبیٚ باوك و دایك پێك بیٚن لەسەر زیانی منالیان. بەلاّم ئەگەر ئاژاوەیان لیٚی پەیدابوو، پێك نەهاتن پێویستە دوو سالەكە تەواو بیٚ.

﴿ وإنْ أرَدْتُمْ أنْ تَسْتَرضِعُوا أوْلادَكُمْ ﴾ وەئەگەر ئێوەی باوكان و ئەو كەسانەی سەرپەرشتی منالاّن ئەكەن ویستیان كە دایەن بگرن بۆمنالەكانیان. یانیٚ داوا بكەن شیریان بدەنیٚ جگە لە دایكەكانیان، ئیتر دایكەكەیشی شیری بداتیٚ یانە؟

﴿ فَلا جُناحُ عَلَيْكُمْ إذا سَلَّمْتُمْ ما اتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ ﴾ دوایی هیچ گوناهیٚ لەسەر ئێوەی باوك و دایك نیە بۆ ئەوەی دایەنیان بۆ بگرن هەر كاتیٚ ئێوە بدەن بە دایەنەكان ئەو شتەی ویستوتانە بیدەن بەوان لە كریٚی دیاری كراو بۆیان بە چاكی و پیٚ خۆشبوون بەبیٚ كەم و زۆر بەو جۆرەی یاسا پەسەندی بكا و یاوی كات و جێگەی خۆتانبیٚ.

﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ وە ئێوە لە خـوا بترسـن لـە دەست بەسەرا گرتنی کرێ دایەنەکان و بتانەوێ نەیاندەنێ‌ن ئێوە بزانن بەڕاستی خوا بە شتێ ئێـوە ئەیکەن لە شیردان بە منالاّن و بڕینەوەی و دایـەن گرتـن بۆیـان ئـەبینێ هـەمویان و هیـچ شتێکی لێ وون نابێ، پاداشتی هەموویان ئەداتەوە.

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەر مێردەکان ژنەکانیان بەخێو بکـەن، بـە ئازوقەو بەرگ و جێگەی حەسانەوە، هەروەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە خاوەن منـاڵ منالّەکانیان بەخێو بکەن. بەلاّم لەو ئایەتەدا خوا ناوی دایکە شیردەرکانی بردووە بە تەنها، چونکە خواردەمەنی لە دایکەو ئەگا بە منالّ بەهۆی شیرەوە. جابۆیە پێویستە باسی چۆنیەتی بەخێوکردنی ژنان و منالاّن بکەین وە بزانـین چ کەسـێ منـاڵ بـەخێو بکـا. بـەم جـۆرەی خوارەوە باسیان ئەکەین.

١- پێویستە لەسەر مێرد ژنی خۆی بەخێو بکات بە جـۆرێ بگونجـێ لەگـەڵ دارایـی مێرد. کەواتە ئەگەر مێرد خاوەن سامان بوو پێویـستە بـۆ هـەموو شـەوو ڕۆژی (١٣٥٠) هەزارو سێ‌سەدو پەنجا گرام لە زۆربەی خواردەمەنی شار بدابە ژنەکەی لەگەڵ پێ خـۆرو چاو برنج و ڕۆن و شتی تر بە گوێرەی کات و شوێن.

٢- پێوستە لەسەر مێردی هەژار نیوەی ئازوقەی ساماندار بدا بە ژنەکەی مێردی مـام ناوەندی لە داراییدا پێویستە لەسەری بۆ هەموو شەوو ڕۆژێ نزیکـەی (١٠١٤) هـەزارو چواردە گرام لە زۆربەی خواردەمەنی دانیشوان بدا بە ژنەکەی لەگەڵ پێ خۆرو شـەکرو برنج و میوەو ڕۆن و شتی تری پێویستی ژنان بۆ ژیانیان.

هەروەها پێویستە لەسەر مێرد جێگەی خـەوتن و حەسـانەوە بـۆ ژن سـازبکا بـەجۆرێ شایستەی شانی ئەو ژنەبێ لەگەڵ کەرەسەی خۆ جوان کردن و پاك کردنـەوەی لەشـی و شانەو ڕۆنی سەری و شتی تر بە گوێرەی شانی مێرد و باوی کات و شـوێن، ئەگـەر لـەو کەسانە بوو خزمەت بکرێ پێویستە خزمەتی بکرێ لەلایـەن مـێردەوە بەهـەر جـۆرێ بـێ

بەخێوکردنی ژن لەسەر مێرد هەڵئەگیرێ و، لەسەری بە پێویست نامێنێ بە هۆی ئەمانەوە، قەدەغەی ڕابواردنی مێرد بکا لە خۆی بەبێ بەڵگەو بیانو وەك حەیز . بە بێ پرسی مێرد لەجێگەی حەسانەوەی دیاری کراوی خۆی بچێتە دەرەوە .

**تێبینی :** بۆ ژنانی ژیر و باڵغ هەیە داوای پوچ کردنەوەی مارە بڕینەکەی خۆی بکا لەلای دادوەر لەمێردێ ، تواناى بەخێوکردنی ژنەکەی نەبێت بەکەمترین ئازوخە و جێگە و بان ، ژن ناتوانێ مارە بڕینەکەی پوچ بکاتەوە هەتاوەکو هەژاری مێردەکەی ڕوون نەکاتەوە ، ئیتر بەڵێنی خۆی بێ مێردەکەی یابەهۆی شایەتەوە لای دادوەر . پاش ڕوون بونەوەی هەژاری مێرد دادوەر سێ ڕۆژ مۆڵەتی مێرد ئەدا ، پاشان یا دادوەر مارەبڕینەکە پوچ ئەکاتەوە ، یا ژنەکە خۆی .

٣- پەروەردەکەری منالاّن ، یان ئەوکەسانەی شێت بن کەسەربەخۆ خۆیان نەتوانن بژین پێویستە لەهەموو ڕویێکەوە بەتایبەتی منالاّن لەخواردن و خواردنەوە ، بەرگ و جێگەی خەوتن ، شۆردنی لەشو پاك کردنەوەی پۆشاکی ، ژێرەخەر و سەرەخەر ، ڕۆنی سەری و ڕشتنی چاوی ، پێچەوانەی لەبێشکەدا ڕاژەندنی هەتا ئەخەوێ هەتادێ سەرپێچی نەکەن .

بەخێو کردنی منالاّن پشت ئەبەسێ بەخزمایەتی و میهرەبانی بۆ چاودێری کردنی منالاّن، پەرەسەندنیان بەچاکی وبۆ سودیان ، بۆ خۆڕاگرتن و خۆماندووکردن لەسەر پاراستن و بەڕێوەبردنی کاروباریان ، لەبەرئەوەی ژنان نەرمی و بەزەییان زۆرترە لەپیاوان خوای گەورە و بەمیهرەبان بەخێوکردنی منالاّنی بەژنان سپاردووە یەکەم جار ، بەگوێرەی ئەم پلانەی خوارەوە باسی بەخێوکردنی منالاّن ئەکەین :

١- دایك لەپێشترە بۆ بەخێوکردنی منالاّن لەهەموو کەس ، ئیتر ژنی باوکی منالّ بێ یا تەلاّقی دابێ لەعیدەدا بێ یا عیدەی بەسەر چووبێ ، بەلاّم ئەو دایکە پێویستە شیاوی بەخێوکردنی منالّ بێ شێت نەبێ ، بۆیە لەپێشترە چونکە لەسەر خۆ و بەپشوترە و میهرەبان ترە بۆ منالاّن لەهەموو کەسی تر .

٢- ئەگەر دایك نەبوو یا شیاو بەخێوکردن نەبوو ، منالْ ئەدرێتە دەست دایکە دایك دوایی ئەدرێتە دەست دایکی باوك .

٣- ئەگەر نەنکەکان نەبوون ، منالاّن خوشکی دایك و باوکی پێویستە بەخێویان بکەن لەپاشا خوشکیدایکی ، دوایی خوشکی باوکی .

٤- ئەگەر خوشکان هیچیان نەبوون ، منالاّن ئەخرێنە لای کچی خوشکی دایك و باوکی دوای ئەو کچی خوشکی دایکی ، لەپاشا کچی خوشکی باوکی .

٥- ئەگەر کچانی خوشك نەبوون ، منالاّن خوشکی دایکیان بەخێوی ئەکەن . بەمەرجێ لەپێشەوە باوك و دایکی ، دوایی خوشکی دایکیدایکی ، لەپاشان باوکی .

٦- ئەگەر خوشکانی دایکی منالاّن نەبوون ، منالاّن ئەدرێنە دەستی خوشکی باوك. یەکەم جار دایکو باوکی ، دوایی دایکی لەپاشا باوکی .

٧- ئەگەر باوکیمنالْ خوشکی نەبوو منالاّن ئەدرێنە دەستی کچی برای دایك وباوکی دوای ئەو ئەدرێ بە کچی برای دایکی، دوایی بەکچی برای باوکی .

٨- ئەگەر کچانی باوك نەبوون . منالاّن ئەدرێن بەخوشکی باوکی دایك و باوکی ، دوایی بەخوشکی باوکی دایکی ، لەپاشا خوشکی باوکی باوکی .

٩- ئەگەر خوشکی باوك نەبوون منالاّن ئەدرێن بەخوشکی دایکی دایك ، دوایی بەخوشکی دایکی باوکی دایك و باوکی، لەپاشان بەخوشکی دایك باوکی و دایکی ، دوایی بەخوشکی دایکی باوکی .

١٠- ئەگەر ئەوانەی ڕابوردن نەبوون ئەدرێ بەخوشکی باوکیدایك ، دوایی بەخوشکی باوکی باوك.

١١- ئەگەر منالْ ئەوانەی پێشووی نەبوو لەژنان منالاّن ئەدرێن بە باوك بۆ بەخێو کردنی ، دوایی بەباوکی باوك،هەتا بەرەوژوور بڕوا ،دوایی برای دایك و باوکی . برای باوکی . کوڕی برای باوك و دایکی . کوڕی برای باوکی ، دوایی مامی باوك و دایکی .

مامی باوکی . کوڕی مامی دایك و باوکی . کوڕی مامی باوکی ، بەمەرجێ منالەکە ئەدرێ بەئامۆزاکە منالەکە کوڕبێ ، بەلام ئەگەر منالەکە کچ بێ نادرێ بەکوڕی مام ، چونکە دەستنوێژیان لەیەك تری ئەشکێ ، بەلکو دائەنرێ لای مرۆڤێکی بڕواپێ کراوێ ئاین پەروەر .

١٢- ئەگەر منال میراتبەری نەبوو بەخێوی بکا ، لای پێشەوا حەنەفی ئەدرێ بەمانەی خوارەوە یەك لەدوای یەك :

باوکی باوکی دایك ، کوڕی خوشکی دایك و باوکی ، کوڕی خوشکی باوکی ، کوڕی برای دایکی ، کوڕی خوشکی دایکی ، مامی دایك ، برای دایکی باوك و دایکی ، برای دایکی و باوکی ، برای دایکی دایکی .

ئەگەر منالان هیچ کەسێ لەوانەی پێشوی نەبوو ، دادوەر بەگوێرەی بیری خۆی دای ئەنێ لای کەسێکی بڕوا پێ کراوی ئاین پەروەر ، ئیتر چ پیاو بێ یاژن .

ئەو کەسانەی منال بەخێوکردنیان پێ ئەسپێرێ مەرجە ئەم کەسانەی خوارەوە بن :

١- پێویستە بالغ و ئاقل و سەربەست بن ، منال و شێت و بەندە مافی بەخێوکردنی منالیان نیە .

٢- پێویستە بتوانێ منالەکە بەخێو بکاو بیپارێزێ لەکاری خراپە . ئەگەر نەی توانی منالی نادرێتە دەست ، ئیتر ئەو ژنەی مافی بەخێو کردنی منالی بۆ هەیە ئەگەر مامۆستا ، یا پزیشك یا موچە خۆر بێ ، ئەو کارانە نابنە هۆی لەکیس چونی ئەو مافە . بەمەرجێ کارەکانیان نەبنە هۆی لە ناوچونی منال.

٣- پێویستە ئەوژنە کەمنال بەخێو ئەکا گومانی بێ ئابڕویی لێنەکرێ . کەواتە ژنێ بێ ئابڕو مافەکەی لەکیس ئەچێ ، ئەگەر ببێتە هۆی نەمانی منال یافێر بوونی ڕەوشتی خراپ. هەروەها مرۆڤێ منالی لا دائەنرێ پێویستە ڕەوشتی بەرز و خاوێنبێ ، نەك بێ ئابڕوداوێن پیس و ڕەوشت خراپ بێ.

٤- پێویستە ئەو ژنەی منالٚ بەخێو ئەكا شوی نەكردبێ بەجگەی باوكی منالٚ ، ئەگــەر مێردی كرد مێردەكەی بێگانە بوو منالٚەكەی لا دانانرێ ، بەلاٚم ئەو ژنە ئەگەر مێردی كرد بەوێنەی مامی منالٚ مافەكەی لەكیس ناچێ .

**تێبینی :**

بۆ ئەوەی زۆرتر شارەزای ئەو كارە گرنگانــە ببـین پێویســتە تەماشـا نامـە دەسـتوریە بكەین .

لەكاتێكا خوای گەورە باسی عیدەی ژنی تەلاٚق دراوی بۆكردوین . باسی عیدەی ژنـی مێرد مردوومان بۆ ئەكا و ئەفەرموێ :

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ
أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ
فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ
﴿٢٣٤﴾ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ
أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ
وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ
وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ
وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟

أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾

﴿ والذين يتوفون منكم ويذرون أزواجاً ﴾ وەئەو کەسانەی ئەوتۆ ئـەمرن و گیانیـان لێ ئەسێنرێتەوە ، بەجێ دێلن ژنان پاش مردنی خۆیان پێویستە ئەو ژنانە .

﴿ يتربصنَّ بِأَنفُسِهِنَّ ﴾ چاوەڕوان بکەن بۆ خۆیان دوای مردنی مێردەکانیـان ، خۆیـان ڕاگرن بۆ هەڵبژاردنی عیدە و مێردی تر نەکەن.

﴿ أربعة أشهر و عشراً ﴾ چوار مانگ و (١٠) ڕۆژ ، بەمەرجێ ئەو ژنە سکیان پڕ نەبێ ئەگەر سك پڕبـوون عیدەکـەیان کۆتـایی پـێدێ بـەدانانی سـکەکانیان ، وەك لـەمـەوپاش لەسورەتی (الطلاق)دا ، لەئایەتی شەشهەمدا خوای گەورە باسی ئەکا .

هەرچوار خاوەن ڕێگەکان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی مێرد مردوو ئەگەر ئـاوس نـەبێ عیدەکەی چوار مانگ و (١٠) ڕۆژە ، ئیـتر ئـەو ژنـە مێردەکـەی چوبێتـە لای یـان نـا ؟ مێردەکەی گەورە بێ یا مناڵ ؟ بەڵگەیان ئەو ئایەتەیە .

هەروەها پێك هاتوون لەسەر ئەوەی پێویستـــە لەسـەر ژنـی مـێرد مـردوو لـە مـاوەی ئەوچوار مانگ و دە ڕۆژەی خۆی بەتازیەدار بزانێ، واز لەخۆ ڕازاندنەوە و خۆبێن خـۆش کردن و خۆ جوان کردن بێنێ ، نەچێتە دەرەوە بەشەودا لەو جێگەیـە بـۆی دیـارکراوە . بەڵام بەڕۆژدا دروستە بڕواتە دەرێ بۆجێبەجێکردنی پێویستەکانی خۆی ، کاربەدەستان و خزمانی ژنی مێرد مردوو پێویستـــە لەسـەریان ئـەو کارانـە بەسـەر ژنـانی مـێرد مـردوودا بسەپێنن، هەروەها پێك هاتوون لەسەر ئەوەی پێویستە جێگەی خەوتن و حەسانەوە بۆ ژنی مێرد مردوو دابنرێ ، بەڵام ئازوخەی تری لەسەر خۆیەتی .

بۆیە خوای گەورە فەرمانی داوە بە چاوەڕوانی چـوار مـانگ وە دە ڕۆژ لەبـەر ئەوەیـە منداڵ لەمنداڵداندا ناجوڵێ هەتا نەگاتە سێ مانگە، بەزۆری دەرناکەوێ هەتا نەگاتـە چـوار

مانگ ، (١٠) ڕۆژ خراوەتە سەریان هەتا بەباشی بزانرێ ئەو ژنە ئاوسە یان نە ؟ بۆیە چاوەڕوان کردنی ئەو ماوەیە هەموو ژنان ئەگرێتەوە ، ئیتر مێردەکەی چوبێتە لای یا نە ؟ منالبێ یا گەورە ؟ مێردەکەی گەورە بێ یا منالّ ؟ لەبەر بەجێ هێنانی دام و دەزگای دانیشتوان و چاکەکردن لەگەلّ کەس و کاری مێرد و هاوبەشیان لەخەفەتی مردووەکەیانا، پاراستنی خۆی لەواتە وویت و زمان بڕینی دوژمنان ئەوانە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە لەخوڕەوشتی کەسانی چاکەوە دوورە و شایستەی ئەوان نیە پەلە بکەن لەپاش مردنی مێردەکانیان شوو بکەن بەمێردی تازە . لەبەر ئەوانە لەبەر بەجێ هێنانی مافی مێردەکانیان بڕیاری چاوەڕوانی چوارمانگ و دە ڕۆژ دراوە .

بەلای هەندێ لەزانایان چاوەڕوان کردن بۆ زۆرتر لەو ماوەیە بەلّگەیە لە سەر ڕێز و شیرینی بەرزی ئەو ژنە .

﴿ فإذا بلغن أجلهن فلا جناح عليكم ﴾ دوایی هەرکاتێ ئەو ژنانە مێردەکانیان مردوون گەیشتنە ماوەی چاوەڕوان کردنیان و عیدەیان تەواو بوو ، دوایی هیچ گوناهێ لەسەر ئێوەی موسولّمانان ، یا ئێوەی میراتبەر ئەوکەسانەتان ژنان مارە ئەبڕن .

﴿ فيما فعلن في أنفسهن بالمعروف ﴾ لەو شتەی ژنانی مێرد مردوو ئەیکەن بۆ خۆیان لەمێرد کردنیان و خۆڕازاندنەوەیان و خوازبێنی کردنیان بەشێوەیەکی چاك و ڕێك بکەوێ لەگەلّ یاسا و باوی ژنان ، مارەکردنیان بەجۆرێ بێ یاسا ڕونی کردوەتەوە .

﴿ والله بما تعملون خبير ﴾ وە خوا بەشتێ ئێوە ئەیکەن ئەی ژنان و پیاوان ئاگادارە و ئەیزانێ . کەواتە ئەی خواپەرستان ئێوە بزانن کارەکانتان ئەزانرێ ، خەفەت مەخۆن خوا پاداشتان ئەداتەوە ، ئەی گوناهباران خراپەکانتان ئەزانرێ و تۆلّەتان لێ ئەسەنرێ .

ئەو ئایەتە جێگەو پلەی ژنانی مێرد مردوو بەرز کردوەتەوە ، چونکە بەر لەهاتنی ئیسلام ئازاری زۆری ژنانی مێرد مردویان ئەدا ، یانی خزمان و کەس و کاری مردوو کەژنەکەیان ئەکردە خانویەکی چۆلّ و پیس و بۆگەن ، خراپترین بەرگی ئەپۆشی ، سالێکی ڕەبەق خۆی پاك نەئەکردەوە ، پاش سالّەکە ئەهاتە دەرێ ، پشقلێکی هەلّئەگرت و فرەی ئەدا و ، سواری کەرێکیان ئەکرد ، ئەوانە هەمویان و چەند شتێکی تری خراپ و نالەبار .

بەهاتنی ئاینی ئیسلام ئەوانە هەمویان هەڵگیران ، فەرمانیان پێ درا چوار مانگ و (١٠) ڕۆژ چاوەڕوان بکەن ، بەچاوێکی ڕێزەوە لەجێگەیەکی پاکدا دابنرێ .

خوای گەورە کەباسی عیدەی ژنانی کرد ، فەرموی : هەندێ لەژنان بۆ مێردەکانیان هەیە بیانگێڕنەوە بۆلای خۆیان ، باسی جگەی ژنانی خۆیان مان بۆ ئەکا و فەرموی :

﴿ ولا جناح عليكم فيما عرضتم به من خطبة النساء ﴾ وەهیچ گوناهێ لەسەر ئێوەی ژن خواز نیە لەو شتەی ئێوە ڕای گەیەنن بەشێوەیەکی نهێنی ، نەك بەوێنەی زەقی و بەدەربڕینی ئاشکرا لە خوازبێنی کردنی ژنانی مێرد مردوو ، بەو جۆرەی بەو ژنانە بڵێن : من ئەمەوێ ژنێکی چاکی وەك تۆ بخوازم ، ژنێکی وەك تۆ ڕەوشتی چاکبێ، ژنی وەك تۆ دەستی چ کەسێك ئەکەوێ ، هەتا دێ .

﴿ أو أكننتم في أنفسكم ﴾ یا ئەو شتەی ئێوە شاردوتانەتەوە لەدەورنی خۆتانا ، دەری ناخەن کەئەتانەوێ ئەو ژنە مێرد مردوانە بخوازن ، یانی ئێوە گوناهبار نابن بەئاماژە بگەیەنن بەو ژنانە خوازبێنی کردنیان ، یا بەو شتەی لەدەرونتانایە لەداواکردنیان .

﴿ علم الله أنكم ستذكرونهن ﴾ خوا زانیوێتی بەزانستی پایەداری خۆی بەڕاستی ئێوە باسی ئەو ژنانە ئەکەن و خوازبێنیان ئەکەن و مارەیان ئەکەن بەگوێرەی یاسای ئاین ، کەواتە باس کردنیان بەئاماژە و هێما و ، بەو شتە لەدەرونتانایە نابێتە هۆی گوناهباریتان .

﴿ ولكن لا تواعدوهن سراً ﴾ وەبەلام ئێوە بەڵێن بەو ژنانە مەدەن لەنهێنیدا ، بڵێن ئێمە جگە لەتۆ کەسی تر ناخوازین ، چونکە ئەوە لەئاماژە دەرئەچێ ، خۆتان هەڵمەکێشن بڵێن: ئێمە لەپیاوەتیدا بەکارین ، نەوەك سەربەکێشێ بۆلای کاری نالەبار و داوێن پیسی .

﴿ إلاّ أن تقولوا قولاً معروفاً ﴾ مەگەر کە ئێوە بڵێن لەپەنهانیدا : گفتوگۆیەکی چاك کەلەنەزاکەت دەرنەچێ و یاسای ئیسلام پەسەندی بکا .

لێرەدا وا چاکە باسی بەشەکانی خوازبێنی بکەین بەکورتی :

ژنی مارەبڕی هیچ کەسێ ئەبێ لە عیدەی هیچ کەسێکیان نەبێ خوازبێنی کردنی دروستە . بۆ ژنێ لەعیدەدابێ و ، لەوژنانە بێ مێردەکەی بتوانێ بگێڕێتەوە خوازبێنی

بەپلار نەك بەزەقی دروستە هەروەك وەلاّمدانەوەیشی دروستە . خوازبێنی لەسەر خوازبێنی قەدەغەیە كە بەڵێنی پێ درابێ ئەوژنەی بدرێتێ . مەگەر خۆی وازی لێ بهێنێ ، پێویستە لەسەر كەسێ پرسی پێ بكرێ بۆ خوازبێنی ژنێ هەموو چاكە و خراپەی ئەو ژنە بڵێ ، ئەگەر بەبێ ناوبردنیان وازی ئەهێنا قەدەغەیە ناوبردنی خراپەكانیان .

﴿ ولا تعزموا أعقدة النكاح حتى يبلغ الكتاب أجله ﴾ وەئێوە بەجیز مەبن لەسەر مارە بڕینی ژنان لەعیدەدا هەتا نامەكە ئەگاتە جێگەی خۆی ، یانی ئەو ماوەیە خوا دیاری كردووە و نوسیوێتی كۆتایی پێ دێ كەچوار مانگ و (١٠) دە ڕۆژە ، یا جۆرەكانی تری عیدەیە ، ئەگەر لەعیدەدا ژنان مارە بڕان مارە بڕینەكەیان پووچە .

﴿ وأعلموا أن الله يعلم ما في انفسكم فأحذروه ﴾ وەئێوە بزانن بەڕاستی خوا ئەزانێ بە شتێ لەدەرونی ئێوەدایە كە بڕیاردانتان لەسەر شتێ لای خوا دروست نی‌یە ، دوای ئێوە بترسن لەخوا و خۆتانی لێ بپارێزن ، لەسزا و تۆڵە خۆتان دوور بخەنەوە ، بڕیاری مارە بڕینی ژنی خاوەن عیدە مەدەن ، ئەگەر مارەتان كردن جوێ ببنەوە ، چونكە ئەو مارەكردنە پوچە .

﴿ وأعلموا أن الله غفور حليم ﴾ وەئێوە بزانن بەڕاستی خوا لێ خۆشبونی زۆرە بۆ ئەو كەسانە ئەیانەوێ مارەیان ببڕن و نایكەن ، خوا لەسەر خۆیە بۆ سزادانی تاوانباران و پەلە ناكا ، بەتایبەتی ئەو كەسانەی مارەیان ئەبڕن .

لێرەدا ئەمانەی خوارەوە ڕوون ئەبێتەوە :

١. مارەبڕینی ژنان لەعیدەدا پوچە ، هیچ ئەنجامێكی جگە پوچی نیە ، قەدەغەیە .

٢. موسوڵمانان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی خوازبێنی ژن لەعیدەدا بەزەقی و بە ئاشكرا ، وەك باسمان كرد .

٣. ئەگەر مرۆڤێ لەعیدەدا ژنێكی مارەبڕی و چوە لای پێویستە جوێ بكرێنەوە ، پاش كۆتایی عیدە سەر لەنوێ مارەی ببڕن بۆ ئەو مرۆڤە . بەلای پێشەوایان شافیعی و

حەنەفی و ئەحمەد مرۆڤەکە ئەتوانێ مارەی بکا ، ئیتر چوبێتە لای یان نە ؟ ئەتوانێ لەیەکێ تریش مارە بکرێ دوای عیدە ، بەلام ئەگەر سکی پڕبوو لە مرۆڤە پێشوە نابێ بچێتە لای هەتا سکەکەی دائەنێ . بەلای پێشەوا مالیکەوە مارە بڕینی ژن لەعیدەدا پوچە ، ئەگەر ئەو پیاوە نەچوبوە لای پێویستە جوێ بکرێنەوە ، پاش عیدە ئەتوانێ مارەی بکا ، ئەگەر چوبوە لای پێویستە جوێ بکرێنەوە ، ئەو ژن و پیاوە لەیەك قەدەغە ئەبن هەتا هەتایە ، لەبەر تەمێ کردنیان لەبریتی ئەوەی لەفەرمانی خوادا پەلەی کردووە کەمارەی بڕیوە و چوەتەلای .

لەئایەتە پێشوەکاندا خوای گەورە ڕوونی کردوەتەوە مرۆڤ هەرکاتێ ژنی خۆی تەلاقدا پاش چونە لای ئەو پیاوەبۆی نیە داوای هیچ شتێ لەمارەیی ژنەکە بکا مەگەر ئەو ژنە بەئارەزوی خۆی بەو مارەییە خۆی ڕزگار بکا ، ئەگەر ئەو ژنە مارەیی بۆ ناونرا بو پێویستە پاش تەلاقدانی و چونە لای هەموی بداتێ ، ئەگەر مارەیی بۆ ناو نەنرابوو کە تەلاقی دا پێویستە بەئەندازەی مارەیی وێنەی ئەو ژنە مارەیی بداتێ .

لەم دوو ئایەتەی دواییدا خوای گەورە ئەمانەیشمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە :

١. ژنی تەلاقدراو بەر لەچونەلای مارەیی بۆ دیاری نەکرابوو کە تەلاقی دا مارەیی بۆ ئەو ژنە پێویست نەکراوە ، بەلام پێویستە دلّی ئەو ژنە خۆش بکرێ بەوەی مێردەکەی ئەندازەیە پارە یا شتێ تری بداتێ .

٢. ئەگەر ژنی تەلاقدراو بەر لەچونە لای مارەیی بۆ دانرابو پێویستە نیوەی مارەیی دیاری کراوی بدرێتێ مەگەر ئەو ژن و مێردە دەست لەمافی خۆیان هەلگرن بۆ یەکتری کە نیوەی مارەیی نێو براوە ، وەك خوا ئەفەرموێ :

لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ

قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ
لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟
ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ
وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾

﴿ لا جُناحَ عَلَيْكُمْ اِنْ طَلَّقْتُمُ النِساءَ ما لَمْ تَمَسُّوهُنَّ ﴾ هیچ گوناهیَ لەسەر ئێوە نی‌یە و هیچ شتێ لەسەر ئێوە پێویست نی‌یە کە ژنەکانتان تەڵاق بدەن لە کاتێکا ئێوە نەچوونە لایان، پێشەوا حەنەفی ئەڵێ کۆبونەوەی مێرد لەگەڵ ژنا لە شوێنێکی چۆڵدا بە چوونە لایان دائەنرێ بە مەرجێ شتێ نەبێ ڕێ بگرێ لە چوونە لایان ، وەك نەخۆشی و ڕۆژوو و ئیحرام بەستن بە حەج .

﴿ أو تُفْرِضوا لَهُنَّ فَريضة ﴾ یامەگەر کە ئێوە دیاری بکەن بۆ ژنان مارەیی‌یەکی ناو براو، یانێ ئەگەر ئێوە ژنێکتان مارە بڕی وە لە کاتی مارە بڕیندا ناوی مارەیی بۆ نەبرابوو لە پاشا تەڵاقیاندا بەر لەوەی بچێتە لای ئەوا ئەو ژنە مارەیی نی‌یە ، بەڵام ئەو ژنە شایستەیە بەخششێکی بدرێتێ ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَمتعوهُنَّ ﴾ وە ئێوە دوای تەڵاق دانی‌ی ئەو ژنانە ببەخشن بەوان ﴿متعة﴾ واتە بەخششێ بۆئەوەی ئەو دوور بوونە لەوان تۆڵەی بکرێتەوە بەو بەخششە و دڵ خۆش بن پێ‌ی .

﴿ على المُوسِعِ قَدَرُه وَ عَلَى المُقْتِرِ قَدَرُهُ ﴾ پێویستە لەسەر ساماندار بە ئەندازەی توانا و شایانیی خۆی ولەسەر هەژار بە ئەندازەی توانا و شایانی خۆی ، دیاری کردنی پێویستە بە بیر و ڕای دادوەر بێ .

هەندێ لە زانایان ئەڵێن : ئەو ئایەتە هەتۆتە خوارەوە دەربارەی مرۆڤێکیی دانیشتووی مەدینە لە کاتی مارە بڕینی ناوی مارەی بۆ نەبرابوو ، بەر لە چوونە لای تەلاقیدا ، خوا ئەفەرمویێ: ئێوە ببەخشن بە ژنەکانتان شتێ کە بەو شتە بەهرەمەند و دڵ خۆش بن .

﴿ مَتاعاً بالْمَعْروفِ حَقّاً علی المُحْسِنِينَ ﴾ ئێوە ببەخشن بەو ژنانە بە گوێرەی خۆتان و یاسا پەسەندی بکا دوور بێ لە ستەم و لە زیان ، ئەو بەخششە پێویستە لەسەر ئەو کەسانە چاکە بۆ خۆییان ئەکەن بەتایبەتی ئەوان سسوود وەرئەگرن ، ئەو کارانە لە پیاو چاکان ئەوەشێتەوە .

بە کورتی ئەو کەسەی ژن مارە ئەبرێ ، ناوی مارەیی نابرێ لەکاتی مارە بڕینەکەدا لە پاشا تەلاقی ئەدا ئەو ژنە مارەیی بۆی پێویست نەکراوە ، بەلام پێویستە مێردەکەی بەخششێکی بداتێ بە گوێرەی تواناای خۆی ، خاوەن سسامان و مام ناوەندی و هەژار بە گوێرەی باوی کات و جێیگەی و توانا .

لای پێشەوا شافیعی پێویستە ئەو بەخششە لە بیست درهەم کەمتر نەبێ ، لای پێشەوا حەنەفی لە نیوەی مارەییی تێپەڕ نەبێ .

﴿ وَ اِنْ طَلَقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ انْ تَمَسوهُنَّ وَ قَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَريضةً ﴾ وە ئەگەر ئێوە ژنەکانتان بەرەلا کرد بەر لەوەی بچنە لایان ، ئێوە ناوتان برد بۆیان مارەیی لە کاتی مارە بڕیندا لەدواییدا بەرەلاتان کردن .

﴿ فَنِصْفُ ما فَرَضْتُمْ ﴾ دوایی نیوەی ئەو مارە بڕینە بۆئەوانەو ، پێویستە بیدەن بە ژنەکانتان ، بەر لە هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هەر کەسێ ژنی خۆی تەلاق بدایە بەر لە چوونە لای باناوی مارەی بۆ ببرایە هەر بەخششیان ئەدانێ نەك نیوەی مارەیی ، وەك لەمەو دوا لە سسورەتی (الأحزاب) دا لە ئایەتی (٤٩) دا باسی ئەکرێ .

﴿ اِلاّ اَنْ يَعْفَونَ اَوْ يَعْفوا الذى بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِكاحِ ﴾ مەگەر ئـەو ژنانـە واز لـەو مافـە بهێنن کە هەیانە بەسەر مێردەکانیانەوە ، لە نیوەکەی خۆیان ببورن بـۆ مێردەکانیـان ، بـەو مەرجە ژنەکان ژیر و باڵغ بن ، یا کەسێکی ئەوتۆ کە بەستن و تێکدانی نیکـاحی بەدەسـتە کە مێردە واز بهێنێ لەو مافەی خۆی ، کە لەسەر ژنەکەیە ، هەموو مارەیەکە بـدات بـەو ژنە ، یانێ ژنان لە نیوەی مارەیی زیاتر نابەن مەکەر مێردەکانیان بەو هەموومارەییەیە ڕێـز لە ژنەکانیان بگرن وو بیان دەنێ .

﴿ وَ اَنْ تَعفوا اَقْرَبُ لِلْتَّقوى ﴾ وە واز هێنان ئەی ژنان و پیـاوان لـە مـافی خۆتـان بـە جۆرێ پیاوان هەموو مارەیی‌یەکە بدەن بە ژنان ، ژنانییش لە لایەن خۆیانەوە واز لە نیـوەی خۆیان بهێنن ، ئەمە نزیکە لە خوا ترسان ، لەلایەن مێردەوە تیمـاری دڵـی بریـنداری ژنـە تەڵاق دراوەکان بکا ، وە لەلایەن ژنەوە ئەبێتە هۆی بۆ خۆی و نەپچڕانی خزمایەتی کـۆن وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَ لا تَنسَوا الفَضْلَ بَيْنَكُمْ ﴾ وە ئێوە لە بیری خۆتانی مەبەنەوە چاکە و ڕێز لێ گرتنی نێوان خۆتان ، یانێ مێرد بیری ئەوە بکاتەوە کە ئەو ژنە لەلای ئەو بووە و ئێـستا وازی لێ هێناوە با بە هەموو مارەیی یەکە دڵ خۆشی بکا ، ژنیش بـیر بکاتـەوە کـە ئـەو پیـاوە بـەو تەگەیشتووە و چاکەی لێ نەدیوە چاکتر وایـە هیـچ شـتێکی لێ وەرنـەگرێ ، کەواتـە پێویستە خۆیان ماندوو نەکەن و بەردەمی دادگا لە یەکتری نەگرن و پارەی زۆر نەدەن بـە پارێزەر .

﴿ اِنَّ اللّٰهَ بِما تَعْمَلونَ بَصيرٌ ﴾ بە ڕاستی خوا بەو شتەی ئێوە ئەیکەن لـە بەخشـش و لە ڕێز گرتن لە یەکتری زۆر بینایە و ڕێز و چاکەتان وون نابێ .

بە ڕاستی خوای گەورە فەرمانی داوە بە پاراستنی نوێـژ و ڕاگرتنـی ، بـەجێ‌هێنانی لـە کاتی خۆیدا کە هەموو مەرجەکانی تێـدا بـێ ، دوای ئـەوە خـوای گـەورە باسـی نوێـژی خستۆتە نێوان ژنانی تـەڵاق دراو و ژنـانی مـێرد مـردو ، باسـی ئـەو ژنانـە بـەو ئایەتانـە ئەوکارانە ئەگرێتەوە پەیوەندی بە خوێنی ئادەمیزادەوە هەیە ، وایش ئەبێ لەکاری ژناندا بـە

چەوت و چەوێڵی دوای ئارەزووی خراپی خۆیان بکەون ، بۆیە خوای میهرەبان باسی نوێژی خستەنێوان ئەو ئایەتانەوە هەتا بەو نوێژە بیری ئادەمیزادی بخاتەوە ژن ، واز هێنان لە ژن لە ڕێگەی پەرستن لایان ئەدا .

بەڵکو پێویستە ملکەچ بن بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا کە لە هەموویان گەورەترنوێژە ، چونکە نوێژ پەرستنێکە قەدەغەی داوێن پیسی و خراپە ئەکا ، بیرکردنەوە و پاڕانەوە لە خوا پێمان ڕائەگەیەنێ کە کار و ئیشی ژنان و ژیانی ئەمڕۆ با زۆریش بن نابێ ببنە هۆی لەبیر چوونەوەی پەرستنی خوا کە سوودی پاشەڕۆژی تێدایە بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ:

حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾

﴿ حافِظوا عَلى الصَلاتِ ﴾ ئێوە بەردەوام بن لەسەر ڕاوەستانی نوێژەکان و پاراستنیان لە گاتی خۆیانا بە هەموو مەرج و پێەیست و سونەتەکانیانەوە ، بەو شێوەیە پێویستە بکرێن ، لە ئایەتی (١١٠) سەرەوەدا باسی کاتەکانی نوێژ بە هەموو جۆرەکانی ی و مەرجەکانی بە درێژی باسیان کراوە .

﴿ وَ الصَلاةِ الوُسْطى ﴾ وە بەردەوامیشن لەسەر ڕاگرتنی نوێژە ناوەنی‌یەکە ، یا نوێژە گەورەکە ، ئەو نوێژەی کەوتۆتە نێوان نوێژەکانی ترەوە ، زانایان هەریەکەیان بیرێکی

تایبەتیان هەیە بـۆ دیـاری کردنـی ئـەو نوێـژە ، ئـەوەی زۆربـەی زانایـان لـەسـەریەتی و بەناوبانگە ئەڵێن : ئەو نوێژە نوێژی عەسرە ، گرنگی پێـدراوە لەبەرئـەوەی کاتەکـەی بـە زۆری ئادەمیزاد خەریکی کارکردنن ، وە کەوتۆتە نێوان نوێژەکانی رۆژ کە نوێژی بـەیانی و نیوەرۆ و ، نێوان نوێژەکانی شەو کە نوێژی مەغریب و عیشایە .

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێـژە پێویستەکان پێنـج نوێـژن ، چونکـە ووشـەی ﴿الصَلَواتِ ﴾ بەلای کەمیەوە بەڵگەیە لەسەر سێ نوێژ ، ﴿ الصَـلاةِ الوُسْـطى ﴾ بەڵگەیـە لەسەر زۆرتـر لـە سـێ نوێـژ ، زۆرەکەیشـی نابـێ چـوار بـێ بەتەنـها ، چونکـە نوێـژە ناوەڕاستەکەمان بۆ دەرناکەوێ ، کەواتە پێویستە جگە لە ﴿ الصَلاةِ الوُسْطى ﴾ نوێـژی تر هەبێ لەگەڵ ئەو سـێ نوێـژە دابـێ بـە چـوار نوێـژە ، ئـەو نوێـژە لـە ناوەڕاسـتی چوارەکاندا بێ ، کەواتە دوو نوێژ لەلایەکەوە بێ ،. دوو نوێژی تر لەولایەکـەوە بـێ کـە خەموویان ئەکەن بە پێنج نوێژ .

زانای بـەڕێز خـاوەنی تەفسـیری ( المنـار ) گێراویەتیـەوە لـە مامۆسـتای خۆیـەوە ، (موحوممەد عەبدە ) کە بەڕاستی وتویەتی : ( ئەگەر لەبەرێك هاتنی زانایانی پێشوو نەبوایـە کە فەرمویانە ، مەبەست لە ﴿ الصَلاةِ الوُسْطى ﴾ یەك نوێژە نەك پێنج نوێژ بە تەواوی بـێ دەرکردن ، بە ڕاستی مانای ﴿ الصَلَواتِ ﴾ پێنج نوێژە ، مەبەست لە ﴿ الوُسْـطى ﴾ یانـێ نوێژێ گەورەتر نەك نوێژی ناوەنجی ، خوای گەورە گرنگی بە نوێژی گەورەتر ئەدا کە ئەو نوێژە دڵی نوێژکەر ئاگای لە کردنی بێ ، دەرونی ئادەمیزاد بە پوختەیی بەرەو لای خوا بێ بەیادەوە بـۆ خـوا و بـیر بکاتـەوە لـە فـەرمودەی خـوا ، نـەك وەك نوێـژی دووڕووان و بێئاگایان لە نوێژەکانیانا ) کۆتایی قسەی ( موحوممەد عەبدە ) ئەوەیە یانی ئێوە چـاودێری نوێژەکان بکەن بەو جۆرەی کە دڵتان و دەمتان یەك بگرێ بە ترس ولەرزەوە بۆ خوا .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمەیە جارێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نوێژی نیـوەرۆی ئـەکرد ڕیزێ یا دوو ڕیزو نوێژیـان ئـەکرد ، زۆربـەی دایشـتوانی مەدینـە خـەریکی بازرگـانی و حەسانەوە بوون ، بۆیە خوای گەورە زۆر بە گرنگەوە فەرمانی پێدان چـاودێری نوێژەکـان

بکەن بەپەرۆشەوە ڕویان بگرن ، نەوەك هەندێ شت بین بە کۆسپ بۆ چـاودێری کردنـی نوێژەکان ، وەك تەمەڵی کردنی بۆ نوێژی بەیانی لەبەر سەرمای زستان وپایز ، لە ژێر لێفە و لەسەر دۆشەکی گرەم ونەرم نەیە دەرێ ، لە هاوین و بەهاردا لەبەر کورتی شەو لەبـەر خەو ڕانەپەڕن بۆ نوێژەکان زۆر روون و ئاشکرایە لەکاتی هەموو نوێژەکاندا هەندێ هـۆی تەمەڵی هەن بۆ نموونە لە نوێژی نیوەڕۆدا لەبەر پشوو دان لەبەر بازرگـانی و نـان خـواردن نوێژەکەیان لەیاد نەمێنێ لە نوێژی عەسردا کۆکردنەوەی شت و مەك لە دوکـاندا و لـە بازاڕدا ، هاوردنەوەی ئاژەڵ بۆ جێگەی شەویان ، لە نوێژی خۆرئاوادا خۆ گـۆڕان و نـان خواردن، لە نوێژی خەوتناندا دانیشـتن و گاڵتـە و گـەپ و دانیشـتن لای تەلـەفزیۆن و ڕابواردن.

﴿ و قوموا للّهِ قانِتِينْ ﴾ وە ئێوە هەڵسن لەبەر فەرمودەی خوا بە پاڕانەوە و ڕووکردن بۆلای خوا لە نوێژەکانتانا بە ترس و لەرزەوە و هەست بە گەورەیی خوا و سامی بکـەن ، واز لەو شتانە بهێنن وەرتان ئەگێڕن لە ڕووکردنتانا بۆلای خوا بە ڕاستی بە بـێ دەنگـی و بە بێ وورتە لە خزمەت خوادا ڕاوەستن .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە ئەمەیە : لەسەردەمی ئیسلامدا نوێژکەران لـە کـاتی نوێژدا گفت وگۆیان لەگەڵ یەکتری ئەکرد نوێژیش پوچ ئەکاتەوە .

خوای گەورە پاش فەرماندان بە پاراستنی نوێژ بە ڕاوەستانەوە و بـە بـێ دەنـگ و بـێ وورتە وورت فەرموی :

﴿ فَاِنْ خِفْتُمْ فَرِجالاً ﴾ دوایی ئەگەر ترسان لە دوژمن و لافـاو و دڕنـدە و شـتی تـر دوایی ئێوە نوێژەکانتان بکەن بە پیادەیی و بە ڕۆشتنەوە ، چۆنتـان بـۆ لـوا ، ڕووتـان لـە ڕوانگە بێ یان نا ، بتوانن بوەستن یان نا ، بەلای پێشەوا حەنەفیەوە نوێژکردن بە پیادەیی کاتێ دروستە کە نەتوانرێ بووەستن .

﴿ اَوْ رُكْباناً ﴾ یا بەسواری نویژەکانتان بکەن لە کاتی ترسدا چۆنتان بۆ پێك هات هەروەك باسکرا .

﴿ فَاِذا اَمِنْتُمْ فَاذْكُروا اللّٰهَ كَما عَلَّمَكُمْ ما لَمْ تَكونوا تَعْلَمون ﴾ دوایی کاتێ ئێوە کەوتنە ئاسایش و ترستان نەما ، ئێوە یادی خوا بکەن بە نویژ کردن بەو جۆرەی خوا فێری ئێوەی کردبوو ،شتێ ئێوە نەتان ئەزانی لە چۆنیەتی کردنیان بە هەموو مەرج و پێویستیەکانیانەوە ، وەك نوێژێ لەکاتی بێترسی دا ئەکرێ ، بەبێ دەنگە دەنگ و بەبێ جولە جولْ ، بە ڕاوەستانەوە بە ترس و لەرزەوە یادی خوا بکەن و مەڕۆن بە ڕێگەدا یا سوار بن .

هەندێ لە سودەکانی نوێژ بۆ ئادەمیزاد بۆ ئەندامەکانی کۆمەلْ و بۆ کۆمەلاَیەتی باس ئەکەین :

١. نوێژ کردن خەفەت لە دەروونی ئادەمیزاددا هەلْئەگرێ ، ئاسایش و خۆشی ئەڕێژێ لە دەروونداو ئازار و گیرو گرفت لە بیر ئەباتەوە ، گیانی ئادەمیزاد بەرز ئەکاتەوە لە نێو ئەم جێگە هەلْخلیسکانەی ژیاندا ، لە نێو ئەم بوونەوەرانەدا کە پڕن لە دەردو ئازار و گیر و گرفت و ناخۆشی بە هۆی ڕووکردنیان بۆلای خوای گەورە ، ئەو بارە گرانەی خەفەت و ستەم قورسایی کردووە لەسەریان و پشتی ی شکاندوون لەسەر خۆیانی لائەبەن ، ئەو تاریکی و لێلە بەرچاوی گرتوون بە کەمترین ماوە لە نوێژدا کەروو ئەکەنە بارەگای خوا ڕوونیی ئەکەنەوە ، کەواتە بۆ ئەم مەبەستە گەورانە هەلْسن و بە ڕاوەستانەوە بەبێ دەنگ و بەبێ ترس نوێژەکانتان بکەن و ئاگاتان لە خوا بێ .

٢. ووشەی ﴿ حافِظوا ﴾ هاوبەشە لە نێوان دوو کەسا ، یانێ ئەگەر ئادەمیزاد چاودێری نوێژەکانیان بکەن خوای گەورە چاودێری ئەوان بە هۆی نوێژەوە .لە گوناە وسەرشۆڕی دوژمنانیئیسلام، لەداوێن پیسی و خراپە کردنیان لەزیندە بەچالْی و خانووبەسەرداڕووخان ئەیانپارێزێ ، هەمیشە خوا بەبەزەیی لەگەلْیان ئەبێ ، وەك خوا

ئەفەرموێ لەسورەتی ﴿ ئـەلمائیدە ﴾ لەئایـەتی (١٢) دوازدەدا ﴿ إني معكم لئن أقمتم الصلاة وآتوا الزكاة ﴾ بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم بۆسەرکەوتنتان بـۆ پاداشـت دانتـەوەتان ئەگەر ئێوە نوێژەکانتان ڕاوەستێنن و زەکاتەکانتان بدەن بەهەژاران . بـەڵام نوێـژێ بکـەن لەناوەڕۆکدا نوێژبێ .

٣. ئەوکەسانەی نوێژ ئەکەن دوو تاقمن :-

**یەکەمیان:** ئەو کەسانەن نوێژ ئەکەن و دڵیان بەڕاستی لای خـوا ولای خۆیانـە ، ئـەزانن ڕویان بۆ لای خوا کردووە ، داوای ڕانومایی هەر لەو ئەکەن ، لەخزمەت ئەوداوەستاون، خوا بەمیهرەبان ئەزانن ، هەر سوپاسی ئەو ئەکەن . بەخاوەنی ڕۆژیی دوایـی ئـەزانن ،هـەر ئەو ئەپەرستن و داوای یارمەتی هەر لەو ئەکەن ، ئەگەر ئەو کەسە بەو جـۆرە بـوون خـوا خۆی ئەیانزانێ کەڕاستە لەو کاتەدا بێگومان خوا سەریان ئەخا ، لەهەموو کەند و کۆسپێ ئەیانپارێزێ ، ئەکەوێتە فریایان .

**دووهەمیان:** ئەوکەسەی بەڕواڵەت و لەبەرچاوان نوێژئەکەن ، ئەندامەکانیان بۆسـەرەوەو بۆ خوارەوە بەرز و نزم ئەکەنەوە بەزمانیش ووشە و ڕستە کاتی قورئـان ئـەخوێنن ، بـەڵام خوا و خۆیان ئەزانن بەهیچ جۆری دڵیان لای نوێژەکانیان نیە بەڵکو لای دوکـان و پـارە و کێڵگەو بازاڕو بازرگانیو قەرز و ئاژەڵ و سامان پەیدا کـردن و خـێزان و ژنـەکانیان و شتی ترەوەن ، ئەو کەسانە درۆزن و دووڕوون ، پەیوەندیان نەبـەخواوە هەیـە ، نەبـەنوێژە وەلـەناوەڕۆکا ئەوکەسـانە جێگـەی خـەشمی خـوان و نایانپـارێزێ ، وەتووشـی چەندین گیروگرفت و سەر شۆڕی و چەوسانەوەو کوشتن و بڕین و تاڵان و دەربەدەری و بزسـێتی ئەبن، هەموو کاتێ دڵ تەنگ و بێ ئارامن، وە پـارەو پـول و پلـە پەرسـتن، هـەموو کاتـێ کاربەدەستان ئەکەن بە بتی خۆیان، وە خواو خۆیان ئاگادارن کە بەو جۆرەن، ئیتر گلـەیی لە خۆیان بکەن، خۆیان و کارو کردەویان هەموویان بەد ناویان بۆ دێنن.

٤- سوودی نوێژ: بە تاقی کردنەوە بۆمان سەلماوە واز هێنان لە نوێژ زۆر جاران سـەر ئەکێشێ بۆلای بێ باوەڕی، هەروەها بێ باوەڕان هیچ پاکیان نی یە لە هەموو خراپەیێك کـە

ئەیکەن، هەروەها ئەو کەسانەیش نوێژ ناکەن هیچ نرخێ بۆ خراپەو گوناەکردن دانانێن. وە لە هەموو جێگەیە بێ باوەڕی و نوێژ نەکردن ڕەگی داکوتا بێگومان داوێن پیسی و گوشتن و بڕین و شتی تری خراپ بنج دا ئەکوتێ، وە هەموو کارێکی خراپ لە نوێژ نەکەران ئەوەشێتەوە.

بەڵگە لەمە ڕونترمان دەست ناکەوێ کە چۆن لەم سەردەمەی ئێمەدا پەرەی سەندووە جێگەی مەی خواردن بە زۆری لەم لاولای خیابانە گشتیەکان، وەجێگەی داوێن پیسی و سوڕدان، قومارخانەی بێ شومار، دزی و دەست بڕین و تالآن، تڕازوو گەزبازی، ڕووتی ژنان و بێ شەرمی، بلاوبوونەوەی ئەوانەو شتی تر لە نێو موسوڵمانانندا هەموویان لە واز هێنان لە نوێژ ئەناسرێن. بەڵگەیشمان ئەمەیە ژن و پیاوە لاوەکانمان نوێژ کەربوون ئەو جۆرەکارە خراپانەیان نەئەکردو نەئەبینراو نەئەبیستراوە مەگەر کەم جاران، بۆیە ﴿پێغەمپەر﴾ ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ ﴿ ألعَهدُ بيننا وَبَيْنَكُم الصَّلاة ﴾ یانێ پەیمان لە نێوان ئێمەو ئێوەدا نوێژە ﴿فَمَنْ تَرَكَها فَقد كَفَرَ ﴾ دووایی بە ڕاستی هەر کەسێ واز لە نوێژ بهێنێ بە ڕاستی بێ باوەڕە.

ئەو کەسەی بلێ: من بڕوام بە خواو بە پێغەمپەر هەیە من موسڵمانم، ئەو گفت و گۆیە ناگاتە فریای بەمەرجێ کردەوەی وەك کردەوەی بێ باوەڕان و خوانەناسێ، خۆ ڕوون و ئاشکرایە خوا نەناسان شەرمەزار نابن و هەست بە دڵە خۆرپێ ناکەن لە نەکردنی نوێژدا، وە بگرە باوەڕیشی پێ ناکەن، وەبە ئاگاداری هەموو کەس نوێژەکانیان ناکەن، هەر لەبەر ئەوەیە بڕوایان بە نوێژو بەو کەسە نیە نوێژی پێویست کردووە، هەروەها زۆرترین لاوانی بە ناو موسڵمانی ئەمڕۆ بە ئاشکرا نوێژەکانیان ناکەن، بگرە گاڵتە بە نوێژو نوێژکەران ئەکەن. کەواتە ئەبێ جیاوازی نێوان ئەمان و ئەوان و بێ باوەڕان چ شتێ بێ؟.

٥- نوێژکردن وەك میوان بانگ کردن وایە، هەروەك ئادەمیزاد خوان و میوەو خواردنەوەی جۆراو جۆر ئەڕازێنێتەوە بۆ میوانەکەی، هەروایش خوای گەورە لە شەوو

ڕۆژێکا پێنج جار بانگی بەندەکانی خۆی ئەکا بۆ میوانداری بەکردنی نوێژەکانیان و بەبێ جیاوازی پایەو مەرجەکانیان، بۆ ئەوەی لە بریتی کردنی نوێژەکانیان لە گوناهە جیاوازەکان و جۆر بە جۆرەکانیان خۆش ببێ.

حەکیمی کوڕی حەرەس دانیشتوی شاری تایف کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەگەڵ باوك و دایك و ژن و منالەکانی. لە پاشا کۆچی دووایی کرد، وە ئەو ئایەتەی دووایی هاتە خوارەوە میراتبەرانی هاتنە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەویش ژنەکەی بێ بەش کرد لە میرات. بەڵام فەرمانی دایە کە ساڵی ڕەبەق لە کەلەپوری مێردەکەی بەخێو بکرێ. ئەم ئایەتەی دوایی دوو شتمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە: یەکەم ژنەکە پێویستە ئازوقەی ساڵێك و شوێنی خەوتنی بۆ دابین بکرێ.

دووەم: ساڵێکی تەواو عیدەی ژنی مێرد مردووە، وە ئەتوانێ لە جێگای مێردەکەیابێ، وەك ئەتوانێ بچێتە دەرەوە.

وە ئازوقەدان بە ژنی مێرد مردوو دیاری کردنی جێگەی خەوتن بۆی کە بەم ئایەتە پێویست کراون، بە میرات پێدانی ژن بەهۆی ئایەتی میراتەوە، عیدەی ساڵێ بە چاوەڕوان کردنی چوار مانگ و (١٠) ە ڕۆژ فەرمانەکانیان گۆڕاوە، وەك لەمەو پاش باس ئەکرێ خوا بۆ ڕوون کردنەوەی کارەساتی حەکیمی کوڕی حەرس ئەفەرموێ:

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن

مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾

﴿ وَالّذينَ يتوفون مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أزْواجاً وصية لأَمْزْ لأزاواجهم ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ئەمرن لە ئێوە، وەبەجێ دێڵن ژنـان ئەوان سپاردە بکەن بە سپاردن بۆ ژنەکانیان و پێویستە لەسەریان بەر لە مردنیان و بەڵێن وەرگرن لە میرات بەرەکان.

﴿ مَتاعاً إلَى الْحَولِ غَيْر إخْراجٍ ﴾ ئێوە دڵ خۆشیان بکەن بـە دڵ خۆشـکردن بـەهۆی ئازوقەو بەرگ و جێگەی دانیشتن هەتا ساڵێ دەریان مەکەن لەو جێگەیە بۆیان بڕیـاردراوە بەر لە کۆتایی ساڵەکە. یانێ پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی ئەمرن بەر لـەوەی بمـرن پـەیمان وەرگرن لە میرات بەریان کە ژنەکانیان بەخێو بکـەن لـە کەلـەپوری خۆیـان بـۆ مـاوەی ساڵێ، وەدەریشیان نەکەن لەو جێگەیە بڕیاردرابوو بۆیان.

دەستوورو یاسا لە سەردەمی هاتنی ئیسلام بـەو جۆرەبـوو ژنـی مـێرد مـردوو مـیراتی نەئەدرایە، وە عیدەیشی یەك ساڵ بوو، لە پاشا عیدەی ساڵەکە گـۆڕرا بـە چـوار مـانگ (١٠)ە ڕۆژ بە گوێرەی فەرمانی ئایەتی (٢٣٤) لە سورەتی ی ئەلبەقەرە، وە بـەخێوکردنی ژن بۆ ماوەی ساڵێ گۆڕرا بە میرات پێدانی بە ئەندازەی چواریەك یا هەشت یەکێ تەواوی میرات بە گوێرەی بڕیاری ئایەتی (١٢) دووانزە لە سورەتی (نیساء)دا.

﴿ فَإنْ خَرَجْنَ فَلا جُناحَ عَلَيْكُمْ فِي ما فَعَلْنَ فِي أنْفُسِهِنَ من مَعْـرُوفٍ ﴾ دوایـی ئەگـەر ئەو ژنانە چوونە دەرەوە پاش کۆتایی ساڵەکە هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نیە لەو شتەی ئـەو ژنانە ئەیکەن بۆخۆیان لە شوکردن و خۆڕازاندنەوەیان لە شتێ یاسـای ئیسـلام پەسـەندی بکا. نەك بەجۆرێ ئیسلام قەدەغەی کردبێ.

﴿ وَاللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ وە خوا بە دەسەتە بۆ سزادانی ئەو کەسانە فەرمانی خوا بەجێ نایەنن هەرشتێ خوا بیکا ڕاستەو لە جێگەی شیاوی خۆیا دای ئەنێ بە گوێرەی کات و پێویست ، کاتێ ئایەتی (٢٣٦)ی ئەم سورەتەی ئەلبەقەرە هاتە خوارەوە مرۆڤێ ووتی: ئەگەر ویستم چاکە بکەم لەگەڵ ژنان ئەیکەم، وە ئەگەر ئارەزووم نەبوو نای کەم، بۆ روون کردنەوەی ئەو ڕوداوە خوا فەرمووی:

﴿ وللمطلقات مَتاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقاً على الْمُتَّقِينَ ﴾ وە بۆ ژنە تەڵاقدراوەکان هەیە بەخششێ بۆ دڵ خۆشکردنیان بە ڕێگەیەکی چاك یاسا پەسەندی بکا لەگەڵ چاودێری کردنی توانای مێرد لە هەژاری و ساماندا، وەك لە ئایەتی (٢٣٦)دا لە سورەتی ئەلبەقەرە باسی کرا. ئەو بەخششە پێویستە لەسەر ئەو باوەڕدارانە خۆیان ئەپارێزن لە پت پەرستی. ئەو ئایەتە هەموو ژنانی تەڵاقدراو ئەگرێتەوە وە بۆ بەخشش پێدانیان. بەڵام بۆ هەندێکیان پێویستە، وە بۆ هەندێکیان چاك وایە بیاندرێتێ. وەك لە خوارەوە ڕوون ئەبێتەوە:

وە ژنانی تەڵاقدراو چوار تاقمن:

١- ژنێ تەڵاقدرابێ و مێردەکەی چوبێتە لای، وە لە کاتی مارە بڕینا ناوی مارەیی بۆ بڕابێ ئەو تاقمە پێویستە تەواوی مارەیی بدرێتێ لەگەڵ بەخششێ (المتعە) بە گوێرەی توانا وەك لە ئایەتی (٢٢٩) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی کرا، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر پێدانی بەخشش.

٢- ژنێ تەڵاقدرابێ و مێردەکەی نەچوبێتەلای، وە ناوی مارەیی بۆ نەبڕابێ لە کاتی مارە بڕینیدا بەر لە تەڵاق دانی، ئەو تاقمە پێویستە نیوەی مارەییان بدرێتێ، وە چاکیش وایە بەخششی بدرێتێ، وەك لە ئایەتی (٢٣٧) لە سورەتی ئەلبەقەرە باسی کرا.

٣- ژنێ مێردەکەی چوبێتەلای و تەڵاقیدا ناوی مارەیی بۆ نەبڕابێتەوە ئەو تاقمە مارەییە بە وێنەی ئەو ژنە تەڵاقدراوە پێویستە مارەییبدرێتێ لەگەڵ بەخششێ.

٤- ژنێ تەڵاقدراو مێردەکەی نەچوبێتە لای لە کاتی مارە بڕینیدا ناوی مارەیی بۆنەبڕابێ ئەو تاقمە مارەییان بۆپێویست نەکراوە بەڵام پێویستە بەخششێ بدرێتێ بە گوێرەی ئەندازەی توانای سامانی مێردەکەی وەك لە ئایەتی (٢٣٦) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا باسکرا.

بە کورتی جگە لە تاقمی سێیەم پێویستە بەخششیان بدرێتێ بە پێی ئەندازەی توانای سامانی مێرد. بەڵام تاقمی سێیەم هەرچەندە پێویست نیە وا چاکە بەخششی بدرێتێ.

﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُون ﴾ هەر بەو جۆرە کە باسکرا خوا ڕوونی دەکاتەوە بۆ ئێوە فەرمانی ئایەتەکانی خۆی ئەوانەیان پێویستە بۆ ئێوە ڕوون بکرێتەوە جا بۆ ئەوەی بیان زانن کاریان پێ بکەن، وە ژیری خۆتان بخەنە کارەوە بۆ پێویست کراوەکان، بۆ ئەوەیش چاکەی هەردووجیهانی تێدابێ بۆتان.

خوای گەورە لەو کاتەدا کە لە ئایەتە پێشوەکانی سورەتی ئەلبەقەرەدا گرنگی زۆری دابوو بە وازهێنان لەو شتانە بە گورجی و گۆڵی لەناو ئەچن، وەك سامان و پلەی ئەمڕۆ ، هانیشی داین ڕوو بکەینە ئەو شتانە هەتاهەتایە بەردەوام بن، وەك چوونە نێو ئاشتی خوازان و ئاشتی‌یەوە وەك ئایینی پیرۆزی ئیسلام وە بەگیان و دارایی خۆمان بیپارێزین ئارام بگرین لەسەرئەو شتانە خوا لەسەرمانی پێویست کردووە، بەبێ ماندوو بوون هەموو ئادەمیزاد بانگ بکەین بۆلای ئایینی ئیسلام چاوەڕوانی یاریدەی خوابین پاش ئەوانە هەموو خوای گەورە فەرمانی خۆمانی بۆ باس کردین، لەگەڵیانا چەندین پەندو ئامۆژگاری تری ئاراستە کردین... هەموو فەرمانە پێویستەکانی بە کورتی ئەمانەی خوارەوەن:

١- فەرمانی پێداین بە ئایەتی (٢١٥) لە دارایی خۆمان بەشی باوك و دایك و خزمان و هەتیوان بدەین.

٢- بە ئایەتی (٢١٨) فەرمانی پێ داین کە ڕەوایە جەنگ کردن لەگەڵ پت پەرستان لەهەر جێگەیەك بن لەهەر کاتێکدا دەستمان کەوتن. با لە مانگەکانی ڕێزدارا بن. بۆ ئەوەی تۆڵەی دەست درێژی کردنی ئەوان بۆ سەرمان لەوانی بکەینەوە.

٣- وە بە ئایەتی (٢١٩) فەرمانی پێداین کەبەکارهێنانی مـەی، و قومـار گوناهەکـەیان زۆرگەورەترە لەسودەکانیان .

٤- وە هەر لە ئایەتی (٢١٩) فەرمانی پێداین ئەوەندە ببەخشین لە دارایـی خۆمـان بـە هەژاران لە توانامانا دەرنەچێ، خۆمانی پێ کۆڵەوار نەکەین.

٥- وە لە ئایەتی (٢٢٠) فەرمانی پێدایـن واز لـە هـەتیوان و سـامانەکانیان نـەهێنین. بەڵکو داراییەکانیان تێکەڵاویی دارایی خۆمانیان بکەین، هەتیوان بە برای خۆمانیان دابنێـن، چاکەیان لەگەڵ بکەین.

٦- بە ئایەتی (٢٢١) فەرمانی پێداین ژنانی بت پەرست مارە نەکەین هەتا باوەڕ ئەهێنن سامان و جوانی ئەوان کارمان تێ نەکات.

٧- ئایەتی (٢٢٣) فەرمانی پێداین نزیکی ژنانی حەیزدار نەکەوین هـەتا پـاك ئەبنـەوە، لەش پیسی خۆیان دەرئەکەن، چونکە هەردوولایان قێزەونن.

٨- بە ئایەتی (٢٢٣) فەرمانی پێداین ژنان وەك کێڵگەوان پێویستە لـە جێگەیەکـەوە بچنە لایان شایانی تۆو سەوزکردنبێ. نەك لە پشتە کە تۆوی تێـدا نـاڕوێ، قێزەونـترە لـە حەیز کە چونەلای قەدەغەیە.

٩- بە ئایەتی (٢٢٤ - ٢٢٥) فەرمانی پێداین ئەو کەسانە سوێند ئەخۆن، خوا ئەکـەن بە نیشانە و سوێندەکانیان تێ ئەگرن کە چاکە لەگەڵ ئادەمیزاد نەکەن بە دارایی خۆیـان، بە تایبەتی خزمانیان، بۆمانی ڕوون کـردەوە ئـەو سـوێندانە ئەبنـە هـۆی بـێ بـەزەیی خـوا لەگەڵیان کە چ کەسانێکن و کامانەن؟.

١٠- بە ئایەتی (٢٢٦ - ٢٢٧) فەرمانی پێداین ئەو کەسانە سوێند ئەخۆن نەچنـە لای ژنەکانیان ئەو ژنانە چوار مانگ چاوەڕوان بکەن. لە پاشـا بچنـە لای ژنـەکانیان و بریتـی بدەن بۆ سوێندەکانیان یا ژنەکانیان تەڵاق بدەن.

١١- بە ئایەتی (٢٢٨) فەرمانی پێداین پێویستە ئەو ژنانـە تـەڵاقدراون و ئـاوس نـین، منداڵ نین، یا ئەگەنە ئـەو تەمەنـە بـە تـەمای حـەیز ئـەبن، وە لەوەبـەر حـەیزی پێداهاتبـێ

چاوەڕووان بکەن هەتا سێ پاکی ئەبینن، لەو کاتەدا مێردەکانیان چاکترن بۆ گەڕانەوەیان بۆلای خۆیان، ئەگەر سێبەسێ تەلاقیان نەکەوتبێ، وە مەبەستی ژن و مێرد ئەوەبێ بە چاکی بژین بەیەکەوە.

١٢- بە ئایەتی (٢٢٩) فەرمانی پێدراین ئەو تەلاقەی مێرد بتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی دووجارە بەس، لەئەنجامدا مێرد ئەتوانێ بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی یا تەلاقی بدا بە شێوەیەکی شیرین و یاسایی .

١٣- هەر لەئایەتی (٢٢٩) فەرمانی پێدراین بۆ پیاوان دوست نیە داوای مارەییەکە بکەنەوە لەژنانی تەلاقدراو.

١٤- هەر بەئایەتی (٢٢٩) فەرمانی پێدراین ئەگەر ژنانی مێرد دار ترسان سنورەکانی خوا ڕانەگرن لەگەڵ یەکتری ، ژنان گوناهبارنابن کە بەمارەییەکە خۆی ڕزگار بکا لەدەستی مێردەکەی .

١٥- بەئایەتی (٢٣٠) فەرمانی پێدراین ئەگەر ژن هەرسێ تەلاقی کەوت بۆ مێردەکەی ڕەوا نیە مارەی بکاتەوە هەتا ئەو ژنە پاشان شو نەکا بە پیاوێ تر ، ئەویش بچێتە لای و تەلاقی بدا و عیدەی بڕوا ، لەپاشا مێردە پێشوەکەی مارەی بکاتەوە سەر لەنوێ بەمارەییەکی تری تازە .

١٦- بەئایەتی (٢٣١) فەرمانی پێدراین بەدادپەروەرانە لەگەڵ ژنانی تەلاقدراودا هەڵسین ، بەو جۆرەی بەر لەکۆتایی عیدە بیان گێڕنەوە بۆ لای خۆیان ، ئەگەر هەرسێ تەلاقی نەکەوتبو، یا وازی لێبهێنێ و ئازاری نەدا بەوەی هەر تەلاقیان بدەن و بیان گێڕنەوە. لەدوو جار زۆرتر قەدەغەیە گەڕانەوەیان .

١٧- بەئایەتی (٢٣٢) فەرمانی پێدراین ژنان کە تەلاقدران و عیدەیان ڕۆیشت ویستیان مێرد بکەن بۆ هیچ کەسێ نیە ڕێگەیان لێ بگرێ.

١٨- وەبەئایەتی (٢٣٣) فەرمانی پێدایِن دایکانی شیردەر تەلاّقدرابن یا تەلاّق نەدرابن پێویستە لەسەریان دوو ساڵی ڕەبەق شیر بدەن بەمناڵەکانیان ، بۆ ئەو کەسانە ئەیانەوێ ئەو شیردانەی دووساڵە تەواو بکەن .

١٩- هەر بەئایەتی (٢٣٣) فەرمانی پێدایِن پێویستە لەسەر باوکی مناڵ ئازوخە و بەرگ بەگوێرەی توانای دارایی خۆی و باوی جێگە بیدەن بەژنانی شیردەر، نابێ دایکی مناڵ و باوکی مناڵ ئازار بگەیەنن بەمناڵەکەیان .

٢٠- هەروەها بە ئایەتی (٢٣٣)فەرمانی پێدایِن میرات بەران جێگەی باوك ئەگرنەوە بۆ ئازوخە و بەرگ بەدایکانی شیردەر، ئەگەر ویستیان مناڵەکە لەشیر ببڕنەوە بەڕاوێژی هەردوو لایان گوناهبار نابن.

٢١- هەر بەئایەتی (٢٣٣) فەرمانی پێدایِن ئەتوانن دایەن بگرن بۆ شیردان بەمناڵەکانیان ، وەگوناهیان لەسەر نیە هەرکاتێ کرێ دیاریکرا بیدەن بە بەو دایەنە کرێی شیردانەکە .

٢٢- بەئایەتی (٢٣٤) فەرمانی پێدایِن ئەو کەسانەی ئەمرن و ژنان بەجێ دێڵن ، ژنەکانیان ئاوس نین پێویستە ئەو ژنانە چوار مانگ و (١٠) ڕۆژ پاش مردنی مێردەکانیان چاوەڕوان بکەن ، لەپاشا ئەو شتەی ئەیکەن لە خۆ ڕازانەوەیان وەشو کردنیان بەگوێرەی یاسا گوناهیان لەسەر نیە .

٢٣- بەئایەتی (٢٣٥) فەرمانی پێدایِن ئەگەر کەسێ بەپلار نەك بەزەقی خوازبێنی بکا لەژنیی مێرد مردوو یا تەلاّقدراو بەتەواوی گوناهی لەسەر نیە ، نەك ئەو ژنانەی مێرد بۆی هەیە بیان گێڕێتەوە.

٢٤- بەئایەتی (٢٣٦) فەرمانی پێدایِن ئەگەر ژنەکانتان تەلاّقدران و ناوی مارەییان بەر لەتەلاّقدان بۆ نەبرا بو، بەر لە چونە لایشیان بو، ئەو ژنانە مارەییان بۆ پێویست نەکراوە. بەلاّم پێویستە لەسەر پیاوان دڵ خۆشی ئەو ژنانە بکەن بە بەخششێ بەگوێرەی ئەندازەی توانای دارایی مێرد.

٢٥- (٢٣٧) فەرمانی پێداین بەر لەوەی بچینە لای ژنان ئەگەر تەڵاقدران و، ناوی مارەییان بۆ نەبرابو پێویستە نیوەی مارەییەکەیان بدرێتێ ، مەگەر ژنان و مێردەکان لەیەکتری ببورن.

٢٦- بەئایەتی (٢٣٨ - ٢٣٩) فەرمانی پێداین چاودێری نوێژەکان بکەین ، بەترس و لەرزەوە بەجێگەیان بگەیەنین بەرەو ڕوانگەبێ و بێ دەنگ و وورتە بێ ، ئەگەر ترسمان پەیدا کرد چۆنمان بۆ لوا نوێژەکان بکەین بەرەو ڕوانگە بێبانە؟، بە پیادەیی و ڕۆیشتنەوە بێیانە؟ بەسواری یا بەوەستانەوە.

٢٧- بەئایەتی (٢٤٠) فەرمانی پێداین ئەو کەسانە ئەمرن و ژنیان هەن پێویستە لەسەریان بەر لە مردنیان بەڵێن وەرگرن لە میراتبەرانیان دوو ساڵ ژنەکانیان بۆ بەخێوبکەن ، لەجێگەی خۆیان دەریان نەکەن ، پاش دوو ساڵە کەژنەکان خۆیان چونەدەرێ و خۆیانیان ڕازانەوە بۆ خوازبێنی کەران هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نیە کەلەیاسا دەرنەچن .

٢٨- بەئایەتی ( ٢٤١) فەرمانی پێداین یا پێویستە یا چاك وایە بەخشش بدرێ بە ژنانی تەڵاقدراو بەو جۆرەی یاسا ڕونی کردوەتەوە .

لەمەوپێش ئەو بڕگانە هەمویان بەدرێژی لەم سورەتەی ئەلبەقەرەدا بەدرێژی باسیان کراوە.

قورئانی پیرۆز لەهەموو کاتێکا ئامۆژگاری کەرێکی دڵسۆزە بۆ ئادەمیزاد لەهەموو ڕوێکەوە ، بەردەوام وانەیان پێئەڵێ ، فێری هەموو شتێکیان ئەکا : لەبۆ کۆمەڵایەتی ، دارایی ، ئابووری ، ڕامیاری ، بەرگری ، بۆیە خوای گەورە باسی خۆ چاکەکردنی لەگەڵ یەکتری بۆ کردوون ، زۆرترین فەرمانی کۆمەڵایەتی فێر کردوون .

ئەمەیشیان بۆ ڕوون ئەکاتەوە ئادەمیزاد دوو پەیڕەو پرۆگرامیان هەیە :

یەکەم: پەیڕەو پرۆگرامی ناوخۆ . دووهەم : پەیڕەو پرۆگرامی دەرەوە .

لەیەکەمیانا باسی گیرروگرفتی نێوان خۆیانی بۆ کردن لەمەو پێش لەئایەتـەکاندا ، وەك چاودێری کردنی هەژاران و تەلاقدانی ژنان و شتی تریش .

وەلەدووهەمیانا لەم ئایەتانەدا کەلەمەودوا دێن باسی بـەرگری کـردن لـەئاوو خـاك و دارایی و نیشتمان و ناموس و ئاین و جەنگ لەگەڵ دوژمنانمان بۆ ئەکا ، بۆ ئەوەی بەباشی فێری ببین وێنەمان بۆ دێنێتەوە بەکاروکردەوەی نەتەوە پێشوەکان هەتا بەو بۆنـەوە دەسـت بژاریان بکەین کامەیان چاکە بیکەین بەدەستور بـۆ خۆیـان کامـەیان خراپـن نـەفرەتیان لێ بکەین و تەمێ خواربین بەوان هەتا خۆمانیان لێ دوور بخەینەوە .

کە خوای گەورە لەئایەتی پێشوودا فەرموی : ﴿ کذلك یبـین الله لکـم آیـاتـه لعلکـم تعقلون ﴾ یانی بەو جۆرەی خوا ئەوانەی پێشوی ڕون کردەوە ، ڕونیشـی ئەکاتـەوە بـۆ ئێوە هەمو نیشانە ڕونەکانی خۆی کە پێویستیان بەوان هەیە هەتا ئێوە فێریان بن و ئـەقڵی خۆمانیان بۆ بخەنە کارەوە ، هەمو شتێ بزانن لەکاروباری ناو خۆو دەرەوە.

وێنەمان بۆ لێ ئەدا و ئەفەرموێ :

أَلَمْ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ
فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ثُمَّ أَحْيَـٰهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾
وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾

﴿ أَلَم تَرَ إلى الّذينَ خَرَجوا مِن دِيارِهِمْ ﴾ ئایا موحەمەد تۆ نەتزانیوە و ئاگادار نەکراوی ، بەچاوێکی سەرسوڕێنەرە نەت ڕوانیوە بۆ لای ئەو کەسانە دەرچوبون لە شار و دێهاتەکانی خۆیان بۆ ئەوەی جەنگ بکەن لەگەڵ دوژمنانی خۆیان و بەرگری لە ناموس و ئایین و نیشتمانی زەوت کراو یان بکەن و بیخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان . بەو ئایەتە خوای گەورە ڕوی کردوەتە پێغەمەر بەڕواڵەت . بەڵام لەناوەڕۆکا هەموو باوەڕداران ئەگرێتەوە .

﴿ وَهُم اُلوف ﴾ وەئەو کەسانە هەزاران کەسبون و زۆرتر لە (١٠) هەزار بون ، ئەویش ژمارەیەکی کەم نیە کەچی ترسان لەدوژمنانیان و کۆڵیاندا لەجەنگ کردن .

﴿ حَذَرَالموتِ ﴾ لەبەر ترسی مردن و کوشتن ، ئەیان ویست خۆیان بپارێزن لەمردن ، هەروەها سەری خۆیانیان هەڵگرت پرش و بڵاوبونەوە بەکێو و شیودا بەهیوای خۆ ڕزگار کردن لەکوشتن و مردن .

﴿ فقال لهم الله موتوا ثُمَّ أحياهم الله ﴾ دوایی خوا بەو کەسانەی فەرموو : ئێوە بمرن ، هەمویان بەیەك جاری مردن لەجێگەی خۆیاندا ، لەپاشا خوا ئەو کەسانەی زیندو کردنەوە، بۆ ئەوەی بڕوای بێگومان پەیدا بکەن کەئەوان خاوەنی سوود و زیان نین بۆ خۆیان ، مردن و ژیان بەدەستی ئەوان نیە ، بۆ هەر شوێنێ بڕۆن مردن تووشیان ئەبێ ، ژمارەیان هەرچەندە زۆربێ ، هەتا تێ بگەن هەر بەو جۆرە خوا لەپاشە ڕۆژدا زیندویان ئەکاتەوە .

﴿ إنَّ الله لذوا فضلٍ على النّاسِ ﴾ بەڕاستی خوا خاوەنی بەخشش و میهرەبانی گەورەیە لەسەر ئادەمیزاد ، هەر خوایشە زیندویان ئەکاتەوە ئەمڕۆ بۆ ئەوەی ئەو ئەندازەیە ماویانە لەتەمەنیانا کۆتایی پێ بهێنن ، هەر خوا بەخشندەی ژیان و مردن و ئازوخەی ئادەمیزادە ، ئیتر بۆ ئەبێ بترسن لەجەنگی دوژمنانی ئایین و هەڵبێن لەدەستی مردن .

﴿ وَلَكِنَّ أكثَرَ الناسِ لا يَشكُرونَ ﴾ وە بەڵام زۆرتر لەئادەمیزاد سوپاسی خوا ناکەن لە سەر ئەو چاکانەی خوا بەوانی داوە ، بەتایبەتی کوڕانی ئیسرائیل کە زووّر کاری بەکەس نەکراویان دیوە .

﴿ وقاتِلوا في سبيل الله وأعْلَموا أنَّ الله سَميعٌ عليمٌ ﴾ وەپێویستە ئێوە جەنگ بکەن لەڕێگەی خوادا بۆ ئاشکرا کردن و پەرەپێدانی ئاینی خوا و ڕاگرتنی یاسای خوا ، ئێوە بزانن بەڕاستی خوا ئەبیسێ گفتوگۆی خراپەکاران دەربارەی جەنگی ڕەواتان ، دەست کردنیان بەهێنانەوەی بروبیانوی ناپەسەند ، ئەزانێ بەشاراوەی دڵی ئەوان، سزایان ئەدا لەسەر نەکردنی ئەو شتانەی خوا فەرمانی پێداون لەپێویست کردنی جەنگ لەگەڵ دوژمنانی ئاین و نیشتمان بۆ سەندنەوەی مافی ڕەوای خۆیان .

زانایان درێژەی زۆریان داوە بەمانا کردنی ئەو ئایەتە هەرریەکەیان بەجۆرێ ، ئەوەی شایستە ئەو ڕوداوە بێ ڕێك بکەوێ لەگەڵ مەبەستی ئایەتی دوایی کە فەرماندانە بەجەنگ کردن لەڕێگەی خوادا ، پێویستە مەبەست لەو ئایەتەیش ئەمەبێ دام و دەزگای خوا لەناو هەموو نەتەوەکاندا ڕون بکاتەوە کەهەر نەتەوەیە خۆی ماندو نەکاو خۆی نەدا بەکوشت بۆ بەرگری لەدوژمن و سەندنەوەی مافیی زەوت کراو ، ئەونەتەوەیە مردوی بەشی زیندو خۆرن ، سەر شۆڕو کز و داماوو کۆیلەی دوژمنە ، بەپێچەوانەوە ئەگەر ئازا و خۆگرو پێشمەرگە بوون ، بەرگری لەناموس و ئاین کرد سەر بەرز و سەربەست و خوا پەرستە .

کەواتە چاك وایە لەمانای دەرکەوتوی ئەو ئایەتە لا نەدەین ، خۆمان ماندو نەکەین بەبێ هودە ، ئایا ئەو کەسانەی چونە دەرەوە لەجێگەی خۆیان وهەزاران کەسبون لەترسی مردن چ کەسێ بون ، لەچ جێگەیە بون ، لەچ کاتێکا بوو دەرچونیان،چونکە ئەگەر خوای گەورە بیویستایە ڕونیان بکاتەوە ڕونی ئەکردنەوە ، وەك هەندێ لە شوێنەکانی تری قورئاندا ڕونی کردوەتەوە. بەڵام ئەو ڕوداوە بۆ تەمێ کردن و ئامۆژگاریە لەناوەرۆکا ، ئەوەیشیی مەبەستە نەك ڕوداوی چۆن و چ کەسێکن و جێگەیان لەکوێ بوە ؟ ڕون نەکردنەوەیان جگە لەناوەرۆك و مەبەستەکە هیچی تر ناخاتە سەری.

کەواتە مەبەستی ڕاستی لەو ئایەتەئەمەیە مردن و ژیان هۆیەکانی بۆ لای خوا ئەگەڕێنەوە ، بەتەواوی هەموو کاروباری بونەوەران هەڵئەسوڕێنێ ، پێویستە ئارام بگرین لەژێر هێزی خوادا ، هەر شتێکمان داوا لێ بکا پێویستە بێ چەند و چون و بۆڵەبۆڵ

بچین بەدەمێوە و وایش بزانــن لەئـەنجامدا مـردن و ژیـان بەدەسـتی خوایـە ، خۆپاراسـتن لـەمردن بێ هودەیە ، ترس و خەفەت تەمـەن درێـژ ناکـا و هیـچ ڕوداوێ ناگێڕێتـەوە ، هــەمویان بەدەســت خــوان و ئەبەخشــێ و ئەیباتــەوە ، پێویســتە بزانــین بــەبێ گومانکۆبونەوەی هەزاران کەس و چونە دەرەوەیان بۆ خۆپاراستن لەمردن لەکاتی تەنگ و چەڵەمەدا و ترسێکی زۆرا بوە. ئیتر دەرچونەکەیان لەترسی دوژمنی پەلامـەردەریانبێ یان لەترسی ڕشانەوەبێ ئەوانە هەمویان ناگەنە فریایان .

پێویستە ئێمەی موسوڵمان پەند و تەمێ لەژیان و مێژوی جولـەکـەکان وەرگریـن ، واز لەدۆستانی بێ باوەڕان بهێنین لەنێو خۆماندا ، بیکـەین بەئیشـی ڕۆژانـەی خۆمـان یاسـای قورئانی پیرۆز ، بێ باوەڕان نەکەین بەپەرستراوی خۆمان ، سـامان و ناموسـی خۆمانیـان نەدەینێ و نەیان کەین بەگەورەی خۆمان و ئێمە بە کۆیلەی ئەوان ، هێز و نرخمان نـەمێنێ لای ئادەمیزاد . ئێمەی بەناو موسوڵمان کە بەو جۆرە نەبین دەسەلاتی لـەکیس چومـان و جێگە پیرۆزە تالان کراو و داگیر کراوەکانمان وەرناگرینەوە .

ئەو ئایەتەی پێشو کاتێ هاتە خوارەوە خوای گەورە پێویستی کرد لـەسەر موســوڵمانان جەنگ کردن لـەگەڵ بێ باوەڕان ، هەتا بەو ئایەتە وریایان بکاتەوە تەمێ خوار بین ، هانیان بدا بۆ کۆشش ، خۆیان بۆ بەرز بونەوەی ئاین بدەن بەکوشت ، بزانن هەر ئەمرن و هیــچ شتێ ڕێگە لــەمردن نـاگرێ کەواتـە خـۆ دانـان لەڕێگـەی خـوادا سـەربەرزییەو مانـای شانازییە ، خۆ پاراستن لەمردن سەرشۆڕی و کۆیلەییە و چەوسـانەوەیە ، بۆیـە خـوای گەورە بەئایەتی ( ٢٤٤) ڕو ئەکاتە و موسڵمانان و فەرموی: ﴿ وقـاتِلوا في سـبيل الله ﴾ پێویسـتە ئەوەیشـمان لـە بـیر نـەچێ فـەرماندان بـەو جەنگـە بـەبێ دارایـی ناچێتـە سـەر بۆموسوڵمانان ، بۆیە خوا فەرمانیان پێ ئەدا دارایی و سامانی خۆیان بخەنە کارەوەە بۆ پەیدا کردنی جەنگاوەران و کڕینی چەك و هەموو جـۆرە پێویسـتی بـەرگری لـەبێ بـاوەڕان ، چونکە بەئەندازەی پێویست بەسەرباز پێویستیان بەدارایی هەیە بگرە زۆرتر . ئەو کەسـەی

گوێ بگرێ لەئیستگە و ڕادیـۆی هـەواڵدەران دەربـارەی موچـەی شـالیاری جـەنگ و بەرگری هەندێ لەهەرێمەکان بەتایبەتی ئەمریکای سەرمایەداری خوێن مژ و ڕوسیای بـەناو سۆشیالیستی خوێن ڕێژ ، هەردوو لایان دوژمنی گەلانی بـێ هـێزن موچـەکانیان زۆرتـرە لەملیار دۆلار .

بە داخەوە ئەو پارە قەڵەوە دانراوە بۆ پەرەسـەندنی ستەمو چەوسـانەوەی گـەلانی بـێ هێزو داگیرکردنیان، وە بۆ گاڵتەکردن بە چارەنوسی ئەوان.

پەلاماری ڕوسیای بۆسەر گەلانی هەژار بە تایبـەتی ئەوانـەی هاوسـوێندی بـوون وێنـە مەجـەر، وە پـەلاماری بۆسـەر ئـەفغان و دەربـەدەرکردنی سـێ ملیـۆن لـە هـەژاران و ئاوارەکردنیان بە ڕوتی و بە برسێتی و بێ جێگەو شوێن. وە جەنگ فرۆشتنی ئەمەریکا بـە وولاتە بچووکەکانی کیشوەری ئەمەریکای هاوسنوری خۆی و لایەن گری زا وێنیەکان بە چەك و ئازوقەی جەنگ و پارەی زۆر بۆ ئاوارەکردنی عەرەبـەکانی فەلەسـتین گـەورەترین بەڵگەن بۆیان.

پێویستە ئاوڕی بدرێتەوە لەبی دەنگی نەتەوە یەك گرتوەکان دەربارەی ڕژێمـی عـیراق کە بە چەکی کیمیاویی پەلاماری شاری هەڵچەو خۆشـناوەتی و جیچگـەکانی تـریدا، بـە هەزاران ژن و پیرو منالی بێ تاوانی کوشت. زۆرتر لـە (١٨٠)هەزار کەسی ئەنفال کـردن و زیندەبەچاڵی کردن، وە زۆرتر لە نیو ملیۆن بێ تاوانی تر کوژران و زۆرکەسی تـر بـێ سەرو شوێن، وە پێنج هەزار شارو دیهات ڕوخاند.

بەڵام ئەو چەکەی خوا فەرمانی پێ داوە لە قورئانا، وە ئەو داراییە پێویست کـراوە بـۆ موچەی بەرگری بۆئەوەیە هەموو ئادەمیزاد بە یەکسانی و دادپەروەرانە بەیەکەوە بژیـن، وە هەموو نەتەوەیە بەبێ ستەم مافی خۆی بدرێتەوە دەست ڕێگە ببەستێ لە دەست درێـژی و ڕەگەز پەرستی، وە هەموو نەتەوە بەسـەر بەسـتبێ لـە ژیـان و ئـایین پەرسـتنی خۆیـا، بـۆ بەدەست هێنانی ئەو ئاواتە، وە پەیداکردنی دارایی و پارە بۆ بـەرگری کردنـی دوژمنـانی ئیسلام خوا ئەفەرموێ:

مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾

﴿ مَنْ ذا الّذِي يُقْرِضُ الله ﴾ چ کەسێکە ئەو کەسەی ئەوتۆ بە نیازی پاکی خۆیەوە قەرزبدا بەخوا. مەبەست لە قەرزدان بەخوا ئەمەیە ئەو کەسە پێشی خۆی بخا کردەوەی چاك و ببیەخشێ لە ڕێگەی خواو پەرستنی خوادا، وە بۆیە بە قەرز ناوی بردووە هەتا دڵی باوەڕداران بخاتە جم و جوڵ، وە دڵیان لە بەزەیی پڕبێ، بۆ ئەوەی ئاسانبێ لایان بەخشینی دارایی خۆیان لەبەرخوا، چونکە ئەگەر قەرز بدرێ بەکەسێ پێویستە وەری بگرێتەوە بە تەواوی.

﴿ قَرْضاً حَسَناً ﴾ بە قەرزێکی چاك و شیرین. یانێ پەلە بکا لە بەخشیندا، خۆی هەڵ نەکێشێ بە هیوای پاداشت نەبێ، وە بەس لەبەر خوابێ و نزیکبوونەوە لە خوا، وە دارایی پوختەی خۆی بێ. نەك زەوت کراویی خەڵکی.

﴿ فَيُضاعِفَهُ لَهُ أضْعافاً كَثِيرة ﴾ دووایی خوا ئەو قەرزە دووپات ئەکاتەوە بۆ ئەو کەسە بە دووپات کردنەوەیەکی زۆر، بە جۆرێ جگە لەخوا ئەندازەی پاداشتەکەی نازانێ.

﴿ والله يقْبِضُ وَيَبْصطُ ﴾ وە خوا ئەیگرێتەوە تەسك و تروسکی ئەکا ڕۆزی لەسەر هەندێ کە بە گوێرەی زانین و دانانی هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا. بە جۆرێ سوودی بەندەکانی خۆی تێدابێ، خوا فراوان وگوشادی ئەکا ڕۆزی بۆ هەندێ تر، بە گوێرەی بەش کردن و بەڕێوە بردنی خۆی کە سودی ئەو کەسانەی تێدابێ. مەبەست لەو ئایەتە هاندانی بەندەکانە لەسەر بەخشیش. نەك خوا پێویستی بە قەرز هەیە بزانرێ کە هەژاری و سامانداری بەدەستی خوابێ باوەڕداران چاونابرنە دارایی خۆیان، لە ڕێگەی بەرزی ئیسلامدا دای ئەنێن .

﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ وەهەر بۆلای خوا ئێوە ئەگەڕێنرێنەوە وە لە ڕۆژێکا هیچ دادپەروەرو بەڕێوەبەرێ نیە جگە لە خوای گەورە.

هەرکاتێ خوای گەورە فەرمانی پێداین جەنگ بکەین لەگەڵ بێ باوەڕان، خۆمان و سامانمان بۆ شەکاوەی ئاڵای ئیسلام دابنێین، پێویستە کار بەدەستانی موسڵمانان زۆر وردبن و بیر لە پاشەڕۆژی ئایین و نیشتمانیان بکەنەوە، هەتا نەزانن سەرکەوتنیان مسۆگەر جاڕی جەنگ نەدەن، بە گفتوگۆی ئەم و ئەو نەکەن...... .

چەپڵەو خۆپیشاندن و جارکێشانی زۆربەی هاونیشتمانان زۆرجاران کاربەدەستان ئەخەڵەتێنن، توشی زیان و بێ ئابڕویان ئەکەن، لەوانەیشە زۆریان دڵسۆزبن، وایش ئەبێ دوژمنان خۆیان تێ هەڵکێش ئەکەن. کەواتە پێویستە کاربەدەستان هاونیشتمانان بیالێون و بیان خەنە ژێر تاقی کردنەوە بەر لەوەی بچنە نێو جەنگەوە.

بۆ سەلماندنی ئەو کارانە کۆمەڵێ لە گەورە پیاوان و ژیرانی جولەکە چونە خزمەت پێغەمبەرەکەیان کە پاشایەکیان بۆ دانێ سەرداریانبێ بۆجەنگ لە دژی دوژمنانی ئاین و داگیرکەری نیشتمان و کەلەپوری پێغەمبەرەکانیان هەتا ئەو شتانەی زەوقیان کردوون وەریان بگرنەوە. پێغەمبەرەکەیان پاشای بۆ دانان، پاشاکەیش پاشایێکی ژیرو لێی هاتوبو، هەر چەندە بڕوای بە خوای خۆی توندبو، گومانی لەسەرکەوتندا نەبووە بەڵام گەلەکەی تاقی کردەوە، وەك لەمەوپاش خوا باسی ئەفەرموێ، بەڕووالەت داوێکی بۆ نانەوە، لە پێی ڕاگەیاندن من هەر چیتان پێ ئەڵێم پێویستە دژی نەوەستن، بەرەو تاقیکردنەوە کشاندنی و بەدڵی پاشا هەڵنەسان، ئاگری هەڵمەتیان کوژایەوە پەیمان و بەڵێنەکەی خۆیانیان شکاند، لە نیوەی ڕێگەدا هەڵهاتن و پاشایان بەجێ هێشت، ئەوەیشکردەوەی بێ باوەڕانە لەهەمرو کاتو جێگەیەکا، هەرکەسێ بڕوای تەواوی بە ئایین و نیشتمان نەبێ هەر وەك ئەوکەسانە ئەبێ.

بەلاَم تاقمێکی کەم بڕوایان بەئاینو نیشتمانی خۆیـان هـەبو، بـەئامۆژگاری ئـەو پاشایە هەڵسان و پەیمانەکەیان بردەسەر ، بەپشتی خـواو سـەرۆکایەتی پاشـای ژیـرو دڵسـۆزی خۆیان ڕۆیانن بەرەو دوژمنی خۆیانەوە نا ، لەئەنجامدا سەرکەوتن و بەسەر بەرزی نیشـتمان و کەلەپوری پێغەمەری‌کانیان سەندەوە، دوژمنە زەبر بەدەستەکانیان پرشوبلاَوبون.

جا بۆئەوەی ئێمە وانەوتەمێ لەو جولەکانە وەرگرین پێویستە تەمێ خواربـین، ئەوەیـە خوای‌گەورە وێنەمان بەو جولـەکانە لێی ئەدا و ئەفەرموێ :

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟
لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ
هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ
قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا
مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟
إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ
لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ
قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ
مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ

عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ
يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾
وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ
ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا
تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾
فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلْجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم
بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّى وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ
مِنِّىٓ إِلَّا مَنِ ٱغْتَرَفَ غُرْفَةًۢ بِيَدِهِۦ ۚ فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا
مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ قَالُوا۟
لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ
يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ

غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾
وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَفْرِغْ
عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ
دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ
وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم
بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو
فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ
نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾

﴿ ألَم تر إلى الملأ مِن بني إسرائيلَ مِنْ بَعدِ مُوسى ﴾ ئایاموحەممەدتۆ لــەت بینیـوە ونـەت ڕوانیوە بۆ لای تاقمێ لەپیاو گەورە و خاوەن بیر و پرس پێ‌کراوەکان لەکوڕانی ئیسـرائیل پاش کۆچی دوایی موسا ﴿ د ﴾ بەماوەیە .

﴿ إذا قالوا لنبيّ لهم ابعث لنا مَلكاً ﴾ کاتێ ئەو تاقمە وتیـــان بـە پێغەمەرەکـەی خۆیـان تۆدابنێ بۆ ئێمە پاشایە هەڵسێ بەجەنگ کردن لـەگەڵ ئێمــە ، هـەتا سـەرداری ئێمـە بکـا بەهۆی بیر و بۆچونی خۆی و لەجەنگدا هەڵمان سوڕێنێ.

خوای گەورە ناوی ئەو پێغەمەرەی نەبردوە ، چونکە مەبەست لەو چیرۆکە ناوبردنی ئەو پێغەمەرە نیە ، بەناو بردنی ئەو پێغەمەرە هیچ شتێ ناچێتە سەر ئەو مەبەستە ، ئەو شتەی مەبەست بێ لەو چیرۆکە ئەو ڕوداوە گرنگە مێژوویی‌یەی ڕوی داوە لەکوڕانی ئیسرائیل، ئیتر پێغەمەرەکە هەرکەسێ بێ مەبەستەکە نەاگۆڕێ ، لەنێو ئەواندا یەك لە دوای یەك پێغەمەری زۆریان بۆ نێردراوە ، هەرچەندە زۆر کەس لەزانایان ئەڵێن: ئەو پێغەمبەرە سەموئیل بووە.

﴿ نُقاتِلْ في سَبيل الله ﴾ ئێمە لەگەڵ ئەو پاشایەدا جەنگ بکەین لە ڕێگەی ئایینی خواداو پەرەپێدانی پەرستنی خوا. پێغەمبەرەکەیان ویستی تاقیان بکاتەوە بزانێ ڕاست ئەکەن و مەبەستیان پاکە، ئەتوانن ئەو ئەرکە گەورە بخەنە ئەستۆی خۆیان، بۆیە بەوانی فەرموو:

﴿ قالَ هَلْ عَسَيْتُمْ أن كُتِبَ عَلَيْكُمْ ألْقِتالْ أنْ لا تُقاتِلوا ﴾ پێغەمبەرەکەیان فەرمووی: نزیکەو چاوەڕووان ئەکەم کە ئێوە بترسن و واز لە جەنگ بهێنن ئەگەر جەنگ پێویست بکرێ لەسەرتان ئێوە ئێستا لە خۆشیدان بێ باکانە ئەوا نەئەڵێن. بەڵام کە پاشاتان بۆ دیاری کرا جەنگتان لە سەر پێویست ئەکرێ، ڕێگەی پاش گەزیتان لێ ئەبەسترێ، وە فەرمانی پێغەمبەران جێگەی پێچ و چەنانیە، ڕاستەو خۆ پێویستە مل کەچی فەرمانبن، ئەو گەلە بەو گفتوگۆیە دەمار گرتنی و ئازاییان جولا.

﴿ قالُوا وَمالنا ألاّ نُقاتِلَ فِي سَبيل الله ﴾ ووتیان: چ هۆیە هەیە کە ئێمە جەنگ نەکەین لەگەڵ دوژمندا لە ڕێگەی ئایینی خوادا؟.

﴿ وَقَدْ أخْرِجْنا مِنْ ديارنا وَأبنائنا ﴾ وە بەڕاستی ئێمە دەرکراوین لە نیشتمان و جێگەی خۆمانەوە، جوێی کراوینەتەوە لە کوڕەکانمان و دیل کراون لەلایەن جالوتی ستەمکارەوە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت لایان ئاشکرابو پێویستە هەربکرێ، ئەیانزانی دوژمنەکانیان دوژمنی خواو خۆیانن، وە ئەمانیان دەرکردووە لە نیشتمانی خۆیان و خاوخێزانیان بە دیل بردوون. تاقە ڕێگە لەبەردەمیانا هەر جەنگە بۆ سەندنەوەی مافی

زەوت کراویان. بەڵام ئەو هاشەو هوشەیە کاتی خۆشی و ئاسایشە، بەردەوام نابێ لە کاتی تەنگانەدا بۆیە پەردە لە ڕویان لائەداو ئەفەرموێ.

﴿ فَلَمّا كُتِبَ عَلَيْهِمْ الِقتالُ تولّوا ﴾ دووایی کاتێ جەنگیان لەسەر پێویست کرا لەگەڵ دوژمنانیان پشتیان کردە پێشەواکەیان، لەو کاتەدا جولەکەکان خوی خۆیانیان دەرخستەوە کەتێکدانی پەیمان و وەرگەڕانە لە بەڵێن و وەرچەرخانە لەپەرستن و پشت کردنە لەمافی ڕەوا ،لەو ڕەوشتە خراپەدا تەنها جولەکەکان بەوجۆررە نین ، بگرە هەموو کەسێ کە باوەڕکەی کاڵ و کرچ بێ هەروەك ئەوان وان، ئەوانەیش ڕەوشتی زۆربەی ئادەمیزادە لەکاتی جەنگی ڕەوادا .

﴿ إلاّ قليلاً منهم ﴾ مەگەر کەمێ لەوان نەبێ کەبەپەروەردەی ڕاستی گۆش کراون ، بۆیە پێویستە کاربەدەستان ئاگایان لەخۆیان بێ ، وەلەپێشەوە هەموو ڕێگەی چەوت و چەوێڵ و دڕکاوی تێبینی بکەن کە دێتە ڕێگەیان لەکاتی جەنگدا . نەوەك کوتوپڕ بە کوێرانە تووشی هەڵدێرگە بن ، کارەکانیان لەسەر گران بێ، وە ئەو کارانە خوو ڕەوشتی سەر سەری بێ باوەڕانن کە بە دەگمەن لەوان جۆێی ئەبێتەوە.

﴿ واللهُ عَلِيمٌ بِالظالِمِينَ ﴾ وە خوا ئەزانێ بەستەمکاران کە لە جەنگی ڕەوادا پشت ئەکەنە پێشەواکانیان.

لەئایەتی (٢) دووی سورەتی ئەلبەقەرەدا ڕابورد کە قورئانی پیرۆز نامەی ڕانموی ئاین و ڕەوشتە و یاسا ، نامەی چیرۆك و مێژوو زانیاریە سروشتیەکان نیە ، بێگومان خوای گەورە کەباسی ڕوداوێکی مێژویی ئەکا هەر لەبەر ئەوەیە ئادەمیزاد بیکا بەئامۆژگاری بۆ خۆی و پێی تەمێ خوار بێ ، بەکورتی خوا باسی ئەو چیرۆکەمان بۆ ئەکا بەجۆرێ مەبەستەکەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە ، بەدرێژی باسی نافەرموێ .بەڵگەیشمان ئایەتی (١١١ ) ی سورەتی یوسفە ﴿ لقد كان في قصصهم لعبة لأولي الأنصار ﴾ هەیە لەچیرۆکی پیچغەمەراندا و باسیان ئەکرێ تەمێ کردنە بۆ خاوەن ئەقلان .

ئەگەر کەسێ بیەوێ قورئان وەك نامەیەکی مێژوویی دانێ ، بەگوێرەی ویستی خۆی گفتوگۆبکا ، ئەو کردەوەیە دژی یاسای قورئانە ، ئەیەوێ دلانی پاك وەرگێڕی لەلەئامۆژگاری ، مەبەستەکەی لەقورئاندا لەدەست ئەچێ ، بۆیەپێویستە ئێمەی موسولمان بۆخۆمان ژیری بەکار بهێنین ، هەتا ئەو شتانەی لەو چیرۆکانەدا بەخراپ دانراون نەفرەتیان لێ بکەین ، ئەوانەیان بەچاك دانراون بیکەین بەیاساودەستور بۆ خۆمان .

خوای گەورە لەئایەتی ( ٢٤٦ ) هەتا ئایەتی ( ٢٥٢ ) باسی چیرۆکی تالوت ئەفەرموێ، بەکورتی باسی ئەکەین :

موسا پێغەمەر پاش مردنی چەند جێگە دارێکی لەپێغەمەران بۆ نێردرا لەلایەن خوای گەورەوە، لەوپێغەمەرانەیە ئەو پێغەمەرە کەقورئان لەم چیرۆکەدا باسی ئەکا و ناوی نابا ، بەلام زۆربەی زانایان ئەلێن : ناوی سمۆئیلە .

رۆژێ لە رۆژان کۆمەلێ لەکوڕانی ئیسرائیل ئەچنە خزمەت ئەو پێغەمەرە و ، ئەلێن پێشەوایەکمان بۆ دانێ سەرپەرشتیمان بکا لەجەنگدا و هەتا ئێمە جەنگی لەگەل بکەین لە رێگەی ئاینی خوادا ، رێزی خۆمان بەسەر بگرینەوە ، پێغەمەرەکەیان فەرموی : لەوانەیە کەکاتێ جەنگی راستی دەستی پێکرد و بانگ کران بۆ جەنگ پشت بکەنە پێشەواکەتان ئەوانیش وتیان : شتی وانابێ ، ئێمە لە جێگەی خۆمان دەرکراوین ، خاو خێزانمان بەدیل گیراون ، پێغەمەرەکەیان لەخوا پاڕایەوە بۆیان ، خوا نزاکەی وەرگرت و فەرموی : تالوتم بۆ کردن بە پاشا کە گەلی ئەو پێغەمەرە بەوەیان زانی ووتیان : چۆن ئەبێ؟ خۆ ئەو پاشایە لە بنەمالەی پیاو ماقولان نیە ، هەژارە و دەست پەتیە .

پێغەمەرەکەیان فەرموی : سەرۆکایەتی لەشکر پێویستی بە بنەمالە نیە و ساماندار بێ ، تالوت مرۆڤێکی زانا و ئازا و پۆشناخ و رەوشت چاك و بەهێزە ، پیاوێکی تێسپڕاو خاوەن پشوە ، هەموو مەرجەکانی سەرۆکایەتی تێدایە . گەلەکەی وتیان : کەواتە ئەمانەوێ چاومان بکەوێ بە بەلگەیە لەسەر پلەی بەرزی و پاشایەتیەکەی . پێغەمەرەکەیان فەرموی:

بەڵگەی ئەوەیە ئەو سندوقەی کەکەلەپوری موسای تێدایە کەبریتی بون لەداردەستەکەی و بەرگ و کەمێ لەتەوراتیش کە فەلەستینیەکان لەکاتی جەنگدا بەتاڵان بردویانە ، خوا فەرمان ئەدا بەفریشتەکان بۆتان دێننەوە ، کەسندوقەکەیان بینی بۆیان هاتەوە ، بەناچاری پێشەوایی تالوتیان سەلماند . تالوت بەرەو جەنگی دوژمنەکانیان کشاندنی ئامۆژگاری کردن لەرێگەدا توشی ڕوبارێ ئەبن، ئەوکەسەی خۆی بگرێ لەکاتی توینێتیدا لە لالۆچێ زیاتری لێ نەخواتەوە بەفەرمانی خوا هەڵساوە ، ئەو کەسەی خۆی لێ تێراو بکا بڕوای پێ ناکرێ و پشتی پێ نابەسترێ لەکاتی جەنگ و کۆششدا کەچی کاتێ توشی ڕوبارەکە بوون خۆیان ئاسایی یاخی بونەوەکەیان دەست پێ‌کردەوە گوێیان نەدایە ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەیان ، هەتا توانایان هەبوو ئاویان لەو ڕوبارە خواردەوە ، جگە لەکەمێکیان نەبێ خۆیانیان گرت ، بەو باوەڕەوە بون و ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەیان وەرگرت .

کاتێ هەردوو لەشکرەکە بەرانبەر وەستان ، جولەکەکان بەپێشەوایی تالوت ، فەلەستینیەکان بەسەرۆکایەتی جالوت ، زۆربەی جولەکەکان ترسان و هەڵهاتن ، بەتالوتیان ووت : ئێمە توانای جەنگی جالوتمان نیە چونکە لەشکرەکەی خاوەنی هێزن . بەڵام ئەو تاقمە کەمەی باوەڕداران کەلەئاوی ڕروبارەکەیان نەخواردبوو کەمێ نەبێ لەخوا پاڕانەوە ، ڕویان نا بەجەنگی جالوت و لەشکرەکەی و ، سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی خۆیانا ، داود جالوتی کوشت ، ئۆردی جالوت شکان بەهۆی کوشتنی جالوتەوە ، باس کردنی داود دەنگی دایەوە ، لەپاشا خوای گەورە داودی کرد بەپاشا و پێغەمبەریش ، زەبوری بۆ نارد ، فێری چنینی زرێی کرد ، خوا زانیاریی‌یەکی وای پێ بەخشی بتوانێ گیروگرفت نەیەڵێ .

ئەوەی باسمان کرد پوختەی ئەو باسەیە ، ئیتر شتی‌تر لەو بارەیەوە بێژابێ لەو شتانەی شیاو نین بەواتەی جولەکەکانی بزانن ، چونکە ئێوە بەبێ بەڵگەیان دابنێن ، بەوانەی باسکران بۆمان ڕوون بۆیەوە ئەو شتەی مەرجێ بۆکاربەدەستان زانیاری و ڕەوشتی بەرز

و ژیری‌یە . نەك بونیەتی بنەماڵەی ماقوڵ و ساماندارى ، سەرکەوتن لەجەنگدا بەهۆی باوەڕ و ئارام گرتنەوەیە . نەك بە زۆر بونی لەشکرەوە ، خوای‌گەورە باسی ئەو ڕوداوە ئەکا و ئەفەرموێ :

﴿ وقال لهم نَبِيّهُم إنّ الله قد بعث لكم طالوت مَلِكاً ﴾ فەرموی بەوان پێغەمەرەکەیان: بەڕاستی خوا دیاری کردوە بۆ ئێوەتالوت بەپاشا بۆ ئێوە .

﴿ قالوا أنى يكون لهُ المُلكُ وَنَحنُ أحَقُّ بِـالْملك مِنـهُ ﴾ وە جولەکەکان ئەو کارەیان بەدوور زانی‌و وتیان : چۆن و لەچ لایەکەوە بۆی هەیە پاشایەتی بکا بەسەر ئێمەوە ، ئێمە شایستە ترین بەپاشایەتی ، چونکە ئێمە لەپشتی بەهۆزاین ئەوکەسە لەپشتی بنیامین بێ نەبوون بەپاشا و نە بەپێغەمەر ، تالوت لەپشتی بنیامینە .

﴿ وَلَم يؤتَ سعةً من المال ﴾ وەنەبەخشراوە بەو فراوانی زۆر لەدارایی ئەمڕۆ هەتا بتوانێ لەشکر فەراهەم بێنێ بۆ جەنگ ، چەك و ئازوخەیان بداتێ .

﴿ قالَ إنّ الله اصطفاهُ عليكم وَزادَهُ بَسْطةً في العِلمِ والجسمِ ﴾ پێغەمەرەکەیان وتی لە وەڵامیاندا : بەڕاستی خوا تالوتی هەڵبژاردووە بۆ پاشایەتی بەسەر ئێوەدا و خوا بەشی زۆری پێداوە لەلایەن ڕێز و زانیاری فراوانەوە بۆ بەڕێوەبردنی جەنگ و کاری ڕامیاری وە پیادەکردنی ئاسایش لەنیشتمانا و ، خوا بەخشیویە بەو لەشێکی زۆر چاك و پۆشناخ و لاوچاك و باڵابەرز و بەدیمەن و تەندروستە .

﴿ والله يؤتي ملكه من يشاء والله واسع عليم ﴾ وە خوا ئەبەخشێ پاشایەتی بەهەرکەسێ ئارەزوی هەبێ و بزانێ شیاوی پاشایەتی‌یە خوا ئەوپەڕی بەخشندە و بەڕێز و سامانی زۆر ئەبەخشێ بەهەرکەسێ ئارەزوی هەبێ ، ئەزانێ چ کەسێ شایانی پاشایەتیە .

ئەو کارە نالەبارانە و ئەو چەنەبازیە لەو ئایەتەدا باسی کراوە ، وەنەبێ هەر تەنها پەیوەندی بەجولەکەکانەوە هەبێ ، بەڕاستی ئادەمیزاد هەربەو شێوەیە بون و هەر وایش ئەبن ، زۆربەیان گومانیان وایەپلەی بەرزی لەجیهاندا هەر ئەبێ خاوەنی سامان بێ ،

لەبنەماڵەی پیاوماقوڵان بێ ، نازانن خوا بەویستی خۆی پلــە و ســامان ئــەدا بەهەرکەسێ ئارەزوی هەبێ .

کوڕانی ئیسرائیل داوایان کرد لە پێغەمەرەکەیان نیشانە و بەڵگەیان نیشان بـدا لەسـەر پاشایەتی تالـوت لـەبەر چ شتێ هەڵیبژاردووە لـەنێویانا بۆ پاشایەتی ، خوای گەورە وەڵامـی دانەوە و فەرموی :

﴿ و قال لهم نبيهم إنَّ آية ملكه أن يأتيكم التابوت ﴾ وە ووتی بــەوان پێغەمەرەکـەیان لەو کاتەدا کە بدوریان ئەزانی پاشایەتی تالوت بەسەریانەوە : بەڕاستی نیشانەی تـالـوت و هەڵبژاردنی بەسەر ئێوەدا ئەوەیە کە دێتەوە بۆلای ئێوە ئەو سندوقەی موسا لەکاتێکا بیان ویستایە بچونایە بۆ جەنگ ئەیان خستە پێـش خۆیـان ، بـەو بۆنـەوە ئارامیـان ئـەگرت و هەڵنەئەهاتن لـەکاتی جەنگدا .

﴿ فيه سكينة من ربكم وبقيةٌ مما ترك آل موسى وآل هارون ﴾ لەنێو ئــەو ســندوقەدا هەبوو لەهاوردنیدا ئارام و خۆگرتنیان پــەیدا ئـەکرد بەرانبـەر بـەدوژمنانیان، لـەنێو ئـەو سندوقەیشا هەبوو ئەو شتەی مابوەوە لەوەی بەجێیان هێشتبوو پێغەمەرەکانی پاش موسا و هارون ، ئەو پاشماوەیە خوا ناوی نەبردووە ، بەڵام زانایان ئەڵێن : بریتی بون لە پارچـەی لەوحەکانی تەورات ، داردەستی موسا و بەرگەکەی و مێزەرەی هارون .

﴿ تحمله الملائكة إن في ذلك لآية لكم إن كنتم مؤمنين ﴾ ئــەو ســندوقەیان هەڵئـەگرن فریشتەکان وە ئەی هێننەوە بۆ لای ئێوە ، ئەو سندوقە لەدار دروســت کرابـوو ، یەکـەم جار موسا تەوراتی ئەخستە ناوی ، لەپاش ئەو پێغەمـەرەکانی ئیسـرائیل پاشمـاوەی موسـا و هارونیان ئەخستە ناوی ، لـەکاتی جەنگدا جالـوت بەتاڵانی بردبوی ، هەر وەها لای مایەوە هەتا تالـوت بو بە پاشا ن لـەو کاتەدا فەلـەستینیەکان توشی گرانـی و نەخۆشـی مایەسـیری بوون ، ئەو سندوقەیان کردبو بەهۆی ئەو شتانە، بۆیە بڕیاریان دا بینێرنــەوە ، وەخســتیانە نێو عەرەبانەیە ، بەستیان بەجوتێ گاوە ، فریشتە لێیان ئـەخورین هـەتا گەیشـتنە دەسـتی تالوت . بەڕاستی هەیە لەهاتنەوەی ئەو سندوقە نیشـانەیەکی گـەورە بـۆ ئێـوە بەڵگـەبێ

لەسەر ڕاستی فەرموودەی پێغەمەرەکەتان لەپاشایەتی تالوتا ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخوا هەیە، بۆیە پێویستە ئێوە باوەڕ بەپاشایەتی تالوت بهێنن بەسەرتانەوە ، ئەوان کە ئەمەیان بینی باوەڕیان هێنا و مل کەچی تالوت بوون ، خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ لەگەڵ جالوتی پاشای فەلەستیندا ، تالوت بەوانی ووت : پیر و نەخۆش و ئەو کەسانەی خەریکی خانو دروست کردنن و بازرگانی ئەکەن یا ژن ئەهێنن نەیەن بۆ جەنگ کردن ، لەو کەسانەی تالوت خۆی هەڵیبژاردن لەشکرێکی پێکەوە نا ، ئەو کاتە هاوین بوو زۆر گەرم بوو بەدەشتێکی چۆڵی ووشك و بێ ئاودا بردنی ، هاواری بێ ئاویان لێ هەڵسا و داوای ئاویان لەتالوت کرد . تالوت بەوانی ڕاگەیاند خوا تاقیان ئەکاتەوە هەتا دەربکەوێ چ کەسێکتان بەڕاستی خوا پەرستن و کامتان گوناهبارن ،هەر ئێستا ئەچین بە سەر ڕوبارێکا ئەو کەسانەی خۆیان بەباوەڕدار دائەنێن لەئاوی ئەو ڕوبارە ناخۆنەوە زۆررتر لەمشتێ ، زۆربەیان هەتا توانیان لەئاوی ڕوبارەکەیان خواردەوە مەگەر کەمێکیان نەبێ بەئامۆژگاری پێغەمەرەکەیان نەشکاند بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ فلما فصل طالوت بالجنود ﴾ دوایی کاتێ تالوت لەشارجوێ بویەوە بەفەرمانی پێغەمەرە کەیان بەلەشکرەکەیەوە بۆ جەنگ لەگەڵ جالوتی پاشای عەمالیقە و ئۆردوەکەی .

﴿ قال إنَّ الله مبتليكم بنهرٍ ﴾ تالوت بۆ ئاگادارکردنی پێغەمەرەکەیان ووتی : بەڕاستی خوا ئێوەتاقی ئەکاتەوە بەئاوی ڕوبارێ کە ئەکەوێتە نێوان ئوردون و فەلەستین هەتا بۆتان دەربکەوێ کامتان باوەڕدارن و کامتان گوناه ئەکەن .

﴿ فمن شرب منه فليس مني ومن لم يطعمه فإنه مني ﴾ دوایی هەرکەسێ لەئاوی ئەو ڕوبارە بخواتەوە لەتاقمیمن نیە و یەکێ نیە لەمن ، ئەو کەسەی لەو ئاوە نەچەژێ دوایی بەڕاستی لەسەر ڕێگەی منە و لەتاقمی منە ، نابێ ئێوە لەئاوی ئەو ڕوبارە بچێژن .

﴿ إلاّ من إغترف غرفة بيده فشربوا منه إلا قليلاً منهم ﴾ مەگەر کەسێ هەڵگرێ مشتێ لەو ئاوە بەدەستی خۆی ، لەدواییدا هەمویان لەئاوی ئەو ڕوبارەیان خواردەوە زۆرتر

لەبنەماڵەی پیاوماقوڵان بێ ، نازانن خوا بەویستی خۆی پلــە و سـامان ئـەدا بەهەرکەسێ ئارەزوی هەبێ .

کوڕانی ئیسرائیل داوایان کرد لە پێغەمەردکەیان نیشانە و بەڵگەیان نیشان بـدا لەسـەر پاشایەتی تالـوت لـەبەر چ شتێ هەڵبژاردووە لەنێویانا بۆ پاشایەتی ، خوای گەورە وەڵامـی دانەوە و فەرموی :

﴿ و قال لهم نبيهم إنَّ آية ملكه أن يأتيكم التابوت ﴾ وە ووتی بـەوان پێغەمەرەکـەیان لەو کاتەدا کە بدوریان ئەزانی پاشایەتی تالوت بەسەریانەوە : بەڕاستی نیشانەی تـالـوت و هەڵبژاردنی بەسەر ئێوەدا ئەوەیە کە دێتەوە بۆلای ئێوە ئەو سندوقەی موسا لەکاتێکا بیان ویستایە بچونایە بۆ جەنگ ئەیان خستە پێـش خۆیـان ، بـەو بۆنـەوە ئاراميـان ئـەگرت و هەڵنەئەهاتن لەکاتی جەنگدا .

﴿ فيه سكينة من ربكم وبقيةٌ مما ترك آل موسى وآل هارون ﴾ لەنێو ئـەو سندوقەدا هەبوو لەهاوردنیدا ئارام و خۆگرتنیان پـەیدا ئـەکرد بەرانبـەر بـەدوژمنانیان، لـەنێو ئـەو سندوقەیشا هەبوو ئەو شتەی مابووەوە لەوەی بەجێیان هێشتبوو پێغەمەرەکانی پاش موسا و هارون ، ئەو پاشماوەیە خوا ناوی نەبردووە ، بەڵام زانایان ئەڵێن : بریتی بون لە پارچـەی لەوحەکانی تەورات ، داردەستی موسا و بەرگەکەی و مێزەرەی هارون .

﴿ تحمله الملائكة إن في ذلك لآية لكم إن كنتم مؤمنين ﴾ ئـەو سندوقەیان هەڵئـەگرن فریشتەکان وە ئەی هێننەوە بۆ لای ئێوە ، ئەو سندوقە لەدار دروســت کرابـوو ، یەکـەم جار موسا تەوراتی ئەخستە ناوی ، لەپاش ئەو پێغەمـەرەکانی ئیسـرائیل پاشمـاوەی موسـا و هارونیان ئەخستە ناوی ، لەکاتی جەنگدا جالوت بەتاڵانی بردبوی ، هەر وەها لای مایەوە هەتا تالوت بو بە پاشا ن لەو کاتەدا فەلەستینیەکان توشی گرانـی و نەخۆشـی مایەسـیری بوون ، ئەو سندوقەیان کردبو بەهۆی ئەو شتانە، بۆیە بڕیاریان دا بینێرنـەوە ، وەخسـتیانە نێو عەرەبانەیە ، بەستیان بەجوتێ گاوە ، فریشتە لێیان ئـەخوڕین هـەتا گەیشـتنە دەسـتی تالوت . بەڕاستی هەیە لەهاتنەوەی ئەو سندوقە نیشـانەیەکی گـەورە بـۆ ئێـوە بەڵگـەبێ

لەسەر ڕاستی فەرمودەی پێغەمەرەکەتان لەپاشایەتی تالوتا ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخوا هەیە، بۆیە پێویستە ئێوە باوەڕ بەپاشایەتی تالوت بهێنن بەسەرتانەوە ، ئەوان کە ئەمەیان بینی باوەڕیان هێنا و مل کەچی تالوت بوون ، خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ لەگەڵ جالوتی پاشای فەلەستیندا ، تالوت بەوانی ووت : پیر و نەخۆش و ئەو کەسانەی خەریکی خانو دروست کردنن و بازرگانی ئەکەن یا ژن ئەهێنن نەیەن بۆ جەنگ کردن ، لەو کەسانەی تالوت خۆی هەڵیبژاردن لەشکرێکی پێکەوە نا ، ئەو کاتە هاوین بوو زۆر گەرم بوو بەدەشتێکی چۆڵی ووشك و بێ ئاودا بردنی ، هاواری بێ ئاویان لێ هەڵسا و داوای ئاویان لەتالوت کرد . تالوت بەوانی ڕاگەیاند خوا تاقیان ئەکاتەوە هەتا دەربکەوێ چ کەسێکتان بەڕاستی خوا پەرستن و کامتان گوناهبارن ،هەر ئێستا ئەچین بە سەر ڕوبارێکا ئەو کەسانەی خۆیان بەباوەڕدار دائەنێن لەئاوی ئەو ڕوبارە ناخۆنەوە زۆرتر لەمشتێ ، زۆربەیان هەتا توانیان لەئاوی ڕوبارەکەیان خواردەوە مەگەر کەمێکیان نەبێ بەئامۆژگاری پێغەمەرەکەیان نەشکاند بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ فلما فصل طالوت بالجنود ﴾ دوایی کاتێ تالوت لەشارجوێ بویەوە بەفەرمانی پێغەمەرەکەیان بەلەشکرەکەیەوە بۆ جەنگ لەگەڵ جالوتی پاشای عەمالیقە و ئۆردوەکەی .

﴿ قال إنَّ الله مبتليكم بنهرٍ ﴾ تالوت بۆ ئاگادارکردنی پێغەمەرەکەیان ووتی : بەڕاستی خوا ئێوەتاقی ئەکاتەوە بەئاوی ڕوبارێ کە ئەکەوێتە نێوان ئوردون و فەلەستین هەتا بۆتان دەربکەوێ کامتان باوەڕدارن و کامتان گوناه ئەکەن .

﴿ فمن شرب منه فليس مني ومن لم يطعمه فإنه مني ﴾ دوایی هەرکەسێ لەئاوی ئەو ڕوبارە بخواتەوە لەتاقمی‌من نیە و یەکێ نیە لەمن ، ئەو کەسەی لەو ئاوە نەچەژێ دوایی بەڕاستی لەسەر ڕێگەی منە و لەتاقمی منە ، نابێ ئێوە لەئاوی ئەو ڕوبارە بچێژن .

﴿ إلاّ من إغترف غرفة بيده فشربوا منه إلا قليلاً منهم ﴾ مەگەر کەسێ هەڵگرێ مشتێ لەو ئاوە بەدەستی خۆی ، لەدواییدا هەمویان لەئاوی ئەو ڕوبارەیان خواردەوە زۆرتر

﴿ قالوا ربنا أفرغ علينا صبراً و ثبت أقدامنا وأنصرنا على القوم الكافرين ﴾ کاتێ باوەڕداران تەماشای خۆیانیان کرد کەکەمن و تەماشای ئەوانیان کرد که زۆرن ووتیان : ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ پڕێژە بەسەر ئێمەدا ئارام گرتن لەبەر دوژمندا و ، ڕاوەستێنە پێکانی ئێمە ، ئاگادارمان بە لەکاتی جەنگدا ، سەرمان بخە بەسەر گرووپی بێ باوەڕاندا . خوای گەورە نزاکەی وەرگرتن .

﴿ فهزموهم بأذن الله وقتل داودُ جالوتَ ﴾ دوایی باوەڕداران بێ باوەڕانیان شکاند بە هۆی یارمەتی و ویستی خواوە ، دواتر داود پێغەمەر جالوتی بێ باوەڕی کوشت ، خوا باوەڕدارانی سەرخست بەسەر بێ باوەڕاندا ، بەگەورەیی خۆی ئاواتی باوەڕدارانی هێنایە دی .

﴿ وآتاه الله الملك والحكمة وعلمه مما يشاء ﴾ وە خوا بەخشی بەداود پاش کوشتنی جالوت پاشایەتی و پێغەمەرایەتی و زەبوری بۆ نارد ، بۆهیچ کەسێ ئەو دووپلە بەرزە کۆ نەبۆتەوە بەر لەداود، وەخوا داودی فێرکرد لەو شتەی خوا ئارەزوی هەبوو لەپاشایەتی و زانیاری و بوبەجێگەداری تالوت و دوای مردنی فێری چنینی زرێی کرد لەئاسن .

﴿ ولو لا دفع الله الناس بعضهم ببعضٍ لفسدت الأرض ﴾ وە ئەگەر خوا لەناو نەبا ئادەمیزاد هەندێکیان بەهەندێکیان ، وەك داود جالوتی لەناوبرد ، بەڕاستی زەوی نامێنێ و تێك ئەچێ بەتاریکی ستەمی بێ باوەڕان و سوود و پیتی زەوی نامێنێ بۆ هەموو ئادەمیزاد.

﴿ ولكن الله ذو فضل على العالمين ﴾ بەلام خوا خاوەنی گەورەیی و بەزەیی‌یە بەسەر بونەوەراندا بەلابردنی خراپە لەسەر زەوی.

ئەو ئایەتە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە خوای گەورە ئادەمیزادی دروست کردووە بەجۆرێ کە پێویستیان بەیەکتری هەیە ، هیچ کەسێ تەنها ناتوانێ بژی و بەهەموو کارێ هەلسێ‌کەواتە پێویستە کۆمەلگایەکی گشتی پێك بهێنرێ بۆئەوەی هەمویان خزمەتی یەکتری بکەن . یەکێکیان جوتیار ئەوی تریان جۆلا ، یا خانوو دروست کەر ، ئەوانە

بنچینەی پیشەکانن ، زۆررترین پیشەکانی تر یا پێشەکی یا تەواوکەری ئەوانن وەك دارتاشی و نانەوا و بەرگ دروو شوشە بڕو لێ خوڕی قیتار و هەروەها شتی تریش .

هەموو مرۆڤێ شایستەیە بۆ هەموو پیشەیە ، یا بۆ هەموو زانیاری‌یە . کەواتە نوێنەرانی ئادەمیزاد فەرمان بدەن بەکاربەدەستان هەموکەسێ لەسەرکار و پیشەی خۆیان دایان مەزرێنن ، هەریەکەیان بەگوێرەی شایستەی خۆیان .

خوا بە میهرەبانی خۆی بۆ هەریەکە لە و پیشانە تاقمێکی لەئادەمیزاد دروست کردوە. کەواتە ئادەمیزاد وەك یەك لەش وان ، لەبەر ئەوەی کاتی واهەیە بۆ بەدەست هێنانی پیشەی تایبەتی خۆیان بکەونە جەنگەوە لەگەڵ یەکتری ، خوای گەورە بۆ نەهێشتنی ئەو جەنگە کاربەدەستانی داد پەروەر ئەنێرێ لەنێو ئادەمیزادا بۆ دەم کوت کردنی ستەمکاران و پەلاماردانیان .. هەروەها بۆی ڕوون کردینەوە هەرگەلێ کاردبەدەستان و خاوەن هێزەکانیان ڕانەپەڕن و بەرەنگاری بێ باوەڕەکان نەکەن بۆ نەمانی ستەمکاران بەبێ گومان ئەو گەلەلەناو ئەچێ و پەرت و بڵاو ئەبن ، ژیری و زانیاری بەبێ هێزی بەرگری ئاسایش پەیدا ناکەن . بەوانەی سەرەوە گەورەیی و میهرەبانی خوامان بۆڕوون بویەوە لەسەر ئادەمیزاد.

﴿ تلك آيات الله نتلوها عليك بالحق ﴾ ئەو چیرۆك و ڕوداوانە باسکران ، ئەو هەزاران کەسە چونە دەرەوە لە ترسی مردن و خوا مراندنی و زیندوی کردنەوە و سامان بۆ جەنگی دوژمنان پێویستە .

جەنگی تالوت و هەواڵی مێژوی گەلانی تر چەندین بەڵگەن ، میهرەبانی خوایان پێ دەر ئەکەوێ ، ئێمە ئەی خوێنینەوە بەسەر تۆدا موحەمەد بەڕاستی و بەبێ گومان ، بەجۆرێ ڕێك بکەوێ لەگەڵ نامە پێشوەکانی تری خوا ، بەخاوەن نامەکانی بسەلمێنێ کە دژی ئەو نامانە نیە ، گۆڕانی تێدا نیە .

﴿ وإنك لمن المرسلين ﴾ وە بەڕاستی تۆ موحەمەد لە فروستادە نێراوەکانی خوای ، چونکە تۆ هەواڵ ئەدەی بەو هەواڵە سەرسوڕێنەرانە و بەو چیرۆکە کۆنانە بەبێ ئەوەی تۆ

بزانی نامەیە بخوێنی و بەبێ ئەوەی ئەو هەواڵانەت بیستبێ ، کەواتە ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی تۆ لەپێغەمەرانی ، ئەوەی ئەوتۆ هەواڵی پێ ئەدەی بەسروشە .

خوای گەورە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە بەسەر پێغەمەردا بەهۆی جبرەئیلەوە ، پێغەمەریش خوێندیەوە بەسەر ئێمەدا ، هەتا ئێمە لەماناکە بگەین و لەناوەرۆکەکەی وورد ببینەوە و بیکەین بەدەستور و یاسا بۆمان لەهەموو کار و کردەوە و گفتوگۆی ڕۆژانەماندا، بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزاد بەئاسایش بژین و ، ستەم و دست درێی و بێ باوەڕی بنەبڕبێ.



﴿ پێرست ﴾



**تێبینی** / خوێنەری بەڕێز

لەجزمی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا هەڵەیەك هەیە تکایە تێبینی بکە :

لەلاپەڕە ٢٧٦ ی جزمی یەکەم دا دێڕی ٢٢ لەجیاتی ﴿ دوو کیلۆ و سەد گرام ﴾ نووسراوە ﴿ دوو هەزار و سی ویەك کیلۆگرام ﴾ .

تکایە بەئەرکی مەزانە و هەڵەکە لەلای خۆتان ڕاست بکەنەوە .

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیا خشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت :

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| فەرمانانایان | فەرمانیان | ٨ | ٢ |
| خۆیان گرتوە | خۆیان ڕاگرتوە | ٨ | ١٤ |
| فەرمنانێ | فەرمانێ | ٩ | ٣ |
| شانزە | هەژدە | ١٠ | ١ |
| چاوڕوای | چاوەڕوانی | ١٠ | ٦ |
| خێزان قورئان | خێزانی قورئان<br>خێزانی شەدەت | ١٢ | ٢ |
| زانابانی | زانایان | ١٤ | ١٠ |
| لەئایەکان | لەئایەتەکان | ١٤ | ١٤ |
| ئەوان | ئەوانین | ١٧ | ١ |
| ئەدەیان | ئەوەیان | ٢٠ | ١٥ |
| بیکەن | بکەن | ٢١ | ١٨ |
| ئەو ڕێگەنەیان | ئەو ڕێگەیان | ٢٥ | ٧ |
| الذین أتبعوا | الذین اتبعو | ٤٣ | ١ |
| ڕۆژکار | ڕۆژگار | ٦٠ | ٢٠ |
| خاوزەن | خاوەن | ٦٦ | ٢٠ |
| سوکیو | سوك کردن | ٦٧ | ١٧ |
| ئەیکوژانەوە | ئەیکوژنەوە | ٦٨ | ١ |
| خەن | خە | ٦٨ | ٦ |
| بێگومتان | بێگومان | ٦٩ | ٢٥ |
| بەجێ | بەجێی | ٧٣ | ١ |
| ﴿ بَعدِ ﴾ | ﴿ بَعْدَ ﴾ | ٧٣ | ٢٣ |
| ووتەی | ووتەی | ٧٤ | ١ |
| هەلیبە | هەڵەیە | ٧٤ | |
| شبویی | پشوێ | ٧٦ | ٧ |
| مخوا | خوا | ٨٢ | ١٤ |
| هیچ سێ | هیچ شتێ | ٨٥ | ٧ |
| حوا | خوا | ٩٠ | ٢٢ |
| بەحوا | بەخوا | ٩١ | ١١ |
| ئسلای | ئیسلام | ٩٧ | ١٤ |
| حوری | جۆری | ٩٧ | ١٤ |
| حو | خۆیا | ٩٧ | ٢٤ |
| داگیرەران | داگیرکەران | ٩٨ | ٩ |
| دەست | دەستان | ٩٩ | ١٧ |
| سەحت | سەخت | ١٠٠ | ٥ |
| بە | بەو | ١٠٠ | ١١ |
| ڕێزگرتن لەحانە | ڕێزگرتن لەخانە | ١٠٤ | ٦ |
| بۆخۆی | بۆی | ١٠٥ | ٢٢ |
| جیگەی | جێگەی | ١٠٦ | ٧ |
| حور | خۆر | ١٠٨ | ١٣ |
| لەرنگی | لەمانگی | ١١٥ | ١٣ |
| سووی | سودی | ١٢١ | ٤ |
| گگا | کان | ١٢٦ | ٣ |
| باوەڕی | باوەڕان | ١٣١ | ١٦ |
| گوشانی | گوشای | ١٥٤ | ١٢ |
| پەرەی ئەسەند | پەرەی نەئەسەند | ١٥٧ | ٢ |
| قونای | قوتابی | ١٥٧ | ١٨ |
| سەری | مەردەس | ١٦٠ | ٢١ |
| پێوەی | ئێوەی | ١٦٢ | ١ |
| یاریدەرای | یاریدانی | ١٦٢ | ٢٠ |
| بازودەری | بێباوەڕی | ١٦٣ | ٧ |
| برین | بران | ١٦٣ | ٢٤ |
| گەناهێکی | گوناهێکی | ١٦٤ | ١ |
| شابەنتەکان | شایەتەکان | ١٦٥ | ٧ |
| ژێر | ژمێر | ١٦٥ | ٢٢ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| باوك و دايكى | دايكى باوك و دايكى دايك | ١٦٦ | ١ |
| ئەوگەرۆ | ئەگەر | ١٦٦ | ٦ |
| دروست | دروسته | ١٦٨ | ١٢ |
| ماوزەيەكى | ماوەيەكى | ١٦٨ | ١٨ |
| خوسينى | خوێنى | ١٦٩ | ٨ |
| نوێژۆ | نوێژدا | ١٦٩ | ١٥ |
| دانه | دايا | ١٧٤ | ٥ |
| منالدنايا | منالدانيايابه | ١٧٨ | ١٠ |
| (المزتجع) | (المرتجع) | ١٨٣ | ٨ |
| داراى | داواى | ١٨٥ | ٢٢ |
| لەرودا پێداويسى | لەڕووا پێداويستى | ١٨٩ | ٧ |
| لەسونەتى | لەسونەى | ١٨٩ | ٧ |
| فەمۆى | فەرموى | ١٩٠ | ٢٢ |
| (٩٧) | (٩٧)ى | ١٩٠ | ٢٣ |
| بيا | با | ١٩٤ | ١٨ |
| ﴿ أوقاديتك ﴾ | ﴿ أو فاديتك ﴾ | ١٩٥ | ١٢ |
| پێداويستى | ويستى | ١٩٧ | ٧ |
| حوى | خۆى | ١٩٧ | ١١ |
| ژنەنه | ژنه | ١٩٧ | ٢٠ |
| شتێكينن | شتێكى | ١٩٨ | ١٠ |
| (٢٢٣) | (٢٣٢) | ١٩٨ | ١٦ |
| تسرحوهن | سرحوهون | ٢٠٠ | ٤ |
| ﴿ وتشاورجناح ﴾ | ﴿ وتشاور ۆلا جناح ﴾ | ٢٠٦ | ١١ |
| دايكه گوناهێ لەسەر | دايكى دايك گوناهى نيه لەسەر | ٢١٣ | ١١ |
| ببەخششيكى | بەخششێكى | ٢١٧ | ١٤ |
| بيانى | يانى | ٢١٩ | ٥ |
| هۆى بۆ خۆى | هۆى ڕێز بۆخۆى | ٢١٩ | ١٠ |
| ژن | ژن و | ٢٢٠ | ٢ |
| سەرەدەرا | سەرووەرى ئەم سورەته | ٢٢٠ | ١٤ |
| ترەره | تروه | ٢٢٠ | ٢ |
| بين به چوار نوێژه | بين به چوار نوێژ | ٢٢١ | ٩ |
| ڕێزو | ڕێز | ٢٢١ | ٢٢ |
| ڕوبان | ڕايان | ٢٢١ | ١ |
| نەيه | نەيەنه | ٢٢١ | ٣ |
| ڕۆشننەوه | ڕۆيشتنەوه | ٢٢٢ | ١٩ |
| خوەا | خوا | ٢٢٣ | ٤ |
| گۆشتن | كوشتن | ٢٢٥ | ٢ |
| نەنەبيستراوه | نەبيستراوه | ٢٢٥ | ١٠ |
| نەناسى | نەناسيێ | ٢٢٥ | ١٥ |
| ئەوگرێتەوه و | ئەگرێتەوه | ٢٢٨ | ١٠ |
| نەبڕابێتەوه | نەبڕابێ | ٢٢٨ | ٢٠ |
| مارييه | مارەيێ | ٢٢٨ | ٢٠ |
| پێ دابين | پێداين | ٢٢٩ | ٢١ |
| پاش دوو ساڵ | پاش يەكساڵ | ٢٣٣ | ٩ |
| ڕويانن | ڕويان | ٢٤١ | ٣ |
| نەاگۆڕى | ناگۆڕ | ٢٤٤ | ٤ |
| چەنانبه | پەنانيه | ٢٤٤ | ١٥ |
| پيچغەمەراندا | پێغەمەران | ٢٤٥ | ٢١ |
| مەرجێ | مەرجيێ | ٢٤٧ | ٢٢ |
| بوبەپاشان | بوبەپاشا | ٢٤٩ | ٢٠ |
| زور | زۆريان | ٢٥٢ | ٤ |